زنجیرەی ژیانی دوای مردن ٤

# دۆزەخ

## لە قورئان و فەرموودە صەحیحەکاندا

محمد ملا فائق شارەزووری

چاپی سێیەم

پوخت و زیادکراو

١٤٣١ك ٢٠١٠ز



پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

* نەمبینیوە وەك دۆزەخ راکردووەکەی خەوتبێت.

* بەردی هەرە گەورە لە لێواری دۆزەخەوە فڕێ دەدرێتە ناوی و بەناویدا دەچێتە خوار ماوەی حەفتا ساڵ و هێشتا ناگاتە بنەکەی.

* ئەم ئاگرەتان بەشێکە لە حەفتا بەش لەئاگری دۆزەخ دووجار کوژاوەتەوە بە ئاو، گەر وانەبووایە سوودتان لێنەدەبینی.

* گەر لەم مزگەوتەدا سەد هەزار کەسی تیابێت یان زیاتر وە لە ناویدا پیاوێکی دۆزەخی هەبێت و یەك هەناسەبدات و هەناسەکەی بەریانکەوێت هەرهەموویان دەسوتێنێت بە مزگەوتەکەشەوە.

* ئایا وادەزانن ئاگری دۆزەخ وەك ئەم ئاگرەتان سورە؟ نەخێر بەڵکو زۆر زۆر ڕەشترە لە قیر.

* ئەو ئافرەتەی کە شینۆ و شەپۆڕ دەکات و خەڵکان دەخاتە گریان گەر پێش مردنی تەوبە نەکات و لەسەر ئەو کارە بمرێت لە ڕۆژی کۆتایدا کراسێکی گەڕی ئاڵۆشاوی لەگەڵ شەڕواڵێکی مسی تواوەدا بە بەردا دەکرێت.

Sherko Khanzadi
Graphic Designer

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ (آل عمران: ١٠٢).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ (النساء /١).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١).

أما بعد فإن أصدق الحديث كتابُ الله، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة فى النار.

وبعد:

**خوای گەورە بەهەشت ودۆزەخی دروست کردووە وەك مژدەدان وترساندنێك بۆ سەرجەم دروست کراوەکانی خۆی. وە هەردووکیانی کردۆتە پاداشت و سزایەکی دادپەروەرانە. پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە و دەیانخاتە پلە بەرزەکانی بەهەشتەوە، وە سزای خراپەکاران دەدات و نیشتەجێی چاڵەقوڵەکانی دۆزەخیان دەکات.**

**مرۆڤ لە ناخیدا شەیدای خۆشیەکانە وە بەردەوام حەزی لێیەتی، کاتێك باسی بەهەشت و خۆشیەکانی بەرگوێ دەکەوێت ویست و خواستەکانی زیاتر دەبێت بۆ بەدەست هێنانی و خۆ گەیاندنی بەو شوێنە، وە بەپێچەوانەشەوە کاتێك باسی دۆزەخ و سزاکانی دەبیستێت ترس و تۆقین و دڵەڕاوکێ توشی دەبێت و تابتوانێت هەوڵ دەدات کە خۆی لێ بەدوور بگرێت وە ئەو کارانە ئەنجام بدات کەڕزگاری دەکات لە دۆزەخ.**

وە لەڕاستیدا ترس بەهێزتر و کاریگەرترە لە مژدەدان، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك کە وردەکاریەکانی ڕۆژی دوایی و سزاکانی دۆزەخ و هۆکارەکانی چوونە ناو دۆزەخ بزانێت بۆ ئەوەی هەردەم وریا و بەئاگابێت لەو سزا گەورەیە.

سوفیانی کوڕی عیینە (رحمه الله) فەرموویەتی: "خلق الله النار رحمةً يخوّف بها عباده لينتهوا"[(١)]. واتە: "خوای گەورە دۆزەخ وەك ڕەحمەت و بەزەیی یەك دروست کردووە و بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێت تا خۆیان بە دوور گرن لە تاوان و کارە خراپەکان". وە ترسان لە دۆزەخ ترسانە لە خوا وەك ئیبن ڕەجەب (رحمه الله) دەفەرموێت: "والأثر يَدلُ على المؤَثر، فجهنم دليلٌ على عظمة الله وشدة بأسِه وبطشه وقوة سطوته وانتقامه من أعدائهِ، فالخوف منها في الحقيقة خوفٌ من الله عزوجل، واجلالٌ وإعظامٌ. . . . مع أنَّ الله تعالى يخوّفُ بها عباده، ويجب منهم أن يخافوه بخوفها وأن يخشوه بخشية الوقوع فيها، وان يحذروهُ بالحذر فيها، فالخائف من النار خائف من الله متبعٌ لما فيه محبته ورضاهُ والله أعلم"[(٢)].

واتە: "لە ڕاستیدا شوێنەوار بەڵگەیە لەسەر خاوەن شوێن. دۆزەخیش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و بەهێزی خوای گەورە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە دوژمنەکانی کەواتە ترسان لە دۆزەخ ترسانە لە خوا و بەگەورە و شکۆ ناسینییەتی. . . . وە خوای گەورە خۆی بەندەکانی بە دۆزەخ دەترسێنێت و پێویستە بەندەکانیش لە دۆزەخ بترسن وە زۆر بە ئاگابن تا نەکەونە ناو دۆزەخ کەواتە ئەوەی لە دۆزەخ دەترسێت مەبەستییەتی خۆشەویستی و ڕازیبوونی خوا بەدەست بهێنێت".

پێویستە بڕوادار ترسی لێ جیا نەبێتەوە و زۆر غەم و ترسی ڕۆژی دوایی لە دڵیدا بێت و بەردەوام تۆبە بکات و خوا بەگەورە بزانێت و دڵ غەمبار بێت. وەك حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت: "إنَّ المؤمنين قومٌ ذَلَّت والله منهم الأسماع والأبصار والأبدان، حتى حسبهم الجاهلُ مرضى. . والله ما احزنهم ما أحزن الناس، ولكن ابكاهم واحزنهم الخوف من النار"[(٣)].

واتە: "بڕوادار کەسانێکن چاو وگوێ و دڵ و جەستەیان بۆ خوا زەلیلە بووە بەڕادەیە

---

(١) أخرجه: ابو نعيم (الحلية) (٢٥٧/٧).

(٢) أنظر: ابن رجب (التخويف من النار) (ص: ٤٠).

(٣) أخرجه: ابن المبارك (الزهد) (٣٩٧)، وأبي نعيم (الحلية) (١٥٣/٢) .

نەزانەکان بە نەخۆشیان زانیون. . . . . سوێند بە خوا ئەوان غەمباری ئەوە نین کە خەڵکان غەمی لێ دەخۆن بەڵام ئەوەی ئەوانی گردۆتە گریان تەنها ترس بووە لە دۆزەخ".

ئەبو سولەیمانی دارانیش (رحمه الله) فەرموویەتی: " أصل كل خير في الدنيا والأخرة الخوفُ من الله عز وجل، وكل قلبٍ ليس فيه خوف الله تعالى فهو قلبٌ خربٌ"(٤). واتە: "سەرچاوەی هەموو خێرێکی دونیا و قیامەت ترسانە لە خوای گەورە وە هەر دڵێك ترسی خوای تیانەبێت دڵێکی وێرانە و مردووە".

لەڕاستیدا ترس لە خوا پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ چوونە بەهەشت و خۆلادان لە دۆزەخ و کۆکردنەوەی توێشوی پێویست بۆ ڕۆژی دوایی، وەك ئیبن قوامە (رحمه الله) دەفەرموێت: "إن كنت مؤمناً فانتبه لنفسك، وقف ما بين يديك، فإنَّ الله لايجمع على عبدٍ خوفين، ولسنا نعني بالخوف رقة النساء، فتبكي ساعةً وتترك العمل وإنما نريد خوفاً يمنع عن المعاصي، ويحث على الطاعة وليس خوف الحمقى الذي إقتصروا على سماع الاهوال ويقولوا: نعوذ بالله وهم مصرّون مع ذلك على القبائح"(٥). واتە: "گەر بڕواداریت ئاگات لە خۆت بێت و ڕاوەستاوبە لەسەر هەق چونکە خوای گەورە دوو ترسی لەسەر هیچ بەندیەکی کۆناکاتەوە، مەبەستیشمان لەترس ترسی ژنانە نی یە ماوەیەك بگریت و پاشان واز لە کارکردن بهێنیت ترسێکمان مەبەستەکەی ئەوەیە خاوەکەی لە گوناهەکان دوور بخاتەوە و هاندەربێت بۆ ئەنجامدانی چاکەکان نەك بە وێنەی ترسی نەزانەکان بێت کە گوێ دەگرن لە هەڕەشە و وریا کەرەوەکان و دەڵێن: پەنا بەخوا، بەڵام خۆیان بەردەوامن لە ئەنجامدانی کارەخراپەکان".

برای موسوڵمانم لێرەشدا بە پشتیوانی خوا هەستام بەکۆکردنەوەی سەرجەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکان وتەی پێشینە چاکەکان سەبارەت بەباسی دۆزەخ و وردەکاریەکانی ئەو باسە و کەڵك وەرگرتن لە هەموو سەرچاوەکان و هەوڵمدا تەنها فەرمایشتە ڕاستەکان لەم باسەدا بهێنم لەگەڵ باس کردنی هەندێك فەرمایشت و فەرموودەی (لاواز) ئەویش تەنها بۆ دەوڵەمەندکردنی باسەکە و ورياکردنەوەی موسوڵمانان لێیان. وە سەرەتای باسەکەشم دەست پێ کرد بەناوەکانی دۆزەخ و چۆنیەتی هێنانی دۆزەخ بۆ مەحشەر و ڕاپێچکردنی دۆزەخیەکان بۆ ناوی و پاشان باسکردنی دەرگاکانی دۆزەخ و. . . . هتد. وە

---

(٤) أنظر: ابن رجب (التخويف من النار) (ص: ١٠).

(٥) أنظر: (مختصر منهاج القاصدين) (ص: ٤٢٥).

لەکۆتایی باسەکەشدا باس دەرچوونی بڕوا داران کراوە لە دۆزەخ و ڕوون کردنەوەی سیفاتی دۆزەخیەکان و ئەو کارانەی کە مرۆڤ پێی دەچێتە دۆزەخەوە.

لەکۆتایشدا داواکارم لە خوای گەورە ئەم نوسینە بکاتە مایەی سود بۆ نوسەر و خوێنەران وە بیکاتە هۆکاری خۆلادانیان لە دۆزەخ. وە سەرجەم کارەکانمان چاکە بێت وەتەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت وە بەهەشتمان پێ ببەخشێت و لە دۆزەخ و سزاکانی پارێزراومان بکات، وە هەزارەها سڵاو ودروود لە خۆشەویست و پێشەواو نوری چاومان پێغەمبەر (محمد) ﷺ بێت وە لەسەر خێزان و بنەماڵە و هاوەڵانی بەڕێزی وە لەسەر شوێن کەوتوانی تا ڕۆژی دوایی. ئامین.

باوکی عەبدوڵا

محمد ملا فائق شارەزووری

# ناوەکانی دۆزەخ

١- **الحطمة**: واتە: تێکشکێنەر. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ۝٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴾ (الهمزة: ٥ – ٦).

٢- **النار**: واتە ئاگر. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (البقرة: ٢٤).

٣- **الجحيم**: واتە: ئەو ئاگرە بریسکەدارە گەورەیەی کە ناوەوەی زۆر قوڵ و دژوارە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴾ (التكوير: ١٢).

٤- **السعیر**: (السعير) واتە: ئەو ئاگرەی کە کڵپە دەکات وە پەیتا پەیتا جۆش و خرۆشی پێ دەدرێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾ (النساء: ١٠).

٥-**لظى**: واتە: گڕگرتوو. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ۝١٥ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴾ (المعارج: ١٥- ١٦).

٦- **سقر**: واتە: گڕکانێکی قوڵی دژوار. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ۝٢٧ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴾ (المدثر: ٢٧ – ٢٨).

٧- **الهاویة**: واتە: شوێنی کەوتنە خوارەوەی پڕگڕ و ترسناك. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴾ (القارعة: ٩).

٨-**النار الكبرى**: واتە: ئاگری هەرەگەورە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ۝١١ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾ (الأعلى: ١١ – ١٢).

٩- **جهنم**: واتە دۆزەخ. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجِا۟ىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَـٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ (الفجر: ٢٣) .

# هێنانی دۆزەخ بۆ مەحشەر

خوای گەورە بوونەوەرانی خۆی زیندوو دەکاتەوە لە مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵ و باڵندەو هەموو ئەوانەی کە خۆی دەیەوێت بۆ کات و ڕۆژێکی دیاری کراو، لە مەحشەردا، خوای گەورە یەکەم جار فەرمان دەدات کە دۆزەخ بهێنرێت و نیشانی هەموو خەڵکی مەحشەر بدرێت لەو ڕۆژەدا هەموو کەسانی ئەو شوێنە دۆزەخ دەبینن و تەماشای دەکەن، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە خوای گەورە کوێری کردوون، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴾ (طه: ١٢٤ - ١٢٥)، وە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَـٰهُمْ سَعِيرًا ﴾ (الإسراء: ٩٧).

کەواتە هەموو چاو ساغێك لەو ڕۆژەدا بەچاوی خۆی ئەو سزا هەرە گەورەیەی کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی خوایان کردووە، ئەوانە هەر هەموویان لەوێ گەر چاوساغ بن هەمووی بەچاوی خۆیان دەیبینن چ بەهەشتیەکان و چ دۆزەخیەکان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾ (النازعات: ٣٦) واتە: (دۆزەخ نیشان دەدرێت بۆ ئەو کەسەی کە دەتوانێ ببینێت و چاوی ساغ بێت). خوای گەورە دۆزەخ لەو ڕۆژەدا دەنوێنێت لەپێش چاوی کافراندا چۆن نواندنێك، واتە خۆی چەندە دژوارە ئەوەندەی تر ترسناکترو سامناکتر دەبێت لەپێش چاوی ئەوانەی کە تەماشای دەکەن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَـٰفِرِينَ عَرْضًا ﴾ (الكهف: ١٠٠). وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَـٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ (الفجر: ٢٣).

ئەبو عیمرانی جونی ﷺ جارێکیان باسی ڕۆژی دوای کرد و ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ﴾ فەرمووی: " ئالەو کاتەدا هەموو ئامادە بووانی مەحشەر دەنگ و

تورەیی و خەشم وقینی دۆزەخ دەبیستن، گەر خوای گەورە ڕۆحیان بەند نەکات لە جەستەیاندا لە ترس و تۆقینی ئەو ڕۆژە هەموویان ڕۆحیان دەردەچێت. لەو ڕۆژەدا دۆزەخ شاڵاوی پارچە ئاگرەکانی بەرەو بوونەوەران فڕێ دەدات و هەموو کەسێکی ئامادە بووی ئەوێ لێی ڕادەکەن و پشتی تێ دەکەن لەوێدا بانگ دەکرێت:

﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴾ (الرحمن: ٣٣) ئەو کاتە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە لەسەر زمانی یەکێك لە پێغەمبەرانی بە خەڵکی ڕاگەیاندووە و فەرموویەتی﴿ وَيَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾(غافر: ٣٢ – ٣٣) دۆزەخ هەر کاتیش نیشتەجێیانی خۆی دەبینێت زۆر بەتوندی تورە دەبێت لە وانەی ئارەزووی خۆیان پەرستووە و سەرپێچی خوایان کردووە و بانگیان لێ دەکات و دەڵێت: نیشتەجێیانم وەرن، دراوسێکانم وەرن، و جگەر گۆشەکانی خۆم وەرن، منم چاڵی پڕ پشکۆو و گڕوقین، منم سوتێنەری دڵە ڕەقەکان و جەستە نەرمەکان لەو کاتەدا هەموو پێغەمبەران و فریشتە نزیکەکانی خوای گەورە بە چۆکدا دەکەون، هەتا ئیبراهیمی ﷺ خۆشەویستی خوا دەڵێت: نەفسی نەفسی"[٦]. ئا لەوێدا مرۆڤە بێ ئاگاو بێ باوەڕەکان دۆزەخ دەبینن کە باوەڕیان پێ نە بووە پەشێوی و شپرزەیی یەکی زۆر ڕوویان تێدەکات.

پاشان خوای گەورە فەرمان دەدات دۆزەخ لەدوورەوە بهێنرێت و نیشانی ئامادەبووانی مەحشەری بدرێت، وەکو لە فەرموودەکەی (أبي سعيد الخدري رضي الله عنه) هاتووە بەمەرفوعی: ((. . . ثمّ يوتى بجهنم كأنها سرابٌ. . . ))[٧] واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (دۆزەخ لە دوورەوە وەك شێوەی دەریایەکی پان و بەرین دەبینن شەپۆلەکانی شەپۆل بەسەر شەپۆلدا دەکەون، ئەوان ئاوا دەیبینن، بەڵام کە دۆزەخ نزیك دەبێتەوە دەزانن کە ئەوە شەپۆلی دەریا نیە بەڵکو ئەوە شەپۆلی ئاگرە).

---

[٦] أخرجه: الدينوري (المجالسة) (٢٠٩٨)، وابن أبي الدنيا (الرقة والبكاء) (١٧٩)، وأبوالفرج الجوزي في (صفة الصفوة) (٢٦٥/٣).

[٧] أخرجه: البخاري (برقم: ٤٩١٩).

دۆزەخیش یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە دەبینێت و دەبیستێت و چەندەها شوێن ڕاکێشانی هەیە فریشتەکان بەرەو مەحشەر ڕای دەکێشن و دەیهێنن و دۆزەخیش ئەوەندە گەورەیە کە بە(٤٩٠٠٠٠٠٠٠) چوار ملیار و نۆسەد ملیۆن فریشتە ڕادەکێشرێت و گەورەیی فریشتەکانیش تەنها خوا دەزانێت چەندە.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يؤتى بجهنم يوم القيامة لها سبعون الف زمام، مع كل زمام سبعون الف مَلك يَجّرونها))[٨]. واتە: (لە ڕۆژی قیامەتدا دۆزەخ دەهێنرێت و حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، و هەموو جڵەوێکی بە حەفتا هەزار فریشتە ڕادەکێشرێت).

خەڵکان دۆزەخ دەبینن لە دوورەوە کە دەهێنرێت بۆ مەحشەر لەو جێگەو کاتەدا دۆزەخ زۆر توڕەیە لە خەڵکان و بە قین و داخ دەبێت لێیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ (الفرقان: ١٢) واتە: (ئامادەبووانی مەحشەر دەبینن دۆزەخ ڕق و دەنگ وناڵە و گرمەی خۆی دەنوێنێت)، گرمەو دەنگی ئەوەندە ترسناك و تۆقێنەرەکە بەبیستنی ئەو دەنگە هەموو پێغەمبەران و فریشتەنزیکەکان بەسەر ئەژنۆدا دەکەون ئاواتیان تەنها ڕزگار بوونیانە. وەکو کەعبی کوڕی مالك ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە و دەفەرموێت: "والذى نفسى بيده إن لجهنم يوم القيامة لزفرة مايبقى من ملك مقرب ولانبى مرسل الاّ يَخرّ لركبتيه حتى إن إبراهيم خليل الله يقول نفسي نفسي"[٩] واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە دۆزەخ قیژە و گرمەیەکی هەیە هیچ فریشتەیەکی نزیك بە خوا و پێغەمبەرێکی نێردراو نی یە کە بەسەر ئەژنۆدا نەکەون هەتا ئیبراهیم کە خۆشەویستی خوایە لەو ڕۆژەدا بەچۆکدا دەکەوێت و دەڵێت: هەر خۆم هەر خۆم ڕزگاربکە).

---

[٨] أخرجه: مسلم (٢٨٤٢)، والترمذي (٢٦٩٨) والحاكم (٤/ ٥٩٥) وصححه الألباني في صحيح الترمذي (٢٠٨٢).

[٩] أخرجه: ابن أبي شيبة (١٥٩٦٥)، وأبو نعيم في (الحلية) (٥/٣٦٩)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٧٥)، الطبراني (الكبير) (٩٧٦٣)، و الحاكم (٢/٣٧٦)وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الباني في (مختصر العلو) (١٦٩)، و(مختصر شرح العقيدة الطحاوية)(٢٦٤)، وأخرجه أيضاً عبد الله بن أحمد في (كتاب السنة) (١٢٠٣) وقال محققه اسناده حسن، وصححه الشيخ الأرناؤوط في(شرح العقيدالطحاوية)(٢/٦٠٦).

دۆزەخ لە دوورەوە دیارە پارچە ئاگری گەورە بەئەندازەی کۆشك وگرد بە هەموولایەکدا هەڵدەدات وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ ٣٠ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ٣١ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ٣٢ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ﴾ (المرسلات: ٣٠ - ٣٣) واتە: (دۆزەخ پریشکەی گەورە هەڵدەدات بەوێنەی کۆشك). وەکو ئیبنو عەباس ﵄ دەفەرموێت: (ئەو پریشکانە لە تەپۆڵکە و شاخی دونیا گەورەترن)، وە عەبدوڵای کوڕی مەسعودیش ﵁ دەفەرموێت: " كالقصور والمدائن "[١٠] واتە: بەوێنەی کۆشکی گەورە و شارەکان.

پاشان شاڵاوێك ئاگر لە دۆزەخ دێتەدەر بۆ ڕاپێچکردنی چەند کەسانێك بۆ ناو دۆزەخ و لەگەڵ خەڵکانی مەحشەردا دەدەبێت، وەك ئەبو سەعیدی خودری ﵁ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يخرج عنق من النار يوم القيامة لها عينان تبصران وأُذنانِ تسمعان، ولسان ينطق، يقول: إني وكلتُ بثلاثة: بكل جبار عنيد، وبكل من دعا مع الله الهاً آخر، وبالمصورين – وفي رواية – [وبمن قتل نفساً بغير نفسٍ])). واتە: (شاڵاو ملێکی ئاگرین لە دۆزەخ دێتەدەر بۆ ناو مەحشەر دووچاوی هەیە پێی دەبینێت و دووگوێی هەیە پێی دەبیستێت و زمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات و بەرامبەر خەڵکان دەڵێت: خوای گەورە فەرمانی بە من کردووە کە سێ کۆمەڵ لە ئێوە ڕاپێچ و پەلکێش کەم بۆناو دۆزەخ. یەکەمیان هەموو فەرمانڕەوایەکی یاخی بوو. دووەمیان ئەو کەسانەی هاواریان لە غەیری خوا کردووە و پەرستویانە وە سێهەمیان ئەو کەسانەی وێنەیان کێشاوە و دروستیان کردوە). لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وە بەو کەسانەی کە نەفسێکیان بەئەنقەست کوشتووە)[١١].

ئالەو ڕۆژەدا بێ بڕوایان و هاوتا بڕیاردەران دەخرێنە ناو دۆزەخ خۆیان و ئەو شتانەی کە پەرستویانن وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ

---

[١٠] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٧٣)، والطبري (التفسير) (١٤٦/٢٩).

[١١] أخرجه أحمد (٣٣٦/٢) برقم (٨٢٢٥)، وابن أبي شيبة (٣٤١٣٠)، والترمذي (٢٥٧٤)، وأبو يعلى (١١٣٨)، والطبراني (الأوسط)(٤١٣٨)، والبزار (٣٥٠٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٨٣) وفي (السلسة الصحيحة) (٥١٢ -٢٦٩٩).

﴿حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾ (الأنبياء: ٩٨) واتە: (ئێوە و ئەوانەی پەرستوتانە جگە لەخوای پەروەردگار هەردوولاتان سوتەمەنی دۆزەخن و دەکەونە ناوی).

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە فەرمان دەدات هەموو نەتەوەکان شوێن پەرستراوەکانیان بکەون. ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((يجمع الله الناس يوم القيامة فيقول: أيها الناس ألم ترضوا من ربكم الذى خلقكم ورزقكم وأمركم أن تعبدوه ولاتشركوا به شيئاً، أن يولىّ كل أناس منكم من كانوا يتولون ويعبدون في الدين، أليس ذلك عدلاً من ربكم؟ قالوا بلا، قال فلينطلق كل قوم إلى ماكانوا يعبدون في الدنيا [فيتبع من كان يعبد الشمسُ الشمس، ويتبع من كان يَعبدُ القمرُ القمرَ ويتبع من كان يعبُد الطواغيتُ الطواغيتَ]))[١٢] واتە: (خوای گەورە خەڵکان کۆدەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا و دەفەرموێت: ئەی خەڵکان ئایا ڕازی نابن لەو پەروەردگارەی دروستی کردن و ڕۆژی پێداون و فەرمانی پێ کردوون کە هەر ئەو بپەرستن و هاوتای بۆ بڕیار نەدەن ئەمڕۆ هەر کەسێك لە ئێوە شوێنی هەر کەسێك یان ئاینێك کەوتووە لە دونیادا ئەمڕۆش هەر شوێنی بکەوێت، ئایا ئەوە دادپەروەری نی یە لەلایەن خوای خۆتانەوە، خەڵکانی مەحشەریش هەموویان دەڵێن: بەڵێ، ئینجا خوای گەورە فەرمان دەدات و دەفەرموێت: با هەر کەسێك هەر شتێکی پەرستووە یان سەر بە هەر شتێك بووە لە دونیادا با ئەمڕۆش شوێنی بکەوێت لەوێدا ئەوانەی کە ڕۆژیان پەرستووە ڕۆژدەرواو ئەوانیش شوێن ڕۆژ دەکەون بۆ ناو دۆزەخ، وە ئەوانەی کە مانگیان پەرستووە شوێن مانگ دەکەون و بەرەو دۆزەخ دەڕۆن، وە ئەوانەی کە فەرمانڕەوا ستەمکارەکانیان پەرستووە ئەوانیش شوێن فەرمانڕوا ستەمکارەکانیان دەکەون) و [واتە: وەك فرعەون کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ﴾ (هود: ٩٨) واتە: ئەو فیرعەونەی کەخەڵکان بە خواو گەورەیان دەزانی لە قیامەتدا پێشیان دەکەوێت ئەوانیش بەشوێنی فیرعەوندا هەرهەموویان دەڕۆن و دەکەونە دۆزەخ].

---

[١٢] أخرجه: ابن أبي شيبة (٣٤١٠٧)، والطبراني (الكبير) (٩٧٦٣)، وأحمد (كتاب السنة) (١٢٠٣) وقال محققه: إسناده حسن، والحاكم (٣٧٦/٢) وصححه الشيخ الألباني في (مختصر العلو) (٦٩)، و(مختصر شرح العقيدة الطحاوية) (ص: ٢٦٤).

**لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:** : ((يذهب أصحابُ الصليبِ مع صليبهم))[١٣] **واتە: (وە ئەوانەی کە خاچیان پەرستووە لەگەڵ خاچەکانیان دەڕۆن بۆ دۆزەخ، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:** : ((ويذهبُ أهلُ الأوثان مع أوثانهم وأصحاب كُل الهة مع الهتهم))[١٤]. **واتە: (هەموو خاوەن بتەکان کە پەرستویانن لەگەڵیاندا دەڕۆن و هەموو ئەوانە بەخوایان داناون). وە هەروەها مرۆڤی وا هەیە حەز و ئارەزووی خۆی کردۆتە خوا و بەشوێنی کەوتووە و گوێڕایەڵی دەکات و دەیپەرستێت یان هەیە خزم و هۆزو گەل و نەتەوە و نیشتمان و تاقم و کۆمەڵ یان سەرکردەکەی خۆی پەرستووە و شوێنی کەوتووە لە هەموو شتێکدا. ئەوانە هەموو لەگەڵ خواکانیان دەڕۆن و هەردوولا بەیەکەوە فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ((فيتبع أولياء الشياطينَ الشياطينَ))[١٥] **واتە: (ئەوانەی کە تاقمی ئیبلیس بوون و شوێن شەیتانەکانیان کەوتوون و بەخوایان داناون ئەوانە لەو ڕۆژەدا شوێنیان دەکەون بۆ ناو دۆزەخ).**

**لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ((ويبقى من يعبد الله من بر وفاجر وغُبرَاتُ من أهل الكتاب. . . فيقال لليهود ماكنتم تعبدون؟ فيقولون كنا نعبد عُزيراً ابن الله فقال كذّبتم مااتخذ الله صاحبةً ولا ولداً، ماذا تريدون؟ قالوا: عطشنا ربنا فاسقينا، فيشار اليهم ألا تردون؟ فيحشرون إلى النار كأنها سراب يُحطم بعضها بعضاً فيتساقطون في النار)) ثم يقال للنصارى ماكنتم تعبدون؟ فيقولون كنا نعبد المسيح ابن الله فقال: كذّبتم مااتخذ الله صاحبة ولا ولداً ماذا تريدون؟ قالوا[١٦] [ عطشنا ربنا فاسقينا فَيُشارُ اليهم ألا ترِدون، فيحشرون إلى جهنم كأنها سَرابٌ يُحَطِمُ بَعضُها بعضاً فيتساقطون في النار]))[١٧]. **واتە: (تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بەناو خوایان پەرستووە لە چاکەکاران و خراپکاران لەگەڵ کەمایەتیەکی**

---

(١٣) أخرجه: البخاري (٧٤٣٩)، والنسائي: (١١٢/٨) وابن حبان (٧٣٧٧) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٤) أخرجه: البخاري (٣٤١٩).

(١٥) أخرجه: مسلم (٢٩٦٨)، وابن حبان (٢٦٤٢) و قال محققه إسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٦) أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، وابن حبان (٧٣٧٧).

(١٧) أخرجه: أحمد (١٦/٣)، والبخاري (٢٢، ٤٥٨١)، ومسلم (١٨٣).

خاوەن کتێبەکانی پێش ئێمە. . . . . ، بەجولەکەکان دەوترێت: چیتان دەپەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: عوزەیرمان دەپەرست کوڕی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: درۆتان کرد، خوای گەورە نەژنی هەیە وە نە منداڵ. چیتان دەوێت؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان تینومانە ئاومان پێ بدە؟ ئیشارەتیان بۆ دەکرێت بۆ دۆزەخ. واتە: (ئەوە بۆناچن لەو جێگەیە ئاو بخۆنەوە)، هەموو کۆدەکرێنەوە بەرەو ئەو شوێنەی کە وەك دەریاوایە لە پێش چاویاندا و وادەزانن دەریایە هەر هەموو دەڕۆن کە نزیك دەبنەوە لێی دەکەونە ناو دۆزەخ و (ئینجا دەزانن دۆزەخە. . . .) پاشان خوای گەورە بە گاورەکان دەفەرموێت: ئێوە چیتان دەپەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: مەسیحمان دەپەرست کوڕی خوا. خوای گەورە دەفەرموێت: درۆتان کرد، خوای گەورە نەژنی هەیە وە نەمنداڵ، چیتان دەوێ، ئەوانیش دەڵێن: پەروەردگارمان تینومانە ئاومان پێ ببەخشە، ئیشارەتیان بۆ دەکرێت بۆ دۆزەخ، ئەوانیش هەموو کۆدەبنەوە ودەبرێن بەرەو دەریایەکی گەورە، کە شەپۆل بەسەر شەپۆلدا دەکەوێت بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخۆنەوە، نازانن کە ئەوە دۆزەخە (کاتێ لێی نزیك دەبنەوە) هەموو بەسەر یەکدا بەردەدرێنەوە خوارەوە بۆ ناو بنکی دۆزەخ).

## ڕاپێچکردنی خەڵکان بەرەو دۆزەخ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ﴾ (غافر: ١٨)

حەسەنی بەصری(رحمه الله) دەفەرموێت: " سوێند بەخوا وەختە بە تەواوی تێك بچن و عەقڵیان لە دەس بدەن و دڵیان دەکەوێتە لێدانی زۆر خێرا و قوڕگیان زۆر وشك و تاڵ دەبێت و نزیکە ڕۆحیان بێتە دەرەوە کاتێك کە فەرمانانیان پێ دەکرێت کە ببرێن بۆ دۆزەخ، لەوێدا هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن:

﴿ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ (الأعراف: ٥٣) واتە: (ئایا هیچ تکا کارانێك بۆ ئێمە هەن تا بچن تکامان بۆ بکەن تا بگێڕدرێینەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی کارە پێشوەکانمان ئێمە کارو ڕەفتاری چاکە ئەنجام بدەین). لەوێدا بانگیان لێ دەکەن و پێیان دەڵێن: ﴿ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ (غافر: ١٨)

واتـە: (ئـەمڕۆ سـتـەمکاران هـیـچ دۆسـت و تـکـا کارێکیـان نیـە تکایـان بـۆ بکـات و تکایـان لێوەربگیرێت)."(١٨)

دۆزەخیـەکان دەبـرێن بـۆ دۆزەخ و بـەبینینی ئـاگر وسـزاکانی دۆزەخ زۆر زۆر پەشیمان دەبنـەوە وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ﴾ (یونس: ٥٤) لەوێدا تـەواو ڕیسـواو سەرشـۆڕ دەبـن و زۆر دەترسـن و دەتـۆقن بەتیلەی چـاو لـە ترسـدا تەماشـای دۆزەخ دەکـەن وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ﴾ (الشورى: ٤٥)، ئا لەوێدا ئاواتـە خـوازن کـە بگەڕێنەوە بۆ دونیا تا باوەڕ بەخوا بهێنن و لە بڕواداران بن وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾

(الأنعام: ٢٧)، واتە: (گەر دەبینیت کاتێك دەبرێنە بـەردەم دۆزەخ هەنـدێکیان بـە هەنـدێکیان دەڵێن: خۆزگـە دەیـان گێڕاینـەوە بـۆ دونیـا و ئایەتـەکانی خوامـان بـە درۆ نـەدەزانی و لـە بڕواداران دەبووین). وەهـەروەها خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿. . . . . . . وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ (الشورى: ٤٤) واتـە: (لەوێـدا سـتـەمکاران دەبینیت کاتێك سزای دۆزەخ بە چاوی خۆیان دەبینن دەڵێن: ئایا هیـچ ڕێگەیـەك هەیـە بـۆ گەڕانەوەمان بۆ دونیا). لەوکاتەدا مرۆڤ چارەنووسی کردارە خراپەکانی خۆی دەبینێت وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَجِاْيٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ (الفجر: ٢٣). واتـە: (دۆزەخ دەهێنرێت ئـالەو ڕۆژەدا مـرۆڤ بـە بـیری دێتـەوە و بەڵام ئەوکات بیرکەوتنەوە هیچ سودێك بەمرۆڤ ناگەیەنێت).

دۆزەخیـەکان کۆمـەڵ بـە کۆمـەڵ بـەڕێ دەخرێـت بـۆ نـاو دۆزەخ وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (الزمر: ٧١) واتە: (بێ بڕوایان کۆمەڵ بـە

(١٨) أخرجه: الدينوري (المجالسة) (١٥١٤)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٢٥٠).

کۆمەڵ بەرێ دەکرێن و دەبرێ بۆ دۆزەخ کە دەچنە بەردەم دۆزەخ و دەرگاکانیان بۆ دەکرێتەوە و دەرگاوان و بەرپرسەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن: ئایا پێغەمبەرانێك لەخۆتان نەهات بۆلاتان ئایەتەکانی خوای خۆتان بەسەرتاندا بخوێنێتەوە و ئاگادارتان بکات بەگەیشتنتان بەم ڕۆژە؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: بەڵێ ئەوە ڕووی دا و وشەی سزادان، ڕەوایە لە سەر بێ باوەڕاندا). وە ئەم وتەیەش بۆ هەموو تاقم و کۆمەڵێك دووبارە دەکرێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ﴾ (الملك: ٨) واتە: (هەر کات کۆمەڵێك فڕێ درایە ناو دۆزەخ دەرگاوانەکانی دۆزەخ لێ یان دەپرسن: ئایا ترسێنەرێکتان بۆلا نەهات تا لەم سەرئەنجامە ئاگادارتان بکات) ئنجا خوای گەورە فەرمان دەکات بە فریشتەکان تاوانبارە بێ باوەڕەکان کۆت و زنجیر بکەن. وەك دەفەرموێت:

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ۝٣٠ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾ (الحاقة: ٣٠ -٣١) واتە: (بیگرن و کۆت و زنجیری بکەن، پاشان بیخەنە ناو دۆزەخەوە و بە ئاگر بیبرژێنن). وە فەرمان دەکات بە زبری و توندی ڕاپێچی دۆزەخ بکرێت وەك دەفەرموێت: ﴿خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ﴾(الدخان: ٤٧) واتە: (بیگرن بە زبری و توندی ڕاپێچی ناوەڕاستی دۆزەخی بکەن)، وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا﴾ (الطور: ١٣) واتە: (ئەو ڕۆژە زۆر بە توندی بەرەو دۆزەخ دەبرێت. وە فریشتەکان بێ باوەڕان بە کۆت و زنجیرەکانیانەوە لەسەر دەم و چاو ڕایان دەکێشن بەرەوە دۆزەخ). وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ﴾ (غافر: ٧١) واتە: (بەزنجیرو کۆتەکانی گەردنیان ڕادەکێشرێن بۆ ناو دۆزەخ).

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ﴾(القمر: ٤٨) واتە: (لەو ڕۆژەدا ڕادەکێشرێن لەسەر دەم و چاویان بەناو ئاگردا و پێیان دەوترێت: دە بیچێژن تاڵاوی دۆزەخ). عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ باسی چۆنێتی ڕاکێشانی دۆزەخی یەکانمان بۆ دەکات کە چۆن دۆزەخ شاڵاوی ئاگریان بۆ دەبات دەفەرموێت: ". . . إن الرّجل ليُجرُّ إلى النار فتشهق إليه النار شهقة البغلة إلى الشعير وتزفر زفرة لايبقى أحدٌ إلاّ

خاف"[١٩]. واتە: (پیاوی وا هەیە ڕادەکێشرێت بەرەو دۆزەخ و ئاگریش بەرو ڕووی بۆی دێت و شاڵاوی بۆ دەبات وەك چۆن ئێسترێك شاڵاو بۆ جۆ دەبات کە دیبینێت).

وە دۆزەخ ناڵەو دەنگێك دەردەکات هیچ دروستکراوێك نامێنێت کە نەترسێت. وەلەکاتی فڕێ دانیان بۆ ناو دۆزەخ پێیان دەڵێن: ﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ (الطور: ١٤) واتە: (ئا ئەوە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بەدرۆتان دەزانی). وە فریشتەکان بێ باوەڕەکان بەقژی پێشە سەریان یاخو بە قاچەکانیان دەیانگرن و دەیان خەنە ناو دۆزەخەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلْأَقْدَامِ ﴾(الرحمن: ٤١) واتە: (تاوانکاران بەسەروو سیمای خۆیاندا لەو ڕۆژەدا دەناسرێنەوە وە بەقژی پێشە سەریان و قاچیان دەیان گرن و پاشان فڕێیان دەدەنە ناو دۆزەخەوە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ (ق: ٢٤) واتە: (هەموو بێ باوەڕێکی کەلە ڕەق فڕێ دەدەنە ناو دۆزەخەوە). بێ باوەڕان لە جێگەیەکی زۆر تەسکەوە فڕی دەدرێنە ناو دۆزەخەوە وەك دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَآ أُلْقُواْ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْاْ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴾ (الفرقان: ١٣) واتە: (کاتێك دۆزەخیەکان هەموو بەیەکەوە دەبەسرێن و لە جێگەیەکی تەسکەوە فڕی دەدرێنە ناو دۆزەخەوە و لەوێدا دەست دەکەنە هاوار و شیوەن).

عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەباس (رضي الله عنهما) دەفەرموون: " إن جهنم لتُضيّقُ على الكافر كتضيّق الزّجِ على الرُّمح"[٢٠] واتە: (دۆزەخ تەسك دەکرێت بەسەر بێ باوەڕاندا وەك چۆن سەری ڕم تەسك دەکرێت بەسەر دەسکەکەیدا). وەبەم مانایەش لەفەرموودەیەکدا هاتووە کە گێڕاویانەنەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((والذی نفسي بيده إنهم ليستكرهون في النار كما يستكره الوتد في الحائط))[٢١] واتە: (سوێند

---

[١٩] أخرجه: والطبري (التفسير) (١٩٩٣٦)، وابن أبي الدنيا في (صفة النار) (١٦٢)، وابن رجب في (التخويف من النار) (ص: ١٠)، وقال الحافظ ابن كثير في (تفسير القران العظيم) (٤ /٢٧٧): إسناده صحيح.

[٢٠] أخرجه: ابن مبارك (زوائد الزهد) (٢٥٩)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٢٠٤).

[٢١] أخرجه: ابن وهب كما في (تفسير القران العظيم) (٤ /٢٧٧).

بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوانە ئەوەند بە نارەحەت دەکرێن بە ناو ئاگردا وەك چۆن مێخێك بەنارەحەت دەکرێت بە ناو دیواردا).

بێ باوەڕان کە فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ لەوێدا بە تەواوی گوێیان لە دەنگ و شاڵاو و ناڵە و گڕ و بڵێسەی دۆزەخ دەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ﴾ (الملك: ٧).

## یەکەم کەسێك لە موسوڵمانان کە دەخرێتە ناو دۆزەخەوە

ئەوانیش سێ جۆر کەسن وەك ئەبو هرەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((أول الناس يُقضى يوم القيامة [عليه] رجلٌ رجلٌ جمع القران، ورجلَ قتل في سبيل الله و رجل كثير المال. . . )) ثم بَيّن ﷺ مسائلتهم والقائهم في النار ثم قال: ((يا أبا هريرة أولئك الثلاثة أول خلق الله تُسعُر بهم النار يوم القيامة))[٢٢]. واتە: (یەکەمین کەسان کە قەزای خوای گەورەیان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت لە ڕۆژی کۆتایدا چەند پیاوێکە: یەکەمیان پیاوێکە کەهەموو قورئانی کۆکردۆتەوە، پاشان پیاوێك کە لەپێناوی خوا شەهید بووە، پاشان پیاوێك کە پارەدارو دەوڵەمەند بوو، خوای گەورە بە کابرای زاناو قورئان خوێنەکە دەڵێت: ئایا ئەوەی فێری پێغەمبەرەکانی خۆم کرد فێری تۆشم نەکرد؟ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەی زانیت کارت پێی کرد؟ ئەویش دەڵێ: لە پێناوی تۆدا زانستی شەرعی فێربووم و خەڵکانم فێرکرد وە قورئانم لە پێناوی تۆدا خوێند بە درێژایی شەو و ڕۆژ، خوای گەورە دەفەرموێت: درۆت کرد و فریشتەکانیش دەفەرموون: درۆت کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: بۆیە زانست فێربوویت بۆ ئەوەی پێت بڵێن زانایە، بۆیە قورئانیشت خوێند بۆ ئەوەی پێت بڵێن قورئان خوێنە. پێت وترا، ئینجا فەرمان دەکات خوای گەورە کە ئەم کابرایە لەسەر دەم وچاو ڕابکێشرێت بۆ دۆزەخ و فڕێ بدرێتە دۆزەخەوە.

پاشان خوای گەورە بەپیاوی دووەمیان دەفەرموێت: لە پێناوی چی دا کوژرایت؟ ئەویش دەڵێت فەرمانم پێ کرا بە جیهادکردن لە پێناوی تۆدا منیش جیهادم کرد و لەپێناوی تۆدا

---

[٢٢] أخرجه: مسلم (١٩٥٠)، والترمذي (٢٣٨٢) والنسائي (٦/٢٣) وابن حبان (٤٠٨) وقال محققه: أسناده صحيح، والحاكم (٤١٨/١) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٢٠).

کوژرام. . . خـوای گـەورە پێـی دەفـەرموێت: درۆت کـرد فریشـتەکانیش دەفـەرموون درۆت کـرد. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: نـەخێر بـەڵکو ویسـتت پێـت بڵـێن فـلان کـەس ئـازا و جەربەزەو لێهاتووە تۆ بـۆ ئـەو وشـەیە وات کـرد پێـت وتـرا، خـوای گـەورە بـەپیاوی سـێیەم دەفەرموێت: ئەوەندە سامانم پـێ نـەدایت کـە پێویسـتیت بـەکـەس نـەبێت؟ ئـەویش دەڵێـت: بەڵێ ئـەی پـەروەردگار، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ئـەو سـامانەی پـێم بـەخشـیت لەچـی دا سـەرفت کـرد؟ ئـەویش دەڵێـت: بـەو پارەیـە سـیلەی ڕەحمـم پـێ بـەجێ دەهێنـا، و خێـرم لێ دەکرد، وە هەر ڕێگەیەك کە تۆ پێت خۆش بووبێت پـارەی تیادا سـەرف بکرێـت مـن پـارەم تیادا سەرف دەکرد. خوای گەورە دەفەرموێت: درۆت کرد، فریشتەکانیش دەفەرموون: درۆت کرد، خوای گەورەش پێی دەفەرموێت: بۆیە وات کرد بۆ ئەوەی پێت بڵێن پیـاوێکی چاکە و لەڕێی خوادا دەبەخشێت. پێت وترا. . . . . . تۆ بۆ ئەو وشەیەت بوو. خوای گـەورە فـەرمان دەدات کـە لەسـەر دەم وچـاو ڕابکێشـرێت بـۆ دۆزەخ. . . . . . (لـە کۆتـای فەرموودەکـەدا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ئەی ئەبوهورەیرە ئەو سێ کۆمەڵە یەکەم دروست کراوانـی خـوای گەورەن، (واتە: لە موسوڵمانان) کە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە و ئـاگری دۆزەخیان پـێ گەرم دەکرێت).

وە دوای ئـەوان سـێ کۆمـەڵی تـر ڕاپێچـی دۆزەخ دەکـرێن و ئـاگر دەیـان سـووتێنێت وەك ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

((تخرجُ عنق من النار يوم القيامة لها عينان تُبصران وأذنان تسمعان ولسان ينطق يقول: إني وُكِّلتُ بثلاثةٍ: بِكُل جبار عنيد، و بكُلّ من دعا مع الله إلها آخر وبالمصورين))[٢٣]

واتە: (پارچە ئاگرێك لە شێوەی ملدا لە دۆزەخ لـە ڕۆژی کۆتایـدا دێتـە دەرەوە و دوو چـاوی هەیە پێیان دەبینێت و دوو گـوێی هەیـە پێیـان دەبیسـتێت و زمانیشـی هەیـە و قسـەی پـێ دەکات و دەڵێـت: مـن فرمـانم پـێ کـراوە سـێ کۆمـەڵ لەگـەڵ خـۆم ڕاپێچـی دۆزەخ بکـەم: یەکەمیان: هەموو زۆردارێکی کەلـە ڕەق، دووەمیـان: هـەموو ئەوکەسـانەی کـە هاوتایـان بـۆ خوادا دانـاوە و پەرستویانە، سـێ هـەمیان: هـەموو ئەوانـەی وێنـەیان کێشاوە و دروسـتیان کردووە).

---

[٢٣] أخرجه: أحمد (٣٣٦)، وابن أبي شيبة (٣٤١٣٠)، والترمذي (٢٥٧٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٨٣)، و(السلسلة الصحيحة) (٥١٢).

وە ئەبیل ئەحوەص (رحمه الله) دەفەرموێت: "يبدأ بالأكابر فالأكابر جرماً" (٢٤). واتە: "سەرەتا گەورە تاوانبارەکان یەك لە دوای یەك فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە".

لە پاش ئەوان دووڕووە و تاوانبارەکان لەکاتی پەڕینەوەیان بەسەر پردی صراتدا دەکەونە خوار بۆ ناو دۆزەخ لەگەڵ ئەوانەی کە داهێنراوەکانیان هێناوەتە ناو ئیسلام و بە بەشێکی ئاینیان داناوە.

## خازنی دۆزەخ

دۆزەخ چەندەها فریشتە بەڕیوەی دەبەن و ژمارە و شێوە و قەبارەیان کەس نایزانێت تەنها خوای گەورە نەبێت کە ئەزانێت چەندن وەچۆنن، بەلاَم لێپرسراوی هەموو دۆزەخ ناوی (مالك صاحب النار)ە کە لەفەرموودەکەی ئیمامی موسلیمدا هاتووە (ژ: ٤٢٣).

ئەو فریشتانە ئەرکیان جۆش دانی دۆزەخ و سزادانی دۆزەخیەکانە، لە نێوانیاندا کۆمەڵێك فریشتەی تایبەت هەن کە ناویان (الزبانية)یە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴾ (المدثر: ٣٠ - ٣١) واتە: (نۆزدە فریشتەی تایبەتن و ئەو فریشتانە ئەرکی سزادان و بەڕێوە چوونی دۆزەخیان لە ئەستۆدایە و دیاری کردنی ئەو ژمارەیە تاقیکردنەوەیە بۆ بێ باوەڕان و دڵنیابوونی خاوەن کتێبەکانە و زیاتر بوونی بڕوای بڕوادارانە. . . )یەکێك لە زانایان کە ناوی (أبی العوام) و دەفەرموێت: " عليها تسعة عشر ألف ملك لأن الله تعالى يقول ﴿ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ "(٢٥). واتە: (ژمارەی ئەو فریشتانە کە لەڕاستیدا نۆزە هەزارە چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (دیاری کردنی ئەو ژمارەیە تەنها بۆ تاقیکردنەوەی بێ باوەڕانە)).

---

(٢٤) أخرجه: هناد (الزهد) (٢٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٢٥) أخرجه: ابن أبي شيبه (١٢٠٣٠)، وابن المبارك (الزوائد) (ص: ٩٧)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٦١).

ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی (رحمه الله) دەفەرمویت: (بەگوێرەی وتەکەی ئەبیل عەوام دیاری کردنی ژمارەی ئەو فریشتانە تاقیکردنەوەیە بۆ بێ باوەڕان چونکە ژمارەیەکی ئەوەندە کەم هاتووە کە دەچێتە خەیاڵەوە. بەلام ئەوەی زۆر باوە لای پێشینەکان و ئەوانەی دواتریش (السلف و الخلف) ئەوەیەکە ئەو ژمارە کەمە تەنها بۆ خەڵەتاندنی بێ بڕواکانە کە گومانیان وابوو دەتوانن بەرەنگاریان ببنەوە و لەگەڵیان بەجەنگ بێن، و نەیان دەزانی کە هەموو مرۆڤ توانای بەرەنگاربوونەوەی یەکێك لەو فریشتانەیان نی یەوە.

وە عەکریمەش ﵁ فەرموویەتی: "یەکەم کۆمەڵ کە دەگەنە بەردەم دۆزەخ، لەبەردەم دەرگاکەیدا چوار سەد هەزار فریشتەی بەرپرسی دۆزەخ دەبینن کە ڕوخساریان ڕەش و کەڵبەکانیان دیارە و خوای گەورە هەموو جۆرە بەزەییەکی لە دڵیاندا هەلگرتووە"[٢٦].

وە خوای گەورە باسی ئەو فریشتانەی کردووە کە توندو زبر و بەهێزن وەك دەفەرمویت: ﴿عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ (التحريم: ٦) واتە: (ئەو فریشتانە زۆر توڕە و زبر وتوند وتیژن سەرپێچی خوای خۆیان ناکەن)، ئەبو عیمرانی جوەنی (رحمه الله) دەفەرمویت: "ليس في قلوبهم رحمة إنما خلقوا للعذاب"[٢٧] واتە: (ئەوانە هیچ جۆرە بەزەییەك لە دڵیاندا نیە و تەنها بۆ سزا و ئەشکەنجەدان دروست کراون).

وە حەسەنی بەصریش (رحمه الله) دەفەرمویت: " فيقول الرجل من أهل النارللملك: أرحمني، فيقول: كيف أرحمك ولم يرحمك أرحم الراحمين" [٢٨] واتە: (پیاوێك لە دۆزەخیەکان بە فریشتە کە دەڵێت: بەزەیت بە من دابێتەوە ئەویش پێی دەڵێت: چۆن بە بەزەییم بۆت لە کاتێکدا خوای گەورەی زۆر بە بەزەیی بەزەیی نەبووە بۆت).

لێپرسراوی سەرجەم دۆزەخ (مالیکە)کە فریشتەیەکی تایبەتە. خوای گەورە لەقورئان دا ناوی هێناوە و پێغەمبەری خواش ﷺ لە خەوی دا بینیویتی وە هەروەها لە شەو ڕدویەکەیدا بینیویەتی. سەمورەی کوری جوندوب ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ

---

[٢٦] انظر: (التخويف) (ص: ١٧٥).

[٢٧] أخرجه: أبو نعيم (الحلية) (٥/٣٦٩).

[٢٨] أخرجه: ابن أبي الدنيا(صفة النار)(٢٧).

فەرموویەتی: ((رأيت الليلة رجلين أتياني، فأخذا بيدي. . . . . فأتينا على رجلٍ كريه المرآةِ، كأكره ماآنت راءٍ رُجلا مَرْآهُ، فاذا هو عند نارٍ يَحُشها و يسعى حولها قال: قلتُ لهما: ماهذا؟. . . قالا لي. . . وأما الرجلُ كريه المرآةِ الذي عند النار يَحشُها فإنّه مالك خازن جهنم))[٢٩]. واتە: (ئەم شەو لە خەودا بینیم دوو پیاو هاتن بۆ لام و هەر دوو دەستیان گرتم و لەگەڵ خۆیان منیان برد. . . تا گەیشتنە پیاوێك ڕوخسار زۆر ناشرین، کە ناشیرینتر بوو لە ڕوخساری ناشیرینترین پیاو، کە بەر چاوکەوت بێت، لەوێدا لای ئاگرێکەوە بوو گڕ و تینی پێ دەداو بە چواردەوریدا هەڵدەسوڕا. . . . تا بە هەردووکیانم وت: ئەمە چیە؟. . . ئەوانیش پێیان وتم: ئەو پیاوە ڕووخسار ناشرینەی کە ئاگرەکەی جۆش دەدا ئەوە (مالك خازن النار)ە واتە: گەورەی هەموو فریشتەکانی دۆزەخە. وە هەر ئەو فریشتەیەیە کە پێغەمبەرﷺ لە شەو ڕەویەکەدا دەربارەی دەفەرموێت: ((. . وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء. . . فحانت الصلاة فامتهم، فلما فرغت من الصلاة قائل يقول: يا محمد هذا مالك صاحب النار فسلّم عليه، فالتفت إليه فبدأني بالسلام))[٣٠]. واتە: (لەگەڵ پێغەمبەراندا بووم، کاتی نوێژهات (دیارە نوێژی بەیانی بوو) منیش پێش نوێژیم بۆکردن، کاتێ کەنوێژەکەم تەواوکرد یەکێك وتی: ئەی محمد ئەوە مالیکی خاوەن دۆزەخە سەلامی لێ بکە، دەفەرموێت: پێش ئەوەی من سەلامی لێ بکەم لەپێش مندا ئەو سەلامی لێ کردم).

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە دۆزەخیەکان کاتێ دەخرێنە ناو دۆزەخەوە، هەر لە دەرگاکەیدا ئەو مالیکی دۆزەخە وەکو ڕیسواکردنێك بۆ ئەو کەسانە لێیان دەپرسێت سەبارەت بەو هۆکارانەی کە بۆتە هۆی ڕاپێچ کردنیان بۆ ناو دۆزەخ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧١ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ (الزمر: ٧١ -٧٢) واتە: (کافران ڕەوانە دەکرێن و ڕاپێچی

---

[٢٩] أخرجه: أحمد (المسند)(٥/٨)، والبخاري (١٣٨٦)، ومسلم (٢٢٧٥) والترمذي (٢٢٩٥)، ابن حبان (٦٥٥).

[٣٠] أخرجه: مسلم (٤٢٩)، وأحمد (المسند) (٣٠٤٦).

دۆزەخ دەکرێن کاتێ کە نزیکی ڕۆخی دۆزەخ دەکرێنەوە مالیکی دۆزەخ لێیان دەپرسێت ئایا نێرراوەکان لە خۆتان نەهاتن بۆلاتان ئایەتەکانی خواتان بەسەردا بخوێننەوە وە ئاگادارتان بکەنەوە بەگەیشتنتان بە ڕۆژێکی ئاوەها ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ هەروا بوو بەڵام وشەی سزای خوای جێگیر بوو بە سەر بێباوەڕەکاندا. ئەوانیش پێیان دەڵێن بچنەژوورەوە بۆ ناو دەرگاکانی دۆزەخ و هەتا هەتایە تیایدا بمێننەوە وخراپترین جێگەی خۆبەزل زانەکانە...).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴾ (الملك: ٨) واتە: (هەرکاتێك کۆمەڵێك دەبرێن بۆ ئەوەی بخرێنە ناو دۆزەخ خەزەنەی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکات: ئایا پێغەمبەرێك و ئاگادار کەرەوەیەك نەهات بۆلاتان؟ لەوەلامدا دەڵێن: بەڵێ نێرراوان لەلایەن خواوە هاتن بۆلامان بەڵام ئێمە بەدرۆمان دەخستنەوە ودەمان وت: خوای گەورە هیچ شتێکی نەناردووە و ئێوە لە گومڕاییەکی گەورەدا دەژین، پاشان دان دەنێن بەتاوانەکانی خۆیاندا، ولە گوێ کەڕی خۆیاندا دەڵێن: گەر ئێمە گوێمان بگرتایە و عەقڵمان پێ بشکایە، ئەوا نەدەبووین بەهاوڕێ کەسانێکی دۆزەخی). وەبۆ زانینی شێوە و سیفەتی خازنی دۆزەخ دەتوانیت سەیری کتێبی (البعث والنشور)ئیمامی بەیهەقی بکەیت ژمارە(٤٦٢ — ٤٦٣).

## دەرگاکانی دۆزەخ

دەرگاکانی دۆزەخ وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴾ (الحجر: ٤٤) واتە: (دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە و هەموو دەرگایەك بە شێکی دیاری کراوی خۆی لێوە دەچێتە ژوورەوە). وەدەرگاکانی دۆزەخ کاتێك دەکرێنەوە دۆزەخیەکان دەچنە ناوی وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ

يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (الزمر: ٧١).

وە دەرگاكانی دۆزەخ هەریەكەیان ناوێكی تایبەتی هەیە و لە فەرموودەیەكی لاوازدا هاتووە وەك ئیمامی بەیهەقی (رحمه الله) دەفەرموێت: "... گێڕاومانەتەوە لە فەرموودەیەكی (مرسل)دا كە دەفەرموێت: دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە و ناوی هەر دەرگایەكیان بەم جۆرەیە: جهنم، لظى، الحطمة، السعير، السقر، الجحيم، الهاوية "[٣١].

ئیبنو عومەر ﷺ لە خەودا دۆزەخی نیشاندرا. و لە وەسفی بینینی دۆزەخدا دەفەرموێت: "... ثمت فرأيت ملكين أتياني فأنطلقابي إلى النار [حتى وقفوا بي على شفير جهنم] فاذا هي مطوية كطي البئر لها قرون كقرون البئر، [وهي الخشبة التي عليها البكرة] بين كل قرنين ملك بيده مقمعة من حديد "[٣٢]. واتە: (لەخەومدا دوو فریشتە هاتن بەرەو دۆزەخ منیان برد هەتا لەسەر ڕۆخی دۆزەخدا ڕایان وەستانم و تەماشام كرد وەك بیر وا بوو، وە چەندەها داری هەڵێنجاندنی بە چواردەورەوە بوو، لە نێوان هەر دوو دارێكدا فریشتەیەك وەستا بوو گورزێكی ئاسنی بە دەستەوە بوو. دەفەرموێت: (تەماشام كرد دۆزەخ هاتۆتەوە یەك)).

وە ئیمامی علی ﷺ باسی چونێتی دەگاكانی دۆزەخی كرووە و فەرمویەتی: "تدرون كيف أبواب جهنم؟ قال قلنا: كنحو هذهِ الابواب، قال (لا، ولكنها هكذا) ووضع يده فوق) وبسط أبوعمر يده على يده "[٣٣] واتە: (دەزانن دەرگاكانی دۆزەخ چۆنە؟ ئەوانیش وتیان: وەكو ئەم دەرگایانە وان كەلە دیواردا ڕاوەستێنراون، ئەویش فەرمووی نەخێر دەرگاكانی بەم جۆرەیە دەستی خستە سەر دەست). كەواتە دۆزەخ وەك چاڵێك وایە دەرگاكانی یەك لەسەریەكن.

---

[٣١] أخرجه: البيهقي (شعب إلايمان) (٣٨٤)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) رقم (٨) عن ابن جريج.

[٣٢] أخرجه: البخاري (٧٠٢٨، ٧٠٣٠، ١١٢١)، ومسلم (٢٤٧٨).

[٣٣] أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (٨٩٠) وقال محققه: أخرجه أحمد (الزهد) (ص: ١٣١) بإسناد صحيح، وأخرجه ابن أبي شيبة (٣٤١١٦)، وابن أبي الدنيا في(صفة النار) رقم (٧)، وابن مبارك (زوائد الزهد)(ص: ٢٩٤)، والبيهقي (البعث والنشور) قم (٤٦٠). وهناد في (الزهد) (٢٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

**لەڕیوایەتێکی تردا ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرمویٚت:** " أبواب النار بعضها فوق بعض، يبدأ بالأسفل فيملأ فهو أسفل السافلين ثم الذى يليه ثم الذى يليه حتى يملأ النار– في رواية– [فيملاء الأول ثم الثاني ثم الثالث ثم الرابع ثم السابع] "[٣٤] **[دەرگاکانی دۆزەخ هەندێکیان لەسەر هەندێکیانن واتە: دەرگا لەسەر دەرگایە، سەرەتا لە خوارەوە پڕ دەکرێت کە هەرە خواری خوارەوە پاشان دەرگی سەرو ئەو پڕدەکرێت وە بەو جۆرە هەتا بە تەواوی هەمووی پڕدەکرێت. . .] لەڕیوایەتێکی تردا [ یەکەمیان پڕ دەبێت پاشان دووەم پاشان سێهەم پاشان چوارەم پاشان حەوتەم].**

**ئیمامی قورتوبی** (رحمه الله) **دەفەرمویٚت:** " قال العلماء، أعلى دركات النار (جهنم) وهى مختصة بالعصاة من أمة محمد ﷺ وهى التى تخلو من أهلها. . . ، ثم لظى ثم الحطمة، ثم السعير، السقر، الجحيم، الهاوية. . . " **واتە: [زانایان فەرموویانە: بەشی سەرەوەی دۆزەخ تایبەتە بەموسوڵمانە گوناهـ بارەکانی ئومەتی پێغەمبەر ﷺ وە ئەو بەشەیەکە کەسی تیا نامێنێتەوە. . . پاشان (لەظی)پاشان (الحطمة)پاشان (السعير)پاشان (السقر) پاشان(الجحيم) پاشان(هاویە)یە.**

**ضەحاك** (رحمه الله) **دەفەرمویٚت:** " في الدرك الأعلى المحمديون، وفي الثاني النصارى، وفي الثالث اليهود، وفي الرابع الصابئة، وفي الخامس المجوس، وفي السادس المشركون، وفي السابع المنافقون"[٣٥] **واتە: (دەرگا و بەشی سەرەوەی دۆزەخ بۆ ئومەتی پێغەمبەرە ﷺ، وە دووەمیان بۆ گاورە، وە سێ هەمیان بۆ جوولەکە، وە چوارەمیان بۆ لەدین هەڵگەڕاوەکانە، وە پێنجەمیان بۆ ئاگرپەرستەکانەوە، شەشەمیان بۆ هاوبەش پەیداکەرانە، وەحەوتەم بۆ دووڕووەکانەوە).**

**وە لە دونیادا دەرگاکانی دۆزەخ لە ڕەمەزاندا دادەخرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚت:** ((إذا كان أول ليلة من رمضان . . . وغلقت أبواب النار فلم يُفتح منها باب. . ))[٣٦].

---

[٣٤] أخرجه: ابن أبي شيبة (٣٤١١٥)، والطبري (التفسير) (٢٤/١٤)، وهناد (الزهد) (٢٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٣٥] أنظر: (التذكرة) للقرطبي (٢٦١/٢)، وذكره وابن أبي الدنيا (صفة النار) برقم (٨) عن ابن جريح.

[٣٦] أخرجه: الترمذي (٦٨٢)، وابن ماجة (١٦٤٢) وصححهُ الشيخ الالباني في(صحيح الترمذي) (٥٤٩)، و(صحيح ابن ماجة) (١٣٣١).

واتە: (کە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان دێت. . . دەرگاکانی دۆزەخ هەموو دادەخرێت و هیچیان ناکرێتەوە). بەلاّم دۆزەخ هەموو ڕۆژێك گەرم دەکرێت لەکاتی وەستانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسماندا، وەك پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری سەفوانی کرد ﷺ و فەرمووی: ((إذا صليت الصبح. . . فإذا أعتدلت الشمس على رأسك، فإن تلك الساعة تسجر فيها جهنم، وتفتح فيها أبوابها حتى تزول عن حاجبك الايمن فأذا زالت عن حاجبك الايمن فصلّ فإن الصلاة محضورة متقبلة حتى تصلى العصر. . . ))(٣٧). واتە: (کاتێ گەرۆژ لەسەر سەرت ئەستوون بوو ئا لەو کاتەدا نوێژ مەکە چونکە لەو سەعاتەدا دۆزەخ زۆر گەرم دەکرێت و دەرگاکانی تیادا دەکرێتەوە هەتا تیشکی ڕۆژ لەلای بڕۆی لای ڕاستەوە دەڕوات بەرەو لای چەپ دوای ئەوەی کە خۆر بەئەستونی نەما لەسەر سەرت وە لار بۆوە لەلای بڕۆی ڕاستەوە بەرەو لای چەپ ڕۆیشت دواجار نوێژبکە چونکە ئەوکات نوێژ قبول کراوە هەتا نوێژی عەسر دەکەیت). وە لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إذا اشتد الحر فابردوا بالصلاة فان شدة الحرّ من فيح جهنم))(٣٨). واتە: (هەرکات خۆر لە نیوڕۆدا زۆر گەرم و بەتین بوو ئێوە نوێژی نیوەڕۆ کەمێك دوا بخەن و تا کەمێك فێنکی دێت چونکە تین و پەرەسەندنی گەرما لە هالاّوی گەرم دۆزەخەوەیە).

وەهەروەها دۆزەخ پەیتا پەیتا گەرم دەکرێت لە دوای پڕبوونی وەك خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا﴾ (الإسراء: ٩٧) واتە: (هەر کات خامۆش بوونی ئەو جا زیاتر گڕوتینی پێ دەدەین). دۆزەخیەکان لە دوای چوونیان بۆ دۆزەخ دەرگاکانی دۆزەخیان بەسەردا دادەخرێت وەك خوای گەوەر دەفەرموێت: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ۝٨ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ﴾ (الهمزة: ٨ – ٩).

---

(٣٧) أخرجه: أحمد (٥/٣١٢)برقم (٢٢٦٦١) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٣ /٥١٨) وصححه و وافقه الذهبي، وابن ماجة (١٢٥٢)، وابن حبان (٦١٩)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٣٧١) حسن صحيح، وصحيح الجامع (٦٦٣، ٣٧٧٥).

(٣٨) أخرجه: البخاري (٥٣٣).

ئەبو هورەیرە ﷺ لە مانای ئەم ئایەتدا: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ دەفەرمویّت: "مطبقة ليس لها أبواب"[٣٩] واتە: (هەمووی بەسەریەکدا دیّتەوە و دەرگاکانی دادەخریّت ونامیّنیّت).

# ئامادەی دۆزەخ لە ئیّستادا

خوای گەورە دۆزەخی دروست کردووە و ئامادەی کردووە بۆ بێ باوەڕەکان وەك دەفەرمویّت: ﴿...... فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾(البقرة: ٢٤) واتە: (خۆتان بپاریّزن لە دۆزەخ کە سوتەمەنیەکەی خەڵکان و بەردە وئامادەکراوە بۆ بێ باوەڕان). وەهەروەها دەفەرمویّت: ﴿.... وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ (الأحزاب: ٨) واتە: (سزایەکی زۆر بە ئازاری ئامادەکردوە بۆ بێباوەڕان).

وە هەروەها بەڵگەی تر لەسەر ئەوەی کە دۆزەخ هەیە و ئامادەیە ئیّستا، فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە ﷺ کەدەفەرمویّت پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لما خلق الله الجنة والنار، أرسل جبريل ؏... قال: أذهب إلى النار [ فانظرإليها ] وإلى ماأعددت لأهلها فيها، فنظر إليها فاذا هي يركب بعضها بعضاً، فرجع [ إليه ] فقال: وعزتك: [لايسمع بها أحد فيدخلها ] فامربهافحُفّت بالشهوات فقال، ارجع فانظر إليها [فرجع] فنظر إليها، فاذا هي قد حُفَت بالشهوات فرجع وقال: [ أي ربّ ] وعزّتك لقد خشيت أن لاينجو منها أحد الاّ دخلها وفي رواية [ لقد خشيت أن لايبقى أحد إلاّ دخلها]))[٤٠]. واتە: [کاتێ خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی دروست کرد..... خوای گەورە جبریلی ناردوو پێی فەرموو: بڕۆ تەماشای دۆزەخ بکە، وە تەماشای ئەوانە بکە کە تیایدا ئامادەم کردووە بۆ دۆزەخیەکان، ئەویش چوو تەماشای کرد و بینی ئاگر بەسەر ئاگردا دەکەویّت و یەکتری تیّك دەشکیّنن و ئنجا گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە و فەرمووی سویّند بە عزەتی تۆ ئەی پەروەردگار هەر

[٣٩] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٠٧)، و انظر (التخويف من النار)لابن رجب (ص: ٨٣)، و(التفسير) للطبري (١٢٣/٣).

[٤٠] أخرجه: أحمد (٣٣٣/٢)، ابوداود (٤٧٤٤)، والنسائي (٣/٧)، والترمذي (٢٥٦٠)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٩٦/٦) إسناده قوي، وصححه الشيخ الألباني ى (صحيح سنن النسائي) (٣٥٢٣)، و(صحيح سنن الترمذي) (٢٠٧٥)، و (المشكاة) (٥٦٥٩).

بکەوێتە ناوی، پاشان کەسێك باسی ئەم دۆزەخەی بەر گوێ بکەوێت لێی ڕادەکات و نایەڵێت بکەوێتە ناوی، پاشان خوای گەورە فەرمانی دا کە دۆزەخ چوار دەورەکەی بەشەهەوات و ئارەزوواتی دونیا بگیرێت، ئنجا خوای گەورە بە جبریلی فەرموو: بگەڕێرەوەو تەماشای بکە، ئەویش گەڕایەوەو تەماشای کرد هەرچوار لای دۆزەخ بە شەهەوات وئارەزووەکان تەنراوە. واتە: (هەر کەسێك نزیکی ئەو ئارەزووانە بکەوێت دەچێتە دۆزەخ)، ئەنجا گەڕایەوەو فەرمووی: ئەی پەروەردگار سوێند عیزەت و شکۆمەندیت، ترساوم لەوەی کە هیچ کەس لێی ڕزگار نەبێت و هەموو بکەونە ناوی. لەڕیوایەتێکی تردا[ترساوم لەوەی کەهیچ کەسێك نەمێنێت، هەموو بکەونە ناوی])).

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دۆزەخە گەورەیە و سزاکان بەچاوی خۆی بینیوە، وەکو لە ڕیوایەتەکەی عایشەدا (رضي الله عنها) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((رأيت جهنم يحطمُ بعضها بعضاً. . ))[41] واتە: (دۆزەخم بینی ئاگرەکانی یەکتریان تێك دەشکاند)، لە ڕیوایەتێکی تردا لە عوقبەی کوڕی عامرەوە رضي الله عنه پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((صلينا مع رسول الله ﷺ يوماً فأطال القيام، وكان إذا صلى خففَ ثم لانَسمع منه شيئاً غير أنه يقول ((رب وأنا فيهم)) ثم رأيته أهوى بيده ليتناول شيئاً ثم ركع ثم أسرع بعد ذلك فلما سلم رسول الله ﷺ جلس وجلسنا حوله فقال رسول الله ﷺ ((قد علمت أنه راعكم طول صلاتي وقيامي)) قلنا: أجل يارسول الله وسمعناك تقول: ((رب وأنا فيهم))، فقال رسول الله ﷺ: ((والذى نفسي بيده، مامن شيء وعدتموه في الاخرة إلاّ قد عرض عليَّ في مقامي هذا، حتى لقد عُرضت على النار فاقبل إليَّ شيء حتى دنا بمكاني هذا، فخشيت أن تغشاكم، فقلتُ: رب وأنا فيهم، فصرفها عنكم، فادبرتُ قطعاً كأنها الزرابي (أي: البسط ومايُتكأُ عليها)، فنظرت إليها نظرة. . . ))[42]. واتە: (ڕۆژێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد و نوێژەکەی زۆر درێژکرد و زیاد لە کاتەکانی تر بە پێوە وەستا و ئەو پێشتر کە نوێژی بۆ دەکردین زۆری پێ نەدەچوو، لەوێدا تەنها ئەمەمان لێ دەبسیت و دووبارەی دەکردەوە و

---

[41] أخرجه: البخاري (٤٦٢٤).

[42] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧/ ٨٧٢)، وابن حبان (٦٤٣٢) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

دەیووت ((خوایە هێشتا منیان لە ناودام)) پاشان بینیم دەستی درێژکرد تا شتێك بگرێت، پاشان چووە ڕکوع و لەپاش ئەوەش نوێژەکەی زۆر بەخێرایی بۆ کردین و ئەنجا سەلامی دایەوە و دانیشت و هەموو لە چواردەوری خڕبووینەوە، و دانیشتین ئەنجا فەرمووی: ((زانیم کە درێژی نوێژ و وەستانەکەم ئێوەی تۆقاند))؟ ئێمەش وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا دەشمان بیست کە دەت وت: ((خودایە هێشتا منیان لە ناودام)). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێندبەوەی گیانی منی بەدەستە لەم شوێن وەستانەمدا هیچ شتێك نەما لەوانەی کە بەڵێنتان پێدراوە لە ڕۆژی کۆتایدا هەموویم نیشادرا، هەتا دۆزەخیشم نیشاندرا و هەندێك لە گرەکەی بەرەو من هات بۆ ئەم شوێن وەستانەم و ترسام بەسەرتاندا بێت و هەمووتان بسوتێنێت ومنیش وتم: ((خوایە هێشتا منیان لە ناودا)) ئەنجا خوای گەورە لە ئێوەی دوورخستەوە و پاشەو پاش گەڕایەوە وەك پارچە فەڕش و ڕاخەر کۆکرایەوە)).

سەبارەت بە دیارکردنی جێگەی دۆزەخ، عەبدوڵای کوڕی سەلام ﷺ فەرموویەتی: "الجنة في السماء والنار في الارض"[٤٣] واتە: (بەهەشت لە ئاسماندایە و دۆزەخیش لە زەویدایە). وە بەئیسنادێك (لاواز) گێڕراوەتەوە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود و عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە (رضي الله عنهما) کە فەرموویانە: "الجنة في السماء السابعة العليا، والنار في الأرض السابعة السفلى، فاذا كان يوم القيامة جعلها الله حيث يشا"[٤٤]. واتە: (بەهەشت لە ئاسمانی حەوتەمی هەرە سەرودایە، دۆزەخیش لە زەوی حەوتەمی هەرە خوارەودایە، بەڵام کە ڕۆژی کۆتای هاتە پێش خوای گەورە دەیانکاتە ئەو جێگەیەی کە خۆی دەیەوێت).

ئیبنو ڕەجەب (رحمه الله) فەرموویەتی: "هەندێك لەوانەی کە وتویانە دۆزەخ لە زەویدایە ئەوەیان کردۆوە بە بەڵگە وتویانە: بێ باوەڕان هەموو بەیانی و ئێوارە یەك سزا دەدرێن لە ناوگۆڕدا وە لە فەرموودەکەشدا ڕوونی کردوەتەوەکە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە. ئەمەش هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دۆزەخ لە زەویدا بێت"[٤٥]، وە ئەوەی

---

[٤٣] أخرجه: إبن أبي الدنيا(صفة النار)(١٧٨) والبيهقي (البعث)(٤٤٩)، وابن رجب (التخويف من النار) (ص: ٦٢).

[٤٤] أخرجه: أبو نعيم (الحلية)(١٠٣/٧)، والبيهقي (البعث)(٤٥٥)، وقال ابن رجب في (التخويف من النار) (ص: ٥٢) اسناده ضعيف.

[٤٥] انظر: (التخويف من النار) (ص: ٥٢).

پشتیوانی وتەکەی (ئیبنو ڕەجەب)دەکات فەرموودەکەی برائە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((. . . يقول الله تعالى: أكتبوا كتابه في سجين في الأرض السابعة السفلى))[٤٦]. واتە: (خوای گەورە فەرمان دەکات و دەفەرمویت: ناوی ئەو بێ باوەڕە لە (سجين)دا تۆمار بکەن کە لە زەوی حەوتەمی هەرەخوار دایە). وە هەروەها ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((. . . فتخرج كأنتن ريح جيفةٍ فينطلقون به إلى باب الأرض [السفلى] فيقولون: ماأنتن هذه الريح كلما أتوا على أرضٍ قالوا ذالك حتى يأتوا به إلى أرواح الكفار))[٤٧]. واتە: (ڕوحی بێ باوەڕ کە دەردەچێت زۆر بۆگەنترە لە بۆنی بۆگەنترین لاکە تۆپیو، پاشان فریشتەکان دەیبەن بەرەو دەرگای زەوی هەرە خوارو دەڵێن: ئەم بۆنە چەند بۆگەنە!! وەکە شۆڕی دەکەنەوە و دەگەنە هەر زەویەك لە (حەوت) زەویەکان هەر ئەوە دەڵێن تا دەیگەیەننە ڕۆحی کافرەکان).

وە هەروەها ئیمامی مەروزی گێڕاویەتیەوە لە ئیمامی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە)کە سەبارەت بەلێکدانەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزە﴿ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴾ (الطور: ٦) فەرموویەتی واتە: دۆزەخ.[٤٨]

ئیبن قودامە (رحمه الله) دەفەرمویت: "الجنة في أعلى عليين والنار في أسفل السافلين"[٤٩]. واتە: (بەهەشت لە بەرزترینی شوێنی هەرە بەرزیدایە و دۆزەخیش لە نزمترین شوێنی هەرە نزمدایە). بەڵام لە ڕاستیدا تەنها خوا خۆی دەزانێت جێگەیان لە کوێیە و چۆنە، وە بۆ ئاشنا بوون بەچەند ڕیوایەتێکی تر سەبارەت بەم باسەکە بڕوانە کتێبی (البعث والنشور) ی ئیمامی بەیهەقی[٥٠].

---

[٤٦] أخرجه: البيهقي (الشعب) (٣٩٥) وقال: صحيح الاسناد.

[٤٧] أخرجه: النسائي (٤/٨)، والحاكم (٣٥٢/١)وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٣٠١٣-٣٠١٤) و قال محققه: اسناده صحيح.

[٤٨] أورده: ابن رجب في(التخويف من النار)(ص: ٥٦) وقال: اسناده جيد.

[٤٩] انظر: (شرح لمعة الاعتقاد) لشيخ محمد صالح العثيمين (ص: ٨٥)، و(لوامع الانوار البهية) (٢٣٩/٢).

[٥٠] أنظر: (البعث والنشور) للبيهقي رقم (٤٤٩ -٤٥٧).

# ناوی دۆزەخیەکان

**خوای گەورە ناوی هەموو خەڵکی دۆزەخی تۆمارکردووە لە پەڕاوگەیەکی تایبەت دا کەناوی(سجين)ە و تایبەت بە خەڵکی دۆزەخ. خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴾ (المطففين: ٧ - ٩) **واتە: (ناوی خراپەکاران لە (سجين)دایە بەڵام تۆ نازانیت (سجين) چیە، ئەو (سجين)ـە کتێبێکی سەر ژمێریە و ناوی خراپەکارانی تێدایە).**

**خوای گەورە وەسفی ئەو کتێبەمان بۆ دەکات، کە ژمارە بە دوای ژمارەدا ناوی هەموو تاوانکارانی تێدا تۆمارکراوە، ئەوەی زیاتر ئەم باسەش ڕوون دەکاتەوە فەرموودەکەی بەرائە ﷺ دەربارەی مردن و ڕوح کێشان کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((وإن العبد الكافر إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة. . . فيصعدون بها. . حتى يُنتهى به إلى السماء الدنيا، فيستفتح له فلا يفتح له، ثم قرأرسول الله ﷺ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ (الأعراف: ٤٠) فيقول الله عزوجل: اكتبوا كتابهُ في سجين، في الأرض السفلى. . فينادى منادٍ من السماء أن كذّب عبدى فأفرشوا له من النار، ويُمهَّدُ من فُرشِ النار. . ))[٥١] **. واتە: (بەندەی بێ باوەڕ کاتێك لە دونیا. دەردەچێت و ڕوو دەکاتە قیامەت و ڕۆژی دوای. . . ڕۆحی دەکێشن و پاشان ڕوحەکەی بەرز دەکەنەوە.... تا دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا و داوایی دەرگا کردنەوەی بۆ دەکەن لەوێدا دەرگای بۆ ناکرێتەوە پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ **واتە: (ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمە یان بەدرۆخستۆتەوە و خۆیان بە گەورە**

---

[٥١] أخرجه: أحمد (٤/٢٨٧)، وأبوداود (٤٧٥٣)، والحاكم (١/٣٧) وصححه و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز) (ص: ٢٠٢).

زانیوە ئەوانە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە و ناچنە ناو بەهەشت هەتا وشتر لە کونە دەرزیەوە دەچێتە ئەو دیوەوە و ئابە و جۆرەش سزا تاوانباران دەدەینەوە. ) پاشان خوای گەورە دەفەرمویێت: ناوی تۆمارکەن لە (سجین)دا لە زەوی حەوتەمی هەرە خوارو. . . . پاشان بانگێك لە ئاسمانەوە دێت و دەڵێت: بەندەکەم درۆی کرد فەرش و ڕاخەری دۆرەخی بۆ ئامادەبکەن. دۆزەخیەکان ناوی خۆیان و باو باپیرو هۆزەکانیان یاداشت کراوە، وە ئەو ناوانە نەلێی زیادەکرێت و نەلێی کەم دەکرێتەوە.

عەبدولای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: ((خرج علينا رسول الله ﷺ وفي يده كتابان فقال: [ أتدرون ما هذان الكتابان؟] فقلنا: لايارسول الله إلا ان تخبرنا. . . ثم قال للذى في شمالِهِ: [ هذا كتاب من رب العالمين فيه اسماء أهل النار واسماء أبائهم، ثم أجمل على آخرهم فلا يُزاد فيهم ولا يُنقص منهم أبداً. ] ثم قال رسول الله ﷺ بيده فنبذهما ثم قال: ((فرغ ربكم من العباد فريق من الجنة و فريق في السعير))[٥٢]. واتە: (ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆلامان دوو کتێبی بەدەستەوە بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی(دەزانن ئەم دوو کتێبە چی یە؟) وتمان نەخێر مەگەر تۆ پێمان ڕاگەیەنیت ئەوە چی یە؟. . . . فەرمووی بەو کتێبەی کە بەدەستی چەپیەوە بوو (ئەمە کتێبێکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە ناوی ئەهلی دۆزەخ و ناوی باوکیان و هۆزەکانیان تیایدا تۆمار کراوە پاشان کۆتای هێنراوە بەو ناوانە نەلێی زیاد دەکرێت و نەلێی کەم دەکرێتەوە. . . . . پاشان فەرمووی: خوای گەورە تەواو بووە لەدیاری کردنی ئەهلی دۆزەخ وبەهەشت، کۆمەڵێك لەبەهەشتان و کۆمەڵێك لەدۆزەخدان).

ئیمامی مبارك فوری (رحمه الله) دەفەرموێت: (وقيل: والظاهر أن هذا الكلام صادرٌ على طريق التصوير والتمثيل مثل الثابت في علم الله تعالى او المثبت في اللوح والمثبت بالكتاب الذى كان في يده، ولا يُستبعد أجراؤه على الحقيقه، فإن الله تعالى قادرٌ على كل شيء،

---

(٥٢) أخرجه: أحمد (٢/١٧٧) و الترمذي (٢١٤١)، والنسائي في (التفسير) (٤٩٣) وقال محققه: إسناده حسن، وابن أبي عاصم في (السنة) (٣٤٨)، و أبو نعيم (الحلية) (٥/ ١٤٨)، و الاجري (١/ ٣٤٩)، الفريابي (القدر) (٤٥) وقال محققه: إسناده صحيح، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي)، (١٧٤)، وفي المشكاة (٩٦)، وفي السلسلة الصحية (٨٤٨).

والنبي ﷺ مستعدٌ لإدراك المعاني الغيبية ومشاهدة الصور المصوغة لها)[٥٣]. واتـە: ((وتـراوە: ئاشكرایە ئەم وتەیە وەك شێوەی نمایش و نواندن نیشان دراوە، وە ئـەوەش چەسـپێنراوە لـە زانینی خوادا و هـەر ئـەوەش بـووە كـە چەسـپێنراوە لـە (الـوح المحفـوظ)دا، وە هـەر ئـەوەش بووە كە چەسپێنراوە لەو دوو كتێبەی كە لە دەستی پێغەمبەردا ﷺ بووە، ئـەوەش ڕاسـتە و بە دووریش نازانرێت چونكە خوای گەورە بە توانایە بەسەر هەموو كارێكدا وپێغەمبـەریش ﷺ ئامادەیـە بـۆ دەرك پـێ كردنـی مانـا پەنهانیـەكان و بینینـی ئـەو وێنانـەی كـە تیایـدا بەرجەستە دەكرێت)).

## قسەكردنی دۆزەخ

دۆزەخ یەكێكە لەدروست كراوەكانی خوای پەروەردگار، كـە دەبینێـت و قسـە وئاخـاوتن دەكات، بۆ بەڵگەش لەسەر ئەمانە چەند فەرموودیەك دێنینەوە كە ئەمانەن:

١- فەرموودەكـەی ئـەبوهوڕەیرە ﷺ كـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((اختصمت الجنة والنار فقالت النار أو ثرتُ بالمتكبرين والمتجبرين وقالت الجنة: مالي لايدخلني الا ضعفاء الناس و سقطهم و عجزهم، فقال الله سبحانه و تعالى للجنة: أنتِ رحمتي أرحم بكِ مَن مِنْ أشاء مِنْ عبادي وقال للنار: أنت عذابي أُعَذِّبُ بكِ مَنْ عبادي ولكل واحدة منكما مِلؤُها))[٥٤]. واتـە: (بەهەشـت لەگـەڵ دۆزەخ بـووە دەمەقاڵـەیان، دۆزەخ وتـی: مـن هـەر زۆردارەكـان و خۆبـەزل زانـەكان دەكرێنـە نـاو مـن، وەبەهەشـتیش وتـی: ئـەوە بـۆ هـەر چەوساوە و لاوازوو بێ دەستەڵاتەكان دێنە ناومن، خوای گەورەش بە بەهەشتی فەرموو: تۆ ڕەحمـەتی منـی، بـە تـۆ ڕەحـم دەكـەم بـەو كەسانـەی كـەخۆم دەمـەوێت لـە بەنـدەكانم. وە بەدۆزەخیشی فەرموو: تۆ سزای منی بە تـۆ سـزای ئـەو كەسـانە دەدەم كـە خـۆم دەمـەوێت. لەبەندەكانم وە هەر دوولاتان پڕ بەخۆتان پڕدەكرێن).

[٥٣] انظر: (تحفة الاحوذي) (٦ /٣٥٠).

[٥٤] أخرجه: البخاري (٧٤٤٩-٧٤٥٠)، ومسلم (٢٨٤٦)، وعبد الرزاق (٢٠٨٩٤)، واللالكائي(٧٢٠).

**٢- فەرموودەکەی ئەنەس ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((يلقى في النار وتقول: هل من مزيد، حتى يضع الله قدمه فيها فتقول قط قط))(٥٥) **واتە: (بەردەوام هەر فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخ و هەر دەڵێت: هیتریش ماوە تا خوای گەورە قاچی تێ دەکات دەیهێنێتەوە یەك و داخرێت و دەڵێت: قەت، قەت (واتە: تەواو).**

**٣- فەرموودەکەی ئەبو سەعید ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**
((يخرج عُنُق من النار يوم القيامة لها عينان تبصران وأذنان تسمعان، ولسان ينطق يقول أني وكلت بثلاث. . . ))(٥٦). **واتە: (ملێك لەئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی کۆتایی دا دێتەدەر دوو چاوی هەیە پێیان دەبینێت وە دوو گوێی هەیە پێیان دەبیستێت وە زمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات و دەڵێت فەرمانم پێ کراوە سێ کۆمەڵ لەگەڵ خۆم ڕاپێچی دۆزەخ بکەم.... ).**

**٤- فەروودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**
((ما استجار عبدٌ من النار سبع مرّات إلاّ قالت النار: يارب إنّ عبدك فلاناً إستجار مني فأجرهُ))(٥٧). **واتە: (هەربەندەیەك حەوت جار پەنابگرێت بەخوای گەورە لە دۆزەخ، دۆزەخیش دێتە زمان و دەڵێت: (ئەی پەروەردگار فلان بە ندەت پەنای بە تۆ گرت لە من تۆش پەنای بدە).**

## سوتەمەنی دۆزەخ

**خوای گەورە ڕوونی کردوەتەوەکە بەردی گۆگرد و بێ باوەڕان سوتەمەنی دۆزەخن خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾ (آل عمران: ١٠) **واتە: (بێ باوەڕان سامان و منداڵانیان هیچ سودیان پێ ناگەیەنێت لای خوا و ئەوانەش سوتەمەنی دۆزەخن). وەخوای گەورە**

---

(٥٥) أخرجه: البخاري (٤٨٤٨).

(٥٦) أخرجه: أحمد (٢/ ٣٣٦)، وابن أبي شيبة (٣٤١٣٠)، والترمذي (٢٥٧٤)، وصححه الشيخ الألباني.

(٥٧) أخرجه: أبو يعلى (٤/ ١٤٧٢)، وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٦/ ٢٢٩) اسناده صحيح على شرط البخاري ومسلم، وصححه على شرطهما أيضاً الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥٠٦)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٥٣).

دەفـەرموێت: ﴿ . . . . . . . وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴾ (التحريم: ٦) واتـە: (سـوتەمەنی دۆزەخ بەرد و خەڵکانە).

صەحابی بەڕێز ئیبن مەسعود ﷺ جۆری ئەو بەردانـە دیاری دەکات و دەفـەرموێت: "هي حجارة من كبريت خلقها الله تعالى يوم خلق السموات والأرض في السماء الدنياء يُعِدُّها للكافرين"[٥٨]. واتە: (ئەوە جۆرە بەردێکی گۆگردی تایبەتـە خوای گەورە لـەو ڕۆژە وە دروستی کردوە کە ئاسمانەکان و زەویەکانی تێدا دروست کردوە و لە ئاسمانی دونیا دایە و ئامادەی کردوە بۆ بێ باوەڕەکان).

بـەردەکانی دۆزەخ وەك بـەردەکانی دونیـا نیـە. ئـیبن ڕەجـەب (رحمه الله) دەفـەرموێت: "وتراوە بەردی دۆزەخ پێنج جۆر ئەشکەنجەی تێدایەکە لە هیچ بەردێکی تـردا نیـە: ئـەو بەردە دۆزەخیانە زوو گڕدەگرن وە زۆر بۆگەن و دوو کەڵیان زۆرە، وە زۆر توند دەلکێن بـە جستەی دۆزەخیەکانـەوە، وە زۆر زۆر گـەرم و بـەهێزن"[٥٩]. لەگـەڵ ئەوانشدا ئەوشتانەی کە پەرستران جگە لە خوا هەموو تێکڕا دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ بۆ زیاتر ڕیسواکردنی بێ بـاوەڕان. خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴾ (الأنبياء: ٩٨) واتە: (ئێـوە و ئەوانـەی دەیپەرستن جگـە لـە خـوا هـەموو تێکڕا سوتەمەنی دۆزەخن و هەر دوولاتان پێکەوە دەکرێنە ناو دۆزەخ).

وە هەروەها مانگ و ڕۆژو هەسارەکان و شتی تـر هـەموو دەبنـە سـوتەمەنی دۆزەخ وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الشمس والقمر ثوران مكوران في النار يوم القيامة))[٦٠]. واتە: (ڕۆژ و مـانگ هـەر دوو گـای کـۆکراوەی نـاو دۆزەخـن لـە ڕۆژی کۆتیـدا). لەگـەڵ هـەموو ئەوانەشـدا هەنـدێك تاوانبـاران و ئەنجامـدەرانی گوناهـە گـەورەکانیش دەبنـە سـوتەمەنی دۆزەخ.

---

[٥٨] أخرجه: الطبري (الكبير) (٩٠٢٦) وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٢٣١)، وابن جرير(٥٠٤)، والحاكم (٤٩٤/٢)، وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي وصححه االشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٧٥).

[٥٩] أخرجه: (التخويف من النار) (ص: ١١١).

[٦٠] أخرجه: الطحاوي (٦٦/١) وقال الشيخ الألباني في(السلسلة الصحيحة) (١٢٤) اسناده صحيح على شرط البخاري.

عومەری کوڕی خەطاب ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یظهر الاسلام حتى تختلف التجار في البحرِ، وحتى تخوض الخيل في سبيل الله، ثم يظهر قوم يقرؤن القران يقولون ! منْ اقرأ منا؟ من أعلمُ مِنا؟ من افقهُ منا))؟ ثم قال لِأصحابه: هل في اولئك من خير)) قالوا لا يارسول الله ومن اولئك قال: ((اولئك منكم من هذه الأمة واولئك هم وقود النار))[٦١] واتە: (ئیسلام شکۆمەند دەبێت هەتا بازرگانەکان بەدەریادا دەچن، وە هەتاکو ئەسپەکان بەهەمەوولادا بلاّودەبنەوە لەپێناوی خوادا، پاشان کۆمەڵێك پەیدادەبن قورئان دەخوێنن و دەڵێن کێ هەیە لە ئێمە زاناتر بێت وشارەزاتر بێت، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: ((ئەو کەسانە هیچ خێرێکیان تیایە))؟ لە وەلاّم دا فەرموویان نەخێر بەلاّم ئەوانە کێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانە لە ئێوەن لەم ئومەتە ئەوانە سوتەمەنی دۆزەخن)).

## فراوانی و قوڵی دۆزەخ

تەنها خوای گەورە نەبێت هیچ کەسێك قوڵی دۆزەخ نازانێت، بەلاّم بۆ ڕوونکردنەوەی گەورەیی قەبارەی دۆزەخ ئەمانە دەکەینە بەلگە:

١- دۆزەخ گەورەیی یەکەی لەوەدایە کەچوار ملیارونۆسەدملیۆن (٤٩٠٠٠٠٠٠٠٠) فریشتەی خوا ناتوانن هەڵی بگرن، بەلکو ڕای دەکێشن.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يؤتى بجهنم يوم القيامة ولها سبعون ألف زمام مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرّونها))[٦٢]. واتە: (دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێ حەفتا هەزار جڵەوگری هەیە، لەگەڵ هەرجڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەیە ڕایدەکێشن).

---

[٦١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢/١٩٤)، والبزار(الكشف) (١٧٣-١٧٤)، وأبو يعلى (٦٦٩٨)، وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٢٣١) اسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (١٣١، ١٣٢، ١٣٣).

[٦٢] أخرجه: مسلم (٢٨٤٢)، والترمذي (٦٩٨)، والطبراني (الكبير) (١٠٤٢٨)، والحاكم (٤/٥٩٥)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٠٨٠).

٢- دۆزەخ خۆر ومانگی تێ فڕێ دەدرێت، کە خۆر سەدەها هەزار ئەوەندەی زەویە.

٣- وە هەروەها ئەو بتانەی کەجگەلەخوا پەرستراون فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە.

٤- زۆربەی مرۆڤ و جنۆکەکان ئەهلی دۆزەخن، وە نمونەی موسوڵمانان لەناو ئەهلی دۆزەخدا وەك تاڵە موویەکی سپی یە بەپشتی گایەکی ڕەش، تاڵەمووەکە سەرجەم ژمارەی موسوڵمانانە لە بەراورد بە ژمارەی بێ باوەڕان، وەك پێغەمبەرﷺدەفەرمویێت: ((ان مثل المسلمين في الكفار كالبقرة البيضاء فيها الشعرة السوداء))[٦٣] واتە: (نمونەی موسوڵمانان لە ناو بێ باوەڕاندا وەك گایەکی سپی وایە کەتەنها یەك تاڵەمووی ڕەشی تیابێت (واتە: تاڵەمووەکە سەرجەم ژمارەی موسوڵمانانە).

٥- لەگەڵ خەڵکاندا یەئجوجو مەئجو هەیە کەخوا نەبێت کەس نازانێت ژمارەیان چەندە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: ((. . . إن معكم لخليقتين ماكانتا مع شيء إلا كثرتاهُ: يأجوج و مأجوج، ومن هلك من كفرة الجن والإنس))[٦٤] •واتە: ئێوە دوو جۆر لە دروست کراوتان لەگەڵدایە کە لەگەڵ هەرشتێك دا بن ژمارەی زیاد دەکەن: ئەو دووانەش (یأجوج و مأجوج)ن لەگەڵ بێ باوەڕە لە ناوچووەکانی مرۆڤ و جنۆکە).

زانا ئیبن ڕەجب (رحمه الله) دەفەرمویێت: " ئەم فەرموودانە ئەوە دەگەیەنن کە زۆرینەی نەوەی ئادەم دۆزەخین وە شوێن کەوتوانی پێغەمبەران کەمن لە بەراوردا لەگەڵ بێ باوەڕان. وە زۆرینەی ئەوانەی کە لە ناو یەکخواپەرستاندا دەچنە دۆزەخەوە ڕەگەزی ئافرەتانن"[٦٥]. وە لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا دۆزەخ پڕنابێت، تا خوای گەورە خۆی پڕی دەکاتەوە. . . وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: ((. . . فأما النار فلا تمتليء حتى يضع [الله عزوجل قدمه فيها ]، فتقول: قط قط فهنالك تمتليء ويزوى بعضها إلى بعض ولا يظلم الله عزوجل من خلقه أحداً))[٦٦]. واتە: (بەڵام دۆزەخ پڕنابێتەوە هەتاوەکو خوای گەورە

[٦٣] أخرجه: أحمد (٦/٣٨٦)، و البخاري (٦٥٢٨)، والترمذي (٢٥٤٧)، وابن ماجة (٢٥٤٧).

[٦٤] أخرجه البخاري (٦٥٣٠)، ومسلم (٢٢٢)، والحاكم (١/٢٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٥٨٣).

[٦٥] التخويف : (ص: ٢١٠)

[٦٦] أخرجه: البخاري (٤٨٥٠)، ومسلم (٢٨٤٦).

خۆی پڕی دەکاتەوە و دەیهێنێتەوە یەك وە خوای گەورە ستەم لە هیچ کەسێك ناکات لە دروست کراوەکانی). لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لاتزال جهنم يلقى فيها وتقول: ! هل من مزيد حتى يضع ربُّ العالمين قدمهُ فينزوي بعضها إلى بعض وتقول: قط قط بعزتك وكرمك))[٦٧]. واتە: (بەردەوام دۆزەخ تێی فڕێ دەدرێت و هەر دەڵێت: ئایە هی تریش ماوە، تا خوای گەورە قاچی تێ دەکات و هەندێکی دێنەوە بەسەر هەندێکیدا ئنجا دۆزەخ دەڵێت: بەسمە بەسمە سوێند بە شکۆمەندی و ڕێزت).

٦- قوڵای دۆزەخ حەفتا ساڵە. ئەبو هورەیرە ؓ دەفەرموێت: ((كنا عند رسولا الله ﷺ فسمعنا وجبة، فقال النبي ﷺ: ((اتدرون ماهذا؟)) قلنا ! الله ورسوله أعلم، قل ((هذا حجرٌ رمى به في النار منذ سبعين خريفاً، فهو يهوى في النار، الآن حتى إنتهى إلى قعرها [فسمعتم وجبتها]))[٦٨]. واتە (ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین گوێمان لە گرمەیەك بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەزانن ئەو گرمەیە چی بوو؟)وتمان خواو پێغەمبەر باشتر دەزانن. فەرمووی: (ئەوە بەردێکە حەفتا ساڵە فڕێ دراوەتە ناو دۆزەخەوە ، لەماوەی ئەم حەفتا ساڵەدا بەڕێوەیە بەرەو خوارەوە ئائێستا کەوتۆتە بنەکەی و ئێوە دەنگەکەیتان بیست). لە ڕیوایەتەکەی عوتبەی کوڕی غەزواندا ؓ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إن الصخرة العظمية لتلقى من شفير جهنم، فتهوى فيها سبعين عاماً ومانُفضي إلى قرارها)) فكان عمر ؓ يقول " أكثروا ذكر النار فإن حرّها شديد وإن قعرها بعيد وإن مقامعها حديد))[٦٩]. واتە: (بەردی هەرە گەورە لە لێواری دۆزەخەوە فڕێ دەدرێتە ناوی و بەناویدا دەچێتە خوار ماوەی حەفتا ساڵ و هێشتا ناگاتە بنەکەی. بۆیە هەموو جار ئیمامی عومەر ؓ دەیفەرموو: زۆر یاد و باسی دۆزەخ بکەن چونکە گەرمیەکەی زۆر بەتینە وە وقوڵایی یەکەی دوورە وە چەکوش و لێدەرەکانی ئاسنە).

---

(٦٧) أخرجه: البخاري(٦٦٦١)، النسائي (الكبرى)، (٧٧٢٥)، و أحمد (٢/٢٧٦)، والترمذي (٣٢٧٢).

(٦٨) أخرجه: مسلم (٧٠٩٦ - ٧٠٩٧)، و أحمد (٢/٣٧١)، والحاكم (٤/٦٠٦)، وابن حبان (٧٤٦٩) وقال محققه حديث صحيح.

(٦٩) أخرجه: الترمذي (٢٥٧٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٨٤)، و(السلسلة الصحيحة (١٦١٢)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٧١).

**٧- وە دووشتی تریش دەتوانرێت بکرێتە بەڵگە لەسەر گەورەیی دۆزەخ ئەو دووانەش (پردی صراط لەگەڵ گەورەیی جەستەی دۆزەخیەکان).**

**و ئیمامی موجاهد** (رحمە اللە) **دەفەرموێت: عەبدوڵای کوڕی عباس** ﷺ **فەرمووی: ئایا دەزانیت پانتای دۆزەخ چەندە؟ منیش وتم: نەخێر. وتی ڕاست دەکەیت سوێند بەخوا نازانیت. یەکێك لە دۆزەخیەکان ماوەی نێوان نەرمای گوێچکەی تاسەرشانی ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی حەفتا ساڵە وەچەندەها شیوی خوێن و کێمی پیادەڕوات. وتم: ئایا ڕووبارە خوێن و کێم؟ وتی: نەخێر بەڵکو چەندەها شیو. پاشان وتی: ئایا دەزانیت دووبارە پانتایی دۆزەخ چەندە؟ منیش دیسان وتم: نەخێر. وتی: ڕاست دەکەیت سوێند بەخوا خاتوو عایشە (رضي الله عنها) بۆی گێڕامەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کردووە سەبارەت بە مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە** ﴿وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ (الزمر: ٦٧) **وتویەتی: ئەم هەموو خەڵکانە لەکوێن لەو ڕۆژەدا ئەی پێغەمبەری خوا** ﷺ. **پێغەمبەریش** ﷺ **فەرموویەتی: ((هەموو تێکڕا لەسەر پردەکەی دۆزەخن))** (٧٠).

**وەلە فەرموودەیەکی تردا ئیبنو عومەر** ﷺ **گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر** ﷺ **فەرمویەتی:** ((لو أن رصاصة مثل هذهِ - وأشار الى مثل الجمجمة - [لو] أرسلت من السماء إلى الارض، وهي مسيرة خمس مئة سنةٍ لَبَلَغتِ الارض قبل الليل، ولو أنّها ارُسِلَتْ مِن رأس السِلسِلة لسارت أربعين خريفاً الليل والنار قبل أن تبلُغ قعرها)) (٧١). **واتە: (گەر قورقوشمێك بە ئەندازەی کەلەسەر لە ئاسمانەوە بدرێتە خوارەوە تا زەوی کە ماوەی ڕێ ڕۆیشتن (٥٠٠ ساڵە) دەگاتە زەوی پێش داهاتنی شەو، بەڵام گەر لەسەر زنجیرێك فڕێ بدرێتە (دۆزەخەوە) خوار ماوەی چل پایز بەشەو و ڕۆژەکانیەوە دەڕوات پێش ئەوەی بگاتە بنکەکەی).**

(٧٠) أخرجه: الترمذي (٣٢٤١)، وأحمد (٢٤٨٥٦) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (٢/٤٣٦) وصححه، وصححه ايضاً الارناؤوط في(شرح السنة) (٤٤١٥)، والالباني في (صحيح الترمذي) برقم (٢٥٨٩).

(٧١) أخرجه: أحمد (٦٨٥٦) وقال محققه الارناؤوط: اسناده حسن، والترمذي (٢٥٨٨) وقال: هذا حديث اسناده حسن صحيح، وابن مبارك (الزهد) (٢٩٠)، وابن كثير في (التفسير) (٨/٢٤٣) وقال: حديث حسن. وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب) ٢١٤٩).

# گەرمی دۆزەخ

خوای گەورە وەسفی ئاگری دۆزەخی کردووە و ناوی ناوە ئاگری هەرە گەورە وەك دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِى يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾(الأعلى: ١٢). هەرکات قەبارەی هەر ئاگرێك گەورەتربێت گەرما وبڵێسەی توندتر دەبێت، لەوەسفێکی تری دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ۝١٠ نَارٌ حَامِيَةُۢ ﴾(القارعة: ١٠ – ١١). واتە: (ئاگرێکی گڕگرتوو بڵێسەدارە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهَا تَرۡمِى بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ﴾ (المرسلات: ٣٢). واتە: (پریشك و پزیسکەی هەڵدەدات وەك کۆشك). هاوەڵی پایە بەرز ئیبن مەسعود ﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: " أما أني لست أقول: الشجرة، ولكن كالحصون و المدائن "[٧٢]. واتە: (من ناڵێم پریشکێکی بە ئەندازەی درەختێکە بەڵکو بەئەندازەی قەلا و شارە هەرە گەورەکانە)، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فِى سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴾ (الواقعة: ٤٢) واتە: (لە بایەکی گەرم ئاوی زۆر بەکوڵدا دەبێت). کەواتە دۆزەخ هەواو باکەی زۆر گەرمە و بەکوڵە و سێبەرەکەی پارچەی دوو کەڵی ئاگرە کە واتە هەرسێکیان زۆر سوتێنەرن.

ئیبنو عەباس ﷺ سەبارەت بە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت: ﴿ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴾ (الواقعة: ٤٣) أي: (من دخان أسود)[٧٣]. واتە: (سێبەری دۆزەخیەکان دووکەڵی هەرە ڕەشی دۆزەخە). وە ئیمامی موجاهد (رحمه الله) دەفەرموێت: سەبارەت بەم ئایەتە پیرۆزەش ﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٖ ﴾ (المرسلات: ٣٠) دەفەرموێت: " هو دخان جهنم: اللهب الاخضر والاسود والأصفر الذي يعلو النار إذا أوقِدتْ "[٧٤]. واتە: (سێبەری دۆزەخیەکان لە سێ جۆر دووکەڵ سەوزو ڕەش و زەرد پێك هاتووە کە بەسەر ئاگرەکەوە بەدیار دەکەون لە کاتی کڵپەو گڕگرتنیدا). وە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا سەبارەت بە گەرمی دۆزەخ

---

[٧٢] أخرجه: البيهقي (الشعب) (٥٧٤)، وفي (البعث) (٢٨٠)، وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٥٣٧٤) اسناده لابأس به، وضعفه الألباني في (ضعيف الترغيب) (٢١٣٥).

[٧٣] أخرجه: الحاكم (٤٧٦/٢) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي. وهناد (الزهد) (٢٣٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٧٤] تفسر الطبري: (٨١/٢٧).

دەفـەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ۝٢٧ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾ (المدثر: ٢٧ – ٢٨) ئیمـامی (السـدی (رحمە الله)) لە ڕوونکردنـەوەی ئـەم ئایـەدەدا دەفـەرموێت: "أي لاتبقى من جلودهم شيأً ولاتذرهم من العذاب". واتـە: (هـیچ لـە پێسـتیان ناهێڵێـت و سزاشـیان لـێ دوور ناخاتـەوە).

پێغەمبـەریش ﷺ لـە ڕوونکردنـەوەی گـەرمی دۆزەخ وەك لـە فەرموودەکـەی ئـەبو سـعدی خودریدا ﷺ دەفەرموێت: ((ناركم هذه جزءٌ من سبعين جزءاًَ من نار جهنم و ضربت بماء البحر [مرّتين] ولو لا ذلك ماجعل الله فيها منفعةً لأحدٍ))[٧٥]. واتـە: (ئـەم ئاگرەتـان بەشێکە لەحـەفتا بەشـی ئاگری دۆزەخ و دووجار ساردکراوەتەوە بـەئاوی دەریـا، گـەر وانـە بووایـە خـوای گـەورە نەیدەهێشـت کـەس سـودی لێ وەربگرێـت). لەڕیوایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ((إنّ ناركم هذه جزء من سبعين جزءاً من نار جهنم ولولا انها طفئت بالماء مرتين ماانتفعتم بها))[٧٦]. واتـە: (ئـەم ئاگرەتـان بەشـێکە لەحـەفتا بـەش لـەئاگری دۆزەخ دووجار کوژاوەتەوە بە ئاو گەر وانەبووایە سوودتان لێ نە دەبینی).

لە ڕیوایەتێکی تردا هاوەڵان وتویانە: ئەی پێغەمبەر ﷺ گەر هـەر ئـەم بەشـەش بووایـە بـەس دەبـوو؟ پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمووی: ((انها فضلت عليهن بتسعة وستين كُلّهن مثل حرّها))[٧٧]. واتە: (ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ جار لـەم بەشـەی ئاگری دونیا بـەهێزترە و گەرمترە). لەڕیوایەتێکی (شاز)دا لە فەرموودەکـەی ئـەبو هورەیرە ﷺ هاتووەکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: ((هذا النار جزءٌ من مائة جزءٍ من جهنم))[٧٨]. واتـە: (ئەمـە بەشـێکە لـە سەد بەش لە گـڕو ئـاگری دۆزەخ). وە لەبـەر زۆر گـەرمی ئاگرەکـەی دۆزەخ سکاڵا لای خوا

---

[٧٥] أخرجه: أحمد (٢/ ٢٤٤) برقم (٧٣٢٧)وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، والحميدي (١١٢٩)، والترمذي (٢٥٩٠)، وابن حبان (٧٤٦٣) وقال محققه اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٨٩)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٦٦).

[٧٦] أخرجه: ابن ماجة (٤٣١٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٨٦).

[٧٧] أخرجه: أحمد (٢٧٢٦٠)، ومالك (١٨٧٢)، والبخاري (٣٢٦٥)، ومسلم (٢٨٤٣)، والدارامي (٢٨٤٧)، وابن حبان (٧٤٦٢).

[٧٨] أخرجه: أحمد (٢/٣٧٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠ /٣٨٧) رواه أحمد و رجاله رجال صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٠٠٦) وهو بهذا اللفظ (شاذ) وانظر: (ضعيف الترغيب) (٢١٢٩).

دەکات وەك لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ هاتووە: ((اشتكت النار إلى ربها فقالت: ربي اكل بعض بعضاً فنفّسِني، فَاذِنَ لَها بِنفسَين [في كل عام ] نَفَسٌ في الشتاء ونَفَسٌ في الصيف فشِدّة البرد الذي تجدون من زمهرير [جهنم] وشدة الحرّ الذي تجدون من حرّ جهنم))[٧٩]. واتە: (ئاگری دۆزەخ شکاتی کرد لای خوای گەورە و وتی: پەروەردگارم هەندێکم هەندێکمی خوارد، ڕێگەم بدە هەناسە بدەم، خوای گەورەش ڕێگەی پێ دا دوو هەناسە بدات لە هەموو ساڵێکدا، هەناسەیەك لە زستاندا و هەناسەیەك لە هاویندا، ئەو ساردیەی لە زستاندا هەستی پێ دەکەن لە زەم هەریری دۆزەخەوەیە واتە: (هەناسە وەرگرتنی دۆزەخە) وە ئەو گەرمایەی لە هاویندا هەستی پێ دەکەن لە گەرمی دۆزەخەوەیە (واتە: هەناسە دانەوەی دۆزەخە).

دۆزەخ گەرمترین شوێنە چونکە ڕۆژو مانگی تێ فڕێ دەدرێت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((الشمس والقمر ثوران مكوران في النار يوم القيامة))[٨٠] واتە: (ڕۆژو مانگ دووگای کۆکراوەی ناو دۆزەخن لە ڕۆژی کۆتاییدا). ئاگری دۆزەخ ئەوەندە گەرمە گەر کامەرانترین کەسی سەر زەوی یەك جار تێ هەڵکێشرێت هەموو خۆشیەکانی دونیای لە بیر دەچێتەوە، وەك لە فەرموودەکەی ئەنەسدا ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((يؤتي يوم القيامة بانعم أهل الدنيا من الكفار فيقال اغمسوه في النار غمسة فيغمس فيها ثم يقال له: أي فلان هل اصابك نعيم قط فيقول: لا ماأصابني نعيمٌ قط))[٨١]. واتە: (لەڕۆژی قیامەتدا بەختەوەرترین بێ باوەڕی ئەهلی دونیا دەهێنرێت و دەوترێت: جارێك هەڵی کێشن لەدۆزەخ و یەك جار هەڵی دەکێشن پاشان پێی دەوترێت: ئەی فلان کەس لەژیانتدا خۆشیت بەخۆتەوە دیوە؟. دەڵێت: نەخێر هەرگیز لەژیانمدا خۆشیم بەخۆمەوە نەدیوە).

---

[٧٩] أخرجه: أحمد (٢/٢٣٢)، والبخاري (٣٢٦٠)، ومسلم (٦١٧)، والترمذي (٢٥٩٢)، وابن ماجة (٤٣١٩)، والنسائي(التفسير)(٦٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما واللفظ له ولابن حبان، والبيهقي (الكبرى)(١/٤٣٧)، وابن حبان (٧٤٦٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

[٨٠] أخرجه: الطحاوي (١/٦٦)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٢٤) اسناده صحيح على شرط البخاري.

[٨١] أخرجه: أحمد (١٢٦٩٩)، ابن ماجة (٤١٢١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٨٨) و (السلسلة الصحيحة)(١١٦٧).

**وە لە فەرموودەیەکی تریشدا لەسەر دەرخستنی گەرمی دۆزەخ هاتووە وەك فەرموودەکە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((ینصب الكافر يوم القيامة مقدار خمسين ألف سنة وأن الكافر يرى جهنم ويظن إنها مواقعته من مسيرة أربعين سنة))[82]. **واتە: (بێ باوەڕ ماوەی پەنجا هەزار ساڵ لە ڕۆژی کۆتاییدا ڕادەوە ستێنرێت و دۆزەخ دەبینێت و گومان دەبات کەوتبێتە ناوی لە دووری چل ساڵ).**

**ڕەنگی کڵپە و ئاگری دۆزەخ هەر دووکیان ڕەشن وەك سەلمان ﷺ دەفەرموێت:** ((النار سوداء مظلمة لايضيء جمرها ولايطفيء لهبها))[83]. **واتە: (ئاگری دۆزەخ ئاگرێکی ڕەشی تاریکە، پشکۆکانی ڕووناك نابنەوە، وەبڵێسەکانیشی کوژانەوەیان نی یە)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ((لايضيء لهبها ولاجمرها))[84]. **واتە: (بڵێسەکەی و پشکۆکەی ڕووناك نابنەوە)، وە ئەبو هورەیرە ﷺ فەرموویەتی:** ((أترونها حمراء كناركم هذه لهي أسود من القار))[85]. **واتە: (ئایا وادەزانن ئاگری دۆزەخ وەك ئەم ئاگرەتان سورە، نەخێر بەڵکو زۆر زۆر ڕەشترە لە قیر).**

**وەلە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((أتدرون مامثل ناركم هذه من نار جهنم؟ لهي أشد [سواداً] من دخان ناركم هذه بسبعين ضعفاً))[86]. **واتە: (ئایا وادەزانن ئەم ئاگرەتان وەك ئاگری دۆزەخە ، نەخێر ئاگری دۆزەخ زۆر ڕەشترە لەدوکەڵە ڕەشەکەی ئاگری دونیاتان بەحەفتا جار).**

---

(82) أخرجه: أحمد (٧٥/٣)، وأبو يعلى (١٣٨٥)، والحاكم (٥٩٧/٤) وصححه، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٣٦/١٠): رواه أحمد وأبويعلى واسناده حسن، وابن حبان (٧٣٥٢) وقال محققه: اسناده حسن.

(83) أخرجه: ابن أبي شيبه (٣٤٠٠٩)، والحاكم (٣٨٧/٢)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٩)، وهناد (الزهد) (٢٤٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

(84) أخرجه: الحاكم (٣٨٧/٢)، وصححه على شرطهما، ووافقه الذهبي، وابن مبارك في (زيادات الزهد) (ص: ٨٨).

(85) أخرجه: مالك (١٥٦/٣)، وقال الشيخ الألباني في(السلسلة الضعيفة) (٤٧٠/٣): اسناده صحيح على شرطهما.

(86) أخرجه: الطبراني (الأوسط) (٤٨٩) وقال الهيثمي(المجمع) (١٨٥٧٦): رواه الطبراني (الأوسط) ورجاله رجال الصحيح.

وە بەڵگەیەکی تریش لەسەر گەرمی دۆزەخ فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە ﷺ کە دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لوکان في هذا المسجد مائة الف أو يزيدون وفيهم رجل من أهل النار، فتنفس فأصابتهم نفسه لاحترق المسجد ومن فيه))[٨٧]. واتە: (گەر لەم مزگەوتەدا سەد هەزار کەسی تیابێت یان زیاتر وە لە ناویدا پیاوێکی دۆزەخی هەبێت و یەك هەناسەبدات و هەناسەکەی بەریانکەوێت هەرهەموویان دەسوتێنێت بە مزگەوتەکەشەوە). وە لەبەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەر ﷺ زۆر جار پەنای بە خوا دەگرت لە ئاگری دۆزەخ وەك لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اللهم أني أعوذبك من حرّ جهنم. ))[٨٨]. واتە: (. . . . خوای گەورە من پەنادەگرم بە تۆ لە گەرمایی و تینی دۆزەخ).

## جۆرەکانی سزای ناو دۆزەخ

خوای گەورە لەقورئاندا چەند جۆرێك لە جۆرەکانی سزای ناو دۆزەخی ڕوون کردۆتەوە کە ئەم جۆرانەی لای خوارەوەن:

١- برژاندنی پێست:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ (النساء: ٥٦). ئیمامی طەبری دەفەرموێت: " أي يشوون فيها كلما أنشوت بها جلودهم فاحترقت (بدلّناهم جلوداً غيرها)" [٨٩]. واتە: (دەبرژێنرێت وهەر کات تەواو برژان بە پێستەکانیانەوە دیسان پێستەکانیان بۆ دەگۆڕین تا زیاتر ئەنشکەنجە و سزا بدرێت). وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴾ (المعارج: ١٦)، ئیمامی قورتوبی (رحمه الله) لە ڕافەی ئەم ئایەتەدا

---

[٨٧] أخرجه: البزار (٣٤٩٩)، وأبو يعلى(٦٦٧٠)، وانظر أيضاً (الحلية) (٣٠٧/٤)، و(صفة النار) لابن أبي الدنيا (١٤٦)، و(العلل المتناهية) لابن الجوزي (٤٥٤/٢)، وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٥٣٦٧) اسناده حسن، وحسنه اسناده أيضاً البوصيري في (إتحاف الخيرة المهرة) (١٠١٤٨)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥٠٩) و(صحيح الترغيب) (٣٦٦٨).

[٨٨] أخرجه: النسائي (٢٧٨/٧) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٥٠٩٣).

[٨٩] اخرجه: الطبري (جامع البيان)(٤/ ١٩٧).

**دەفـەرموێت:** " والشوى: جمع شواة وهي جلدة الرأس "[٩٠] **واتـە: (پێستی سـەریان دادەماڵێـت). وە ئیمـامی موجاهیـد** (رحمه الله) **دەفـەرموێت:** "الشوي: الاطراف: اليدان و الرجلان والرأس " [٩١]. **واتە: (داماڵەری هەموو پێستەکانی هەردوو قاچ و هەر دوو دەست و سەریەتی).**

**٢- تواندنەوە و داماڵینی ناوسك:**

**خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** ﴿ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴾ (الحج: ٢٠). **ئیمـامی موجاهیـد** (رحمه الله) **دەفـەرموێت:** (يذاب به إذابة)[٩٢]. **واتـە: (ئـاوی کـوڵاوی زۆرگـەرمی دۆزەخ دەکرێت بەقورگیاندا و هەموو پێست و ناوسکیان دەتوێنێتەوە).**

**وە هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((إنَّ الحميم ليُصَبُّ على رؤوسهم فَيَنفُذُ الحميمُ حتى يَخْلُصَ إلى جوفهِ فَيَسلُتُ مافي جوفهِ حتى يَمْرُق من قدميهِ وهو الصِهرُ ثُم يُعادُ كماكان))[٩٣]. **واتە: (ئاوی زۆر بەکوڵ دەکرێت بەسەریاندا و پێستەکانیان دەبرێت تا دەگاتە ناوسکیان پاشان هەموو ناو سکیان دەتوێنێتەوە دای دەماڵێت و دەردەچێت لە هەر دوو قاچیانەوە ئەوەش تواندنەوە و داماڵینەوەیە و پاشان بەو جۆرەیان لێ دەکرێتەوە بە بەردەوامی).**

**٣-ئاگر و مسی تواوەیان بەسەردا دەکرێت:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴾ (الدخان: ٤٨) **واتـە: (پاشان سزای ئاوی زۆر گەرمیان بەسەر سەردا برێژن). وە لە ئایـەتێکی تـردا خـوای گـەورە دەفـــەرموێت:** ﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴾ (الـرحمن: ٣٥) **ئیمـــامی**

---

[٩٠] أخرجه: القرطبي (الجامع أحكام القرآن) (١٨/ ٢٥٠).

[٩١] أورده: ابن أبي شبة (المصنف) رقم (٣٤١٥٩)، والبغوي (شرح السنة) (١٥/ ٢٣٦).

[٩٢] أخرجه: الطبري (١٠١/١٧).

[٩٣] أخرجه: الترمذي (٢٥٨٢)، والحاكم (٣٨٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن المبارك (الزهد) (٣١٢)، و الطبري (٢٤٩٩٢)، وأحمد (٣٧٤/٢) (٨٨٦٤) وقال محققه: إسناده ضعيف، وصححه أخيراً الشيخ الألباني في (الصحيحة)(٣٤٧٠)، و (وصحيح الترغيب) (٣٦٧٩)ب عد ان ضعفه في (ضعيف الترمذي) (٤٧٦)، و(ضعيف الجامع) (١٤٣٣).

موجاهید (رحمه الله) دەفەرموێت: "الشواظُ: القطعةُ مِن النار ، و[نحاسٌ]: هي صِفرٌ يُذاب ثُم يُصب على رؤوسهم"[٩٤]. واتە: (پارچە ئاگر ومسی تواوەی گراویان بەسەر سەردا دەرێژرێت).

٤-ڕوخساریان ڕەش دەبێت و دەبرژێت و لەسەری ڕادەکێشرێت:

جۆرێکی تری سزاکانی دۆزەخ ڕاکێشانە لەسەردەم و چاو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴾(القمر: ٤٧-٤٨) واتە: (تاوان باران لە گومڕای و سزادان، ڕۆژێك دێت ڕادەکێشرێن بەسەر دەم و چاویاندا پێیان دەوترێت: بچێژن سزای سەقەر). پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردوەتەوە کە یەکەم کۆمەڵ دەخرێنە ناو دۆزەخ سێ کەسن و لە فەرموودەکەدا دەفەرموێت: ((...ثُم أُمِرَ به فَسُحِب على وجهه حتى أُلقي في النار...))[٩٥] واتە: (پاشان فەرمانی پێ دەکرێت و ڕادەکێشرێت لەسەر ڕووی تافرێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە). پاشان دوومیان و پاشان سێ هەمیان.

وە لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾ (غافر: ٧١-٧٢)، واتە: (تاوانباران کاتێك کۆت دەکرێتە گەردنیان و بەزنجیر ڕادەکێشرێن بە ناو ئاوی زۆر بەکوڵدا پاشان لە ئاگردا دەسوتێنرێن). قەتادە (رحمه الله) دەفەرموێت: (" يُسحَبون في النار مرّة وفي الحميم مرّة". واتە: "ئەوانە جارێك بەئاگردا ڕادەکێشرێن وجارێك بەناو ئاوی کوڵاودا ڕادەکێشرێن".

ئیمامی عەباس ﷺ دەفەرموێت: " ينسلخُ كُلُ شيء عليه من جلدِ ولحمٍ وعُروق وأعصاب، حتى يصير في عقبيه جسدٌ من لحمه مثل طوله ثم يكسَى جلداً أخر ثم

---

[٩٤] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار)(١٣٠)، وهناد (الزهد) (٢٧٠، ٢٧١) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٥] أخرجه: مسلم (١٩٠٥)، والترمذي (٢٣٨٢)، والنسائي(٦/٢٣).

يُسجر في الحميم"). [٩٦] واتـە: (ڕادەكێشرێت و پێست و گۆشت و ڕەنـگ و دەمارەکان و هەموو ئەوانە دادەماڵرێن، هەموو جەستەی بە وێنەی درێژی خۆی بە پاژنەی قاچیەوە دەمێنێتـەوە و ڕادەكێشرێت تـا نامێنێت، پاشان پێست و جەستەیەکی تـری بـە بـەردا دەکرێت و لە ئاوی زۆر بە کوڵی گەرمدا هەڵدەكێشرێت و پاشان ڕادەكێشرێتەوە دووبارە).

وە هـەروەها ڕووی دۆزەخیـەکان بـەردەوام دەبرژێت و دووبـارە دەبێتـەوە خـوای گـەورە دەفـــەرموێت: ﴿ . . . . . . وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴾ (الكهف: ٢٩) واتـە: (تاوانبـاران لـە تونێتیـدا هاواردەکـەن، ئـاوێکی زۆر بـەکوڵی گـەرم وەك مسی تواوەیـان دەدرێتێـت کـە دەم و چـاو ڕوویـان دەبرژێنێت، ئـەوە خراپترین خواردنەوەیە وە ئەو جێگەش خراپترین جێگەیـە). وە لـە ئایـەتێکی تـردا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠٤). واتـە: (دەم و چاو ڕوویان دەبرژێنێت و قێزەونی دەكات).

ئیبنو مەسعود رضي الله عنه لە مانای ئـەو ئایەتـە پیرۆزەدا: ﴿ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ دەفـەرموێت: "ككلـوح (أي: قـبُح وعبوسـة) الـرأس المشـيط بالنـار قـد بَـدَتْ أسـنانُهم وتَقَلَّعـت شفاهِهم"[٩٧]. واتـە: (وەك قێزەونـی و ناشـرینی سـەرێکی بـرژاو بـەئاگرن کـە لێویـان سوتێنراوە و دانەکانیان دەرکەوتووە).

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ (الزمر: ٢٤)، واتە: (ئەو کەسە دەبێت حاڵی چۆن بێت لە ناچاریدا کە بەڕووخساری و دەم و چاوی بەرگری لە ئاگر وسزا و ئەشکەنجەی زۆر خراپی ڕۆژی کۆتای دەکات وە بەستەمکاران دەوترێت: بچێژن بەرهەمی کارە خراپەکانتان) ، وەلەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (الأنبياء: ٣٩).

---

[٩٦] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (١١١)، والحاكم (٢/٤٩٥)، وهناد (الزهد) (٣٠٣) وقال محققه: رجاله ثقات، وأنظر (التخويف) (ص: ١٥٠).

[٩٧] أخرجه: الطبري (التفسير) (١٨/٤٣)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (١١٤، ١١٣)، وابن المبارك الزوائد (ص: ٨٤).

واتە: (ئەو ڕۆژە دێت کە ئاگر دەم وچاو و پشتیان بەرنادات و لێیان جیا نابێتەوە و هەردەیان سوتێنێت). وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ (الأحزاب: ٦٦). واتە: (ئەو بێ باوەڕانە ڕۆژێك دێت لە ئاگری دۆزەخدا ڕوخساریان هەڵدەسوڕێنرێت و دەڵێن: خۆزگە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر دەبووین). ئەوانە ڕوویان ڕەش دەکرێت و هەردەم ڕوو ڕەش دەبن ڕوویان وەك پارچە شەوی تاریکی لێ دێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ (ال عمران: ١٠٦).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (يونس: ٢٧). ئەوانەش کە ڕوویان ڕەش دەبێت بێ باوەڕان و هاوتا بۆ خوابڕیاردەران و دووڕووەکانن لەگەڵ هەندێك لە زیادەڕەو و بیدعەچیەکان).

عەبدوڵای کوڕی عباس ﷺ دەفەرموێت: "تسوَدُّ وجوه أهل البدعة والفرقة "[٩٨]. واتە: (ڕووی بیدعەچیەکان و کۆمەڵە داهێنراوە سەرلێ شێواو لادەرەکان ڕەش دەکرێت).

ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس (رحمه الله) دەفەرموێت:. "ما أية في كتاب الله أشدُّ على أهل الأهواء من هذه الأية ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٦) "[٩٩]. واتە: (هیچ ئایەتێك نی یە لە قورئاندا توندتر وسەخت تر بێت لای کۆمەڵانی حەز ئارەزووە داهێنراوەکان وەك ئەم ئایە پیرۆزە ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾.

ئاگری دۆزەخ جێگە و شوێنەواری سوجدەبردنی موسوڵمانان ناسوتێنێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . تأكل النار من ابن آدم إلاّ أثر السجود حرَّم اللهُ على النار أن

---

(٩٨) أخرجه: اللالكائي (٧٤)، وانظر (الدّرالمنثور) (٦٣/٢) للسيوطي، و(تفسير القرآن العظيم) لإبن كثير(٥٥٤/١).

(٩٩) أخرجه: أبو نعيم (الحلية) (٣١٦/٦)، والاصبهاني (سير السلف) (١٠٤٥/٣).

تأكل أثر السجود. . . ))[١٠٠]. واتە: (ئاگر هەموو جێگەیەکی ئادەمی دەسوتێنێت وە دەخوات تەنها جێگەکانی سوجدە بردن ناسوتێنێت چونکە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەسەر ئاگری دۆزەخ ئەوشوێنانە بسوتێنێت).

**٥- ئاگر لە هەر چوار لاوە دەیانگرێت و دەیان سوتێنێت:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (التوبة: ٤٩) واتە: (. . . . . دۆزەخ چوار دەوری بێ باوەڕان دەدات). وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (العنكبوت: ٥٥) واتە: (ڕۆژێك دێت سزا و ئاگری دۆزەخ دەیانگرێتەوە لەسەرەوە یان لە ژێر هەردوو قاچیانەوە و پێیان دەوترێت: سزای کارە خراپەکانتان بچێژن). وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴾ (الزمر: ١٦). واتە: (لەسەریانەوە پارچە ئاگرەکانیان بەسەردا دەبارێت وە هەروەها لە ژێریشیانەوە، ئەوە ئەو سزایە کە خوای گەورە بەندەکانی پێ دەترسێنێت و دەفەرموێت: بەندەکانم خۆتان بپارێزن).

**٦-داخ کردنی ناوچەوان وپشت و هەردوو لاتەنیشت:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة: ٣٥) واتە: (ئەوانەی ئاڵتون وزیو کەڵکە دەکەن و لەپێناوی خوادا سەرفی ناکەن مژدەیان بەرێ (ئەی محمد) بەڕۆژێك دەبێت ئەو پارەو سامانەی کۆیان کردۆتەوە، لە دۆزەخدا گەرم دەکرێت پاشان نەوچوان و پشت ولاتەنیشتەکانیان پێ داخ دەکرێت وپێیان دەوترێت: ئەوە سامانەکەی ئێوە بوو بچێژن سودی سامانەکانتان ئەمڕۆ).

---

[١٠٠] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣، ٧٤٣٨)، ومسلم (٢٩٩).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مامن رجلٍ لایؤدي زکاة مالِهِ إلاّ جُعِلَ یوم القیامة صفائح من النار یُکوی بها جنْبُه وجبهتهُ وظهرُهُ. . . ))[١٠١]. واتە: (هەرکەسێك زەکاتی پارەکەی نەدات لە ڕۆژی کۆتاییدا هەمووی بۆی دەخرێت پارچە لەوح و ناچەوان ولاتەنیشت و پشتی پێ داخ دەکرێت).

عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: ((. . . یوسع جلده فیوضع کل دینار و درهم علی حدته))[١٠٢]. واتە: (پیستی ئەو تاوانبارە فراوان دەکرێت تا هەموو دینار و درهەمێکی بەجیا لەسەر پێستی بۆ دادەنرێت و پێی داخ دەکرێت).

**٧-بزمار داکوتان بە چاو وگوێ دا و هەڵواسین بە پاژنەی پێ:**

ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((بیْنا أنا نائمٌ إذا أتاني رجلان فاخذا بضعبيَّ فأتیا بي جبلاً وعِراً، فقالا لي: إصعد حتی إذا کنتُ في سواء الجبل فإذا أنا بإصواتٍ شدیدةٍ، فقلتُ: ماهذه الأصوات؟ قال: عواء أهل النار، ثم انطلق بي، فإذا أنا بقوم معلّقین بعراقیبهم مُشقَقةٌ أشداقهم تسیل أشداقهم دماً [مصوبة رؤوسهم یلحسن من ماء قلیلٍ وحَمأ ] فَقلتُ: من هؤلاء؟ فقیل: هؤلاء الذین یفطرون قبل تحِلة صومهم. . . . ثم انطلق بي فإذا[ نحن بنساءٍ معلقات بعراقیبهِنَّ مصوبةٌ رؤوسُهُنَّ تنهشُ ثداهُنَ الحیات، فقلت: ماهؤلاء ]؟ قیل: هؤلء اللاتي یَمْنَعَنَ أولادُهنَّ البانَهُنَّ [ ثم إنطلقنا فإذا نحن برجال ونساءٍ مُسمّرةٌ أعیُنُهم و آذانهم فقلت: ماهؤلاء؟ قال: هؤلاء الذین یَرُون أعیُنَهم مالایرون ویسمعون آذانهم مالایسمعون. . . ]))[١٠٣]. واتە: (پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لەکاتێکدا من نوستبووم لەخەومدا دوو کەس هاتن ئەم لاو

---

[١٠١] أخرجه: أحمد (٧٧٢٠) واللفظ له، ومسلم (٩٨٧)، والنسائي (٥/٢٣).

[١٠٢] أخرجه: الطبري (التفسیر) رقم (١٢٩٦٠).

[١٠٣] أخرجه : ابن خزیمة (١٩٨٦) وقال محققه: اسناده صحیح، والنسائي (الکبری)(٣٢٨٦)، والطبراني (الکبیر) (٧٦٦٦-٧٦٦٧) وللفظ له، والحاکم (٤٣٠/١) وصححه علی شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبیهقي (٢١٦/٤)، وابن حبان (٧٤٩١) وقال محققه: اسناده صحیح، وجَوّدَ اسناده الحافظ في (الفتح) (٥٤٥/١٢)، وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الترغیب)(٩٩٥)

لایان گرتم و بردمیان بەرەو شاخێکی یەکجار هەڵدێر و بەرز و پێیان وتم: سەرکەوە، هەتا گەیشتمە ناوەڕاستی شاخەکە لەوێدا گوێم لەدەنگە دەنگێکی بەهێزو گەورە بوو، وتم: ئەو دەنگانە چی یە؟ وتیان: ئەو دەنگانە لورە لوری دۆزەخیەکانن پاشان بردمیان تاگەیشتینە کەسانێك بە پاژنەی پێیان هەڵواسرابوون سەربەرەو خوار لێویان شەق شەق بوو وە خوێنی لێ دەتکا وزمانیان درێژ دەکرد بۆ لێسانەوەی قوڕاوێکی ڕەش لەبەردەمیاندا وتم: ئەوانە کێن؟ وتیان: ئەوانە ئەوکەسانەن کەڕۆژوەکەیان دەشکێنن پێش کاتی ڕۆژوشکاندن، پاشان تا گەیشتینە لای ئافرەتانێك بە پاژنەی پێیان هەڵواسرابوون سەر بەرەو خوار کرابوون و مارەکان مەمکیان دەگەستن، وتم: ئەوانە کێن؟ وتیان: ئەوانە ئەو ئافرەتانەن کەشیرنادەن بەکۆرپەکانیان و بێ بەشیان دەکەن لە شیرەکانیان، پاشان تێپەڕ بووین تا گەیشتینە، لای پیاوانێك و ئافرەتانێك مێخ و بزمار داکوترابوو بەگوێچکە و چاوەکانیاندا وتم: ئەوانە کێن؟ وتیان: ئەوانە ئەوکەسانەن کە درۆ بە ناو چاو وگوێیان دەکەن.و ئەوەی نەیان بینیوە دەڵێن: بینومانە و ئەوەش نەیان بیستوە دەڵێن: بیستومانە).

## ٨-ئاو ساندنی جەستەیان و بۆگەنی و ناشرینی شێوەیان و لورە و دەنگی ناخۆشیان:

هەندێك جۆری تر سزای ناو دۆزەخ ئاوسانی جەستەیان یاخود بۆنی ناخۆشیان وناشیرین کردنی جەستە و شێوەیانە لەگەڵ هاوار و لورەو دەنگی ناخۆشیانە. وەك لە فەرموودەکەی ئەبو ئومامە ﵁ داهاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . ثم إنطلقنا فإذا نحنُ برجالٍ ونساءٍ اشدُ شيءٍ إنتفاخاً [ وأقبح شيءٍ منظراً وأقبحه لبوساً وانتنهُ ريحاً كأنما [ريحهُم] المراحيضُ ] قلت: ماهؤلاء؟ قال: هؤلاء الزانون [والزواني ]ثم انطلقنا فإذا نحن بموتى أشدُّ شيءٍ إنتفاخاً وأنتنهِ ريحاً، قلتُ: ماهؤلاء؟ قال: هؤلاء موتى الكُفّار، ثم انطلقنا وإذا نحن نرى دخاناً ونسمع عواء قلت: ماهذا؟ قال: [هذا عواءُ أهل النار])[١٠٤]. واتە: (. . . . پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە پیاوان و ئافرەتانێك ئاوساوترین کەس بوون وە ناشرینترین شێوە و دیمەنیان هەبووە وە بۆگەنترین بۆنیان هەبوو، بۆنیان دەت وت بۆنی زێرابەکانە، وتم: ئەوانە کێن؟. وتی: ئەوانە ئافرەت و پیاوە زیناکارەکان،

---

[١٠٤] نفس المصدر.

پاشان ڕۆیشتن تا گیشتینە کۆمەڵێك مردوو ئاوساوترین کەس بوون وە بۆگەنترین بۆنیان هەبوو. وتم ئەوانەکێن؟ وتی: ئەوانە مردووەکانی بێ باوەڕانن، پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتنە جێگەیەك دەنگە دەنگ و لورەیەکی زۆرمان بیست ودووکەڵێکی زۆرمان بینی. وتم ئەوە چیە؟ وتی: ئەوە هاوار ولورە و دەنگی دۆزەخیەکانە).

وەهەروەها عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرمویێت: ((لو أن رجلاً من اهل النار أخرج الى الدنيا لمات أهلُ الدنيا من وحشةِ منظره و نتن ريحه))[١٠٥]. واتە: (گەر پیاوێکی دۆزەخی بێتەدەر بۆ دونیا هەموو سەر زەوی دەمرن لە ناشرینی شێوەکەی و ناخۆشی بۆگەنەکەی). کەواتە زیاد لەمانەی باس کرا دۆزەخیەکان دەبنە ئازارو ناڕەحەتی بۆیەکتر بەهۆی بۆگەنی جەستە ومیز و پاشەڕۆیان، لەگەڵ بۆگەنی عەرەق و بۆن کرۆزی سوتاویان، و بۆگەنی خواردن و خواردنەوەیان.

لە ڕیوایەتێکی تردا شەفی کوڕی ماتعی کوڕی ئەصبەحی ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أربعة يؤذون أهل النار على مابهم من الأذى، يسعون بين الجحيم و الحميم، يدعون بالويل و الثبور، ويقول أهل النار: ما بال هؤلاء فقد آذونا على مابنا من الأذى؟ ! فرجل مغلق عليه تابوت من جمر، و رجل يجر أمعاءه، ورجل يسيل فوه دمًا وقيحًا، ورجل ياكل لحمه)) قال: ((فيقال لصاحب التابوت: مابال الأبعد و قد آذانا على مابنا من الأذى؟!))، قال: فيقول: إني مت وفي عنقي أموال الناس لانجد لها أداء، ويقال للذي يجر أمعاءة: ما بال الأبعد وقد آذانا على ما بنا من الأذى؟!))، قال: ((فيقول: إن الأبعد كان لا يبالي أين اصحاب البول منه ثم لايغسله، ويقال الذي يسيل فوه قيحًا ودمًا: ما بال الأبعد و قد آذانا على مابنا من الأذى؟ !)) قال: ((فيقول: إن الأبعد كان ينظر إلى كل كلمة قذعة قبيحة فيستلذها كما يستلذ الرفث، ويقال للذي كان يأكل لحمه: ما بال الأبعد وقد آذانا على ما بنا من الأذى؟! فيقول: إن الأبعد كان يمشي النميمة و يأكل لحوم الناس))[١٠٦]. واتە: (چوار جۆر لە دۆزەخیەکان خەڵکانی تری ناو دۆزەخ

---

[١٠٥] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٢٢). وفي (الرقة و البكاء)(١٠٤).

[١٠٦] أخرجه: هناد (الزهد) (١٢١٧) وقال محققه: اسناده صحيح رجاله ثقات.

ئازارد دەدەن هەر چەندە خۆیان لە ئازار و نارەحەتیدان، ئەو چوارە ڕادەکەن لە نێوان ئاگر و ئاوە بەگوڵەکاندا وە شین و هاواری لە ناوچوونی خۆیان دەکەن. دۆزەخیەکان دەڵێن: ئەوانە گێن سزا و ئازاریان زیادکردین هەرچەند خۆمان لە ئازار و سزادایین.

ئەوانە یەکێکیان لە تابوتێکی پشکۆی داخراو دایە، و یەکێکی تریان ڕیخۆڵەکانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت، وەیەکێکی تریان خوێن و کێم و زوخاو لە دەمی دەڕژێت، وە یەکێکی تریان گۆشتی خۆی دەخوات.

یەکەم جار سەبارەت بەوەی لەتابوتەکەدایە دەڵێن: ئەو کەسە ئەولاتر چووە چیەتی ئازاری داین هەر چەند خۆمان لە ئازاردایین؟ ! ئەو کەسەش دەڵێت: من مردم و پارەی خەڵکی قەرزار بووم و هیچم جێ نەهێشت بۆ دانەوەی.

پاشان بەوەی کەڕیخۆڵەی بەدوای خۆیدا ڕا دەکێشێت دەڵێن: ئەو کەسە ئەولاتر چووە چیەتی ئازاری داین هەر چەند خۆمان لە ئازاردایین؟! ئەو کەسەش دەڵێت: منی ئەولاتر چوو میز بەر هەر شوێنێکم بکەوتایە گوێم نەئەدایە و نەم دەشۆرد.

پاشان ئەوەی خوێن کێم و جەڕاعەت لە دەمی دەڕژێت دەڵێن: ئەو کەسە ئەو لاتر چووە چیەتی ئازاری داین هەر چەند خۆمان لە ئازاردایین؟ ! ئەو کەسەش دەڵێت: منی ئەو لاتر چوو هەموو وشەیەکی قێزەونم دەوت و زۆر بەلامەوە خۆش و بەتام بوو.

پاشان بەوە کە گۆشتی خۆی دەخوات دەوترێت ئەو کەسە ئەولاتر چووە چیەتی ئازاری داین هەر چەند خۆمان لە ئازاردایین؟ ! ئەو کەسەش دەڵێت: منی ئەولاتر چوو لە پاشەملە (غیبەت) و باسی خەڵکیم دەکردوو، و دووزمانیم لە نێوانیاندا دەکرد).

**٩- زمان بڕین و لێکردنەوەی هەر دوولێو:**

یەکێکی تر لە سزاکان بڕینی زمان ولێ کردنەوەی لێوە وەك لە فەرموودەکەی ئەنەس ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((رأيت ليلة أُسري بي رجالا [ تُقطعُ إلسنتهُم وشفاهمُ بمقاريض من نار ]، فقلت: ياجبريل من هؤلاء؟ فقال خُطباءٌ من أمتك [يأمرون الناس بالبر وينسون أنفسهم وهم يتلون الكتابُ أفلا يعقلون ])) (١٠٧) واتە: (لەشەو

(١٠٧) أخرجه: أحمد (١٢٢١١) وقال محققه الأرناؤوط: حديث صحيح ، وابن أبي شيبة (٣٠٨/١٤) وابن حبان (٥٣) وقال محققه : صحيح ، وأخرجه: ابو يعلى (٤٠٦٩)، والبيهقي (الشعب)(٤٩٦٥) وقال محقق المسند (٢٤٤/١٩):

ڕەویەکەمدا پیاوانێکم بینی زمان و لێویان دەبڕین بە مقاشی ئاگرین. وتم: جبریل ئەوانە کێن؟ وتی ئەوانە هەندێك وتار بێژی ئومەتی تۆن بەخەڵکی دەڵێن چاکە بکەن و خۆیان لە بیری دەکەن، ئەوانە کتێبەکەی خوایان دەخوێندەوە ئایا تێی نەدەگەشتن؟).

**١٠- دەم و چاو وسنگ ڕنینەوە:**

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لِمّا عُرِجَ بي مررتُ بقومٍ لهم أظفارٌ من نحاس يخمشون وجوههم وصدورهم، فقلت: من هؤلاء يا جبريل؟ قال: هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس و يقعون في أعراضِهم))[١٠٨]. واتە: (کاتێ بەرز کرامەوە بۆ ئاسمان تێپەڕیم بەلای کەسانێك دا نینۆکەکانیان مس بوو دەم وچاو وسنگیان پێ دەڕنیەوە و خەڵتانی خوێنیان دەکرد، وتم ئەی جریل ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی برایانی خۆیان دەخۆن و لەپاشەملە باسیان بەخراپە دەکەن).

**١١- پیاکێشان بەچەکوش:**

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴾ (الحج: ٢١)، قـال الضـحاك: "المقامع: المطارق" [١٠٩]. واتە: (بە چەکوژی ئاسن بە سەریاندا دەکێشرێت). بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((. . . ثم يُقيضُ له أعمى أصم أبكم في يده مرزبة لو ضُرِبَ بها جَبَلٌ كان تراباً فيضربهُ ضربةً حتى يصير تراباً ثم يعيدهُ الله كما كان. . . )). واتە: (پاشان کەسێکی کوێری کەڕی لاڵی بۆ تەرخان دەکرێت گورزێکی بە دەستەوەیە گەر بکێشرێت بە چیایەکدا دەیکاتە تۆز، لەوێدا یەك گورزی لێ دەدات تا دەبێتە تۆز پاشان خوای گەورە وەك یەکەم جاری لێ دەکاتەوە)). وەلەڕیوایەتێکی

---

والأسنادان صحيحان، وصححه كل من الشيخ مقبل في: (الصحيح المسند) (٨٤)، والشيخ الألباني في (الصحيحة)(٢٩١)و(صحيح الترغيب)(٢١٨).

[١٠٨] أخرجه: أحمد (٣/٢٢٤)،وأبوداود (٤٨٧٨)، والبيهقي (الشعب)(٦٧١٦)، وصححه كلٌ من الحافظ العراقي في (الأحياء)(٣/١٣٩)، والشيخ الألباني(الصحيحه)(٥٣٣)، و(صحيح أبي داود)(٤٠٨٢)،و(فقه السيرة)(ص: ١٤٤)، والشيخ الأرناؤوط في (تخريج رياض الصالحين) (ص: ٥٧٤) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٣١) .

[١٠٩] أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (٣٤١٥٢)، وانظر: تفسير القرطبي (١٢/ ٢٨).

تـــردا پێغەمبـــەر ﷺ دەفـــەرموێت: ((. . . ثم يُضربُ بمطرقةٍ من حديد ضربة بين أذنيه...))[١١٠]. واتە: (پاشان یەك چەکوشی ئاسن دەکێشرێت بە نێوان هەر دوو گوێ و سەریدا. . ). وە لەڕیوایەتێکی (لاواز) داهاتووە ((لو ضُرِبَ بمقمع من حديد جهنم الجبل لتفتتَ، كما يَضرب به أهل النار فصار رماداً))[١١١]. واتە: (گەر گورزێکی ئاسنی دۆزەخ بکێشرێت بە شاخێکدا کەرت و پەرتی دەکات وەك چۆن دەدرێت لە دۆزەخیەکانی و و دەیانکاتە خۆڵەمێش).

عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ ئەو گورزانەی بینی لە خەوەکەیدا کە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: ((...فانطلقوا بي حتى وقفوا بي على شفير جهنم، فإذا هي مطويةٌ كطيّ البئر لها قرون كقرون البئر بين كل قرّنين ملك بيده مقمعةٌ من حديد...))[١١٢]. واتە: (بردمیان تا ڕایان وەستانم لەسەر قەراغی دۆزەخ بینیم خوارەوە قوڵ و تاریکبوو وەك بیر و چەندەها دوو لەپ لە چوار دەوری هەبوون. و لە نێوان هەموو دوو لەپێکدا فریشتەیەك وەستا بوو وە گورزێکی ئاسنی بە دەستەوە بوو).

حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت " إنّ النار تصهرهم بلهبها فترفعهم حتى إذا كانوا في أعلاها ضربوا بمقامع فهووا سبعين خريفاً "[١١٣]. واتە: (ئاگری دۆزەخ بەگرەکەی دەیان توێنێتەوە و بەرزیان دەکاتەوە تا دەگەنە سەرەوەی لەوێدا بەگورز لێیان دەدرێت و دەخرێنە خوارەوە ماوەی حەفتا پایز).

فضلی کوڕی عیاض (رحمه الله) لە ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾ (الحج: ٢٢) قال: "والله ماطمعوا في الخروج، إنّ الأرجل لمقيّدة، وإنّ الأيدي لمؤثّقةَ، ولكن يرفعُهم لهبها

---

[١١٠] أخرجه: أحمد (٤/ ٢٩٧)، أبوداود (٤٧٥٣)، والنسائي (٤/٨) وصححه الشيخ الألباني في (احكام الجنائز) (ص: ٢٠٢) و(صحيح الجامع) (١٦٧٥).

[١١١] أخرجه: أحمد (١١٧٨٦) وقال محققه: اسناد ضعيف، والحاكم (٤/٦٠١) وصححه ووافقه الذهبي واللفظ له، والبيهقي (البعث)(٥٣٧)، وأبو يعلى (١٧٨٧، ١٣٧٨)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع)(٤٨٠٩).

[١١٢] أخرجه: البخاري (٤٤٠، ١١٢١)، ومسلم (٢٤٧٨-٢٤٧٩).

[١١٣] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٧١)، وابن المبارك (الزهد)(٣٣٩).

وتردِهمْ مقامِعُها "(١١٤). واتە: (سوێند بە خوا دۆزەخیەکان بە هیوای خۆدەرکردن نین لە دۆزەخ ئەوان قاچیان زنجیرکراوە و دەستیان بەسراوە بەڵام گڕی دۆزەخ بەرزیان دەکاتەوە و گورزەکانیش دەیان خاتەوە خوارێ).

**١٢-لغاوی ئاگر دەکرێتە دەمیان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مَن سُئِلَ عن علمٍ يَعلمُهُ فكتَمَهُ أُلجِمَ يومَ القيامةِ بلجامٍ مِن نارٍ))(١١٥). واتە: (هەرکەسێك پرسیارێکی لە زانیاریەك لێ بکرێت کە دەیزانێت و بیشارێتەوە ئەو کەسە لغاوێکی ئاگری لەدەم دەکرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من قال في القرآن بغير علمٍ جاء يوم القيامة ملجماً بلجامٍ من نارٍ))(١١٦). واتە: (هەر کەسێك مانایەك لێك بداتەوە لە قورئاندا بە نەشارەزایی لە ڕۆژی کۆتاییدا دێت و لغاوێکی ئاگری لەدەم دایە).

**١٣- پێوەدان و گەستنی مار و دووپشك و مێش و مەگەز:**

عبدوڵای کوڕی حارسی زوبیدی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ في النار لحيّاتٌ كأمثال أعناق البُخت (والبختُ: جملٌ طويلُ وعظيمٌ عُنقهُ) تلسع إحداهُنَّ اللسعة فيجد حموتها (أي: حرّها وألمها) أربعين خريفاً وفي رواية [سبعين خريفاً] وإن في النار عقاربٌ كأمثال البغال المؤكَفَةِ (أي: القوية السمينة التي وضِع عليها إكافها] تلسع إحداهُنَّ اللسعة فيجد حمّوتها أربعين خريفاً))(١١٧) واتە: (لە دۆزەخدا ماری وا هەیە وەك ملی وشترە گەورەکان، یەکێك لەوانە کە بەدۆزەخییەکەوە دەدات ئازارەکەی چل

---

(١١٤) أنظر: (التخويف من النار)لأبن رجب (ص: ١٥٢).

(١١٥) أخرجه: أحمد (٢/٢٦٣)، أبوداود (٣٦٥٨)، والترمذي (٢٦٤٩)، وابن ماجة (٢٢٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(٢١٣)، و(المشكاة)(٢٢٣).

(١١٦) أخرجه: ابو يعلى (٢٥٨٥)، وصححه الحافظ في (المطالب)(٣٠٦٣)، والبوصيرى (مختصر الأتحاف)(٤٢٨).

(١١٧) أخرجه: أحمد (٤/ ١٩١)، والحاكم (٤/٥٩٣)وصححه ووافقه الذهبي، و البيهقي(البعث) (٦١٦، ٢٩٨، ٥٦١)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٩٢)، وابن حبان (٧٤٧١) وقال محققه: اسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في: (الصحيحة) (٣٤٢٩)، (وصحيح الترغيب)(٣٦٧٦).

سالْ یاخود [حەفتا پایز] بەردەوام دەبێت، وەهەروەها لە دۆزەخدا دووپشك هەیە وەك هێسترە قەڵەوە گەورەکانە یەکێك لەوانەی کە بەدۆزەخییەکەوە دەدات ئازاری پێوەدانەکەی چل سالْ بەردەوام دەبێت).

بەرائی کوڕی عازب ﷺ سەبارەت بە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت ﴿ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ ﴾ (النحل: ٨٨)، قال: "عقارب أمثال النخل الطِوال ينهشونهم في جهنم"[118]. واتە: (سزای زیادکراو بۆیان بریتیە لە دووپشکی گەورە بە نموونەی دار خورما درێژەکان قەپیان لێ دەگرن و دەیان گەزن لە دۆزەخدا).

عەبدولای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت:" زيدوا عقارب [أدناها] إنيابُها كالنَّخل الطِوال "[119]. واتە: (دۆزەخیەکان سزایان بۆ زیاد دەکرێت کە بریتیە لە دووپشکەکانی ناو دۆزەخ بچووکترینی ئەو دووپشکانە کەڵبەکەی وەك دارخورما درێژەکانە).

ئیمامی موجاهید(رحمه الله) (لە یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی یزیدی کوڕی شەجەرەیە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ لِجهنَّم لجُباباً، في كل جُبٍّ ساحلاً كساحل البحر فيه هوامٌ وحيّاتٌ (كامثال) البُخاتي، وعقارِبٌ [كأمثال]البغال الدُّلم (أي: شيء أسود يشبه الحية]، فإذا سأل أهلُ النّار التخفيف قيل: اخرجوا إلى الساحل، [فيفرُّ أهل النار من النار إلى تلك الجباب فتستقبلهم الحيّات و العقارب]فتأخذهم تلك الهوام بشفاههم وجنوبِهم وماشاء الله من ذلك، فتكشُطها، [فما يستغيثون إلاّ بالرجوع إلى النار] فيرجعون فيبادرونَ إلى معظم النيران. . . . ))[120]. واتە: (دۆزەخ چەندها چاڵی تێدایە و

---

[118] أخرجه: عبدالرزاق (١٥٢٢)، وابن أبي شيبة (٣٤١٢٧)، والحاكم(٣٥٥/٢، ٥٩٣/٤)، وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وأبو يعلى (٢٦٥٩)، والبيهقي (البعث)(٥٦٠)، وقال البوصيري في (مختصر الأتحاف) (٨٨٢٣): اسناده صحيح، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠/ ٣٩٠): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، واوردهُ الشوكاني في (فتح القدير) (٢٦٧/٣) وقال محققه: صحيح.

[119] أخرجه: الطبراني (الكبير)(٩١٠٣)، وابن أبي شيبة(٣٤١٢٧، ١٥٩٨٥)، والحاكم (٤/ ٥٣٩) وصححه ووافقه الذهبي، والطبري (التفسير) (١٤/ ١٦٠)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٩٣)، وصحح اسناده البوصيري في (إتحاف الخيرة المهرة) (١٠١٧٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٧٨).

[120] أخرجه: ابن أبي شيبة (٣٤١٤٦)، الحاكم (٤٩٤/٣)، والبيهقي (البعث)(٢٩٨-٢٩٩)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٩٩)، وهنا في (الزهد) (٣٥٤/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٧٧).

هەموو یەکێك لەو چاڵانە ڕۆخی هەیە وەك ڕۆخی دەریا ئەو چاڵانە پڕە لەماری گەورە بەوێنەی وشترە گەورەکان و پڕە لە دووپشکی گەورە بەوێنەی هێسترە گەورەکان. هەرکات دۆزەخیەکان داوایان کردسزایان لەسەر سوك بکرێت، پێیان دەوترێت: بڕۆنەدەر بۆلای ئەو ڕۆخانە. دۆزەخیەکانیش لە ئاگر ڕادەکەن بۆلای ئەو چاڵانە و لەوێدا هەموو ئەو مارو دووپشکانە بۆیان دێنەدەر و لێو و لاتەنیشتەکانیان و جێگەکانی تریان دەگەستن و پێستیان دادەماڵن. دۆزەخیەکانیش هاوار دەکەن و دەپاڕێنەوە تا بیانگێڕنەوە بۆ ناو ئاگر و دەگێڕرێنەوە بۆ ناو ئاگر و ئەنجا شاڵاوی ئاگریان لە هەموولایەکەوە بۆ دێتەوە). وەلە دۆزەخیدا هەموو مێش و مەگەزو زەردەواڵە و شتانی تر هەیە بۆ گەستن و پێوەدانی دۆزەخیەکان جگە لەهەنگ کە لە دۆزەخدا نی یە. عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((الذُباب كُلّهُ في النار إلاّ النحل))[١٢١]. واتە: (هەموو جۆرە مێش و مەگەزێك لە دۆزەخدا هەیە جگە لە مێش هەنگ).

**١٤- دووزمانی ئاگرین:**

عەمماری کوڕی یاسر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من كان ذا وجهين في الدنيا، كان له لسانانٍ من نارٍ يوم القيامة))[١٢٢]. واتە: (هەرکەسێك دووڕ و بێت لە دونیادا دوو زمانی دەبێت لە ئاگر ڕۆژی کۆتایی).

**١٥- بەندیخانە و خانووی تایبەت لە ئاگر:**

عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنّ الذي يكذبُ عليَّ يُبنى له بيتٌ في النار))[١٢٣]. واتە: (ئەوکەسەی درۆ بەناوی منەوە هەڵدەبەستێت خانوویەکی تایبەتی بۆ ئامادە دەکرێت لە دۆزەخدا).

---

[١٢١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٤٦٧، ١٣٥٤٣)، أبو يعلى (٤٣٢١)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٣٣٨٧): رجاله ثقات، وقال البوصيرى في (مختصر الاتحاف) (٤٣٥٨): اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٤٤٢).

[١٢٢] أخرجه: البخاري في (الأدب) (١٨٨)، وأبوداود (٤٨٧٣)، ابن أبي شيبة (٥٥٨٧٨)، وأبو يعلى (١٦٢٠)، وابن حبان (٥٧٥٦) وقال محققه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٩٨٣)، (وصحيح أبي داود) (٤٠٧٨)، و (الصحيحة) (٨٩٢، ٨٨٩).

[١٢٣] أخرجه: أحمد (٢٢/٢، ١٠٣)، وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة)(١٦١٨): وهذا اسنادهُ صحيح على شرط الشيخين.

وە حارسی کوڕی بەرصاء ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من أخذ شبراً من مالِ أمرءي مُسلمٍ بيمينٍ فاجرةٍ، فليتَبوَّأ بيتاً مِن النّار))[١٢٤]. واتە: (هەر کەسێك بستێك لە ماڵی پیاوێکی موسوڵمان داگیر بکات بە سوێندی درۆ، با خانوویەك لە دۆزەخدا بۆ خۆی دیاری بکات).

## ١٦- وێنەکێشان بەوێنەکانیان سزا دەدرێن:

عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (( كُلّ مُصوّرٍ في النّار يُجعَل له بِكُلِّ صورةٍ صوَّرها نفسٌ تُعذبِ به - في رواية -[تُعذّبهُ] في جهنم))[١٢٥]. واتە: (هەموو وێنە کێشێك لە دۆزەخدایە و بەهەموو وێنەیەك کە کێشاویەتی ڕۆحی بە بەردا دەکرێت و سزای پێ دەدرێت لە دۆزەخدا). واتە: وێنەی ڕۆح لە بەران کە دروستی کردووە هەموو ئەو وێنانە ڕوحی بە بەردا دەکرێت دەکەونە سزادانی ئەو مرۆڤەی کەدروستی کردوون.

## ١٧- هەرکەسێك لەدونیادا بەهەر شتێك خۆی کوشتبێت هەر بەو شتە سزادەدرێت لەدۆزەخدا:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من خنق نفسه في الدُّنيا فقتلها خنق نفسه في النّار، ومن طعن نفسه طعنها في النار، ومن اقتحم فقتل نفسه إقتحم في النار))[١٢٦]. واتە: (هەرکەسێك خۆی خنکاند بێت لە دونیادا و خۆی بەوە کوشت بێت، ئەوا بەهەمان شێوە لەئاگری دۆزەخ دا خۆی دەخنکێنێت، وە ئەوەی چەقۆیەکی لە خۆی دابێت یاخود شتێکی بە خۆدا چەقاندبێت و خۆی پێ کوشتبێت ئەوا لەدۆزەخ دا بەو شتە خۆی دەکوژێتەوە، وە هەرکەسێك لە شوێنێکەوە خۆی بەردابێتەوە خوارەوە و خۆی کوشتبێت، بەهەمان شێوە لەدۆزەخدا سزادەدرێت و خۆی دەکوژێتەوە).

---

[١٢٤] أخرجه: أحمد (٢٩/٤)، والطبراني (الكبير)(٣٣٣٠)، والحاكم (٢٩٤/٤)وصححه ووافقه الذهبي، والروياني (٢٣٦)، وابن حبان (٥١٦٥)وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[١٢٥] أخرجه: أحمد (٢٩/٤)، والطبراني (الكبير) (٣٣٣٠)، والحاكم (٢٩٤/٤)وصححه ووافقه الذهبي، والروياني (٢٣٦)، وابن حبان (٥١٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[١٢٦] أخرجه: البخاري (١٣٦٥)، والترمذي (١٦٦٠)، ابن حبان (٥٩٨٧) وقال محققه: صحيح واللفظ له.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمویێت: ((من قتل نفسه بحديدةٍ فحديدَتُهُ في يده يتوَجأُ بها في بطنِه في نار جهنم. . . ومن قتل نفسه بسُمٍ فَسمُّهُ في يدهِ يتَحسَّاهُ في نار جهنم. . . ومن تردى مِن جبلٍ فقتلَ نفسُهُ فهو يتَردّى في نار جهنم. . . ))[١٢٧] واتە: (هەرکەسێك خۆی بەئاسنێك کوشت بێت، ئەوا لەدۆزەخ دا ئەو ئاسنەی لە دەستدایە و بەردەوام لە خۆی دەدات و خۆی پێ دەکوژێت، وە هەرکەسێك خۆی ژەهر خوارد کردبێت ئەوا ژەهرەکەی لە مشت دایە وبەردەوام خۆی پێ دەکوژێتەوە هەر کەسێك خۆی لە شاخێکەوە بەردابێتەوە و خۆی کوشتبێت ئەو کەسە بەردەوام بەردەدرێتەوە لە ناو ئاگری دۆزەخدا).

وە هەروەها سابتی کوڕی زەحاك ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من قتل نفسه بشيءٍ عذَّبه الله بما قتل بهِ نفسه))[١٢٨]. واتە: (هەر کەسێك خۆی بەهەر شتێك کوشتبێت خوای گەورە بەهەمان ئەو شتە سزای دەدات کە خۆی پێ کوشتووە لەڕۆژی قیامەت دا). وەلەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمویێت: ((من قتل نفسه بشيء عذبَهُ الله به في نار جهنم))[١٢٩]. واتە: (هەرکەسێك بەهەر شتێك خۆی کوشتبێت خوای گەورە بەهەمان شت سزای پێ دەدات لە ئاگری دۆزەخ دا). وەهەروەها مرۆڤەکان بەوێنەی تاوانەکانیانەوە سزا دەدرێنەوە لە دۆزەخدا وەك زانایان فەرموویانە: " الجزاء من جنس العمل". واتە: (سزا بەوشێوەی کارەکە دەبێت). عەبدولاّی کوڕی عەمر ﷺ لە گێڕانەوەی فەرموودەکەی (صلاة الكسوف)دا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووەتی: ((. . . . ولقد أدنيت النار مني حتى لقد جعلتُ أتقيها خشية أن تغشاكم حتى رأيت فيها أمرأة حمير [طويلة سوداء] تَعذّبُ في هرّة ربطتها فلم تدعها تأكل من خشاش الأرض فلاهي اطعمتها ولاهي سقتها حتى ماتت، فلقد رأيتها تنهشها إذا أقبلت وإذا ولّتْ تنهشُ أَلَيَتها [فهي تنهش قُبلَها وَدُبرها]، وحتى رأيت فيها صاحبَ السبتيين أخا بني الدعداع يُدفع بعصا ذات

---

[١٢٧] أخرجه: الترمذي (٢١٣٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(١٦٦٥).

[١٢٨] أخرجه: الترمذي (٢٦٣٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(٢١٢٤).

[١٢٩] أخرجه: أحمد (٣٤/٤)، ومسلم(١١٢-١١٣).

شعبتين في النار، وحتى رأيتُ فيها صاحِبَ المحجِنْ الذي كان يسرقُ الحاج بمحجنهِ مُتكِئاً على مِحْجنِهِ في النار يقول: انا سارِقُ المحجنِ))[١٣٠]. **واتە: (ئاگری دۆزەخم لێ نزیك کرایەوە خۆمم لێ دەپاراست تا ئێوەش نەگرێتەوە لە ناویدا ئافرەتە بالآبەرزە ڕەش پێستەکەی هۆزی حەمیرم بینی سزادەدرا لەسەر پشیلەیەك کە بەستبویەوە و بەرەلای نەکردبوو تا خۆی بچێت خواردن و ئاوپەیدا بکات و ئافرەتەکەش خواردن وئاوی پێ نەدابوو تا مرد بوو. ئەو پشیلەیەم بینی کە ئافرەتەکە دەهات لەپێشەوە گازی لێ دەگرت و کە دەڕۆیشت لە دواوە گازی لێ دەگرت و بەو جۆرە گازی لە پێش و پاشی دەگرت. وە هەروەها لە ئاگردا پیاوی خاوەن دوو نەعلەکەی بەنی دەعدادعم بینی (کەبە دارێکی دوو سەر نەعلی دەدزی) بینیم لە ئاگردا بەهەمان داری دوو سەر لێی دەدراو دوور دەخرایەوە. وەهەر لە ئاگردا پیاوی خاوەن گۆچانەکەم بینی کە دزی لە حاجیەکان دەکرد بە گۆچانەکەی، بینیم خۆی دا بوو بەسەر گۆچانەکەیداو دەیوت: منم ئەو کەسەی کە بەگۆچانەکە دزیم دەکرد).**

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ڕیفاعە کوڕێکی ڕەنجبەری بەخشیە پێغەمبەر ﷺ، و پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ خۆی بردی بۆ خەیبەر و لەوێ تیرێکی وێڵ هاتوو لێی داو کوشتی و ئێمەش وتمان: بەهەشتی لێ پیرۆز بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:** ((والذي نفسي بيدِهِ إن الشملة لتحترِقُ عليه الآن في النار غلَّها مِن المسلمين يوم خيبر)) فقال رجلٌ مِن الأنصار : يارسول الله، أصبتُ يومئذٍ شِراكين، قال: ((يُقدّلكَ مِثلُها في نار جهنم))[١٣١].

**واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو پارچە قوماشەی کە لەدەست کەوتەکەی شەڕی خەیبەری موسوڵمانان دزی بووی ئا ئێستا بەهەمان ئەو قوماشە دەسوتێنرێت لە ئاگردا. لەوێدا پیاوێکی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەر خوا لەوڕۆژە دا منیش دوو تاڵ قەیتانی نەعلم برد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەمان ئەو دوو تاڵە قەیتانەت بۆ ئامادە دەکرێت لە ئاگری دۆزەخدا).**

---

[١٣٠] أخرجه: أحمد (٢/ ١٥٩)، والنسائي (١٣٧/٣) واللفظ له، وابن خزيمة (١٣٨٩)، والحاكم (١/ ٣٢٩)، وابن حبان (٧٤٨٩) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي)(١٤٨٢).

[١٣١] أخرجه : ابن أبي شيبة (١٢/ ٤٩٥)، والحاكم (٣/ ٤٠) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٨٥٢) وقال محققه اسناده حسن.

**١٨- کۆت وزنجیر و قەیدەکات:**

**خوای گەورە باسی سێ جۆر بەستنەوەی دۆزەخیەکان دەکات.**

**١- کۆت: ئەو زنجیرەیە کە یەك دەست بەگەردنەوە دەبەستێت. خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾ (الأنسان: ٤) **واتە: (ئێمە کۆت و زنجیر و ئاگرمان ئامادە کردووە بۆ بێ باوەڕان).**

**وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿. . . . . . . . وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (سبأ: ٣٣). **واتە: (کۆتەکانمان کردووەتە مل و گەردنی ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون. . . . . . ). حەسەنی کوڕی صالح** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** "الغُلّ: تَغُل اليد الواحدة الى العنق"[١٣٢]. **واتە: (کۆت ئەوەیە کە دەستێك دەبەستێت بە گەردنەوە).**

**موسى کوڕی ئەبو عائیشە لە مانای ئەم ئایەت پیرۆزەدا** ﴿أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ (الزمر: ٢٤). **دەفەرموێت:** "تُشَدُّ ايديهم بالأغلال في النار فيستقبلون العذاب بوجوههم قد شُدَت أيديهم فلا يقدرون على ان يتقوا بها كلما جاء نوعٌ من العذاب يستقبلون بوجوههم"[١٣٣]. **واتە: (هەر دوو دەستیان دەکرێتە کۆتەوە وسزایان بەرەوە و ڕوو دەبێت نا توانن بەدەست لە خۆیانی دوور بخەنەوە چونکە دەستیان بەسراوە بۆیە هەوڵ دەدەن بەدەم و چاو و ڕوویان لە خۆیانی دوور بخەنەوە و هەموو جۆرە سزایەکی تربێت هەر وا دەکەن).**

**حەسەنی بەصریش** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** " إن الأغلال لم تُجعل في أعناق اهل النار لأنَّهم أعجزوا الرَّبَ عزوجل. ولكنها إذا طفىء بهم اللهب ارسبتهم في النار "[١٣٤]. **واتە: (کۆت و زنجیرەکان نەکراونەتەوە گەردن دۆزەخیەکان لەبەر ئەوەی نەوەك ڕزگاریان بێت لە سزای خوا بەڵکو ئاگردەیان سوتێنێت و بەرزیان دەکاتەوە پاشان بەو زنجیرانە دەیان گرنەوە و نوقمی دۆزەخیان دەکەنەوە).**

---

[١٣٢] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) رقم (٥١).

[١٣٣] أخرجه: نفس المصدر رقم (٢٦٠).

[١٣٤] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٥٧)، وابن أبي شيبة (المصنف)(٣٤١٦٤).

**٢- قەید:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴾ (المزمل: ١٢). واتە: (بێ گومان ئێمە قەیدە قورسە توندەکانی دۆزەخمان ئامادەکردووە بۆ(تاوانباران)). وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴾ (إبراهيم: ٤٩). واتە: (لە ڕۆژی کوتایدا ستەمکاران دەبینن کە هەموو لەگەڵ یەکدا بە قەیدەکان بەسراونەتەوە).

ئەبو صالح لەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزدا: ﴿ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴾ (الهمزة: ٩). دەفەرموێت: "القيودُ الطِوالُ ". واتە: (دۆزەخیەکان بەستراونەتەوە بەقەیدە درێژەکاننەوە)، وە ئیمامی ئەلسەدی دەفەرموێت: " الأصفاد تجمع اليدين الى العنق ". [١٣٥] واتە: (قەیدەکان ئەوانەن کە هەر دوو دەست دەبەستنەوە بەملەوە).

**٣- زنجیرەکان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾ (غافر: ٧١-٧٢) واتە: (کۆتەکان کراوەتە گەردنیان و بەزنجیرەکان ڕادەکێشرێن بەناو ئاوی گەرمی بەکوڵدا پاشان لە ئاگردا دەسوتێنرێن و دەبەسرێتەوە).

فوضەلی کوڕی عەیاض (رحمه الله) سەبارەت بەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴾ (الحاقة: ٣٠-٣٢). دەفەرموێت: "إذا قال الرّب (خُذُوهُ فَغُلُّوهُ) تبدرُهُ سبعون الف ملك كلهم يتبَدُر ايُّهم يجعل الغُل في عنقِهِ"[١٣٦].

واتە: (کە خوای گەورە فەرمووی: بیگرن لەوێدا حەفتا هەزار فریشتە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری دەدەن کامیان لە پێشدا کۆت و زنجیر بکاتە گەردنی).

ئیبنو جورەیجش (رحمه الله) بەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴾ (الحاقة: ٣٢). دەفەرموێت: (بذراع الملك). واتە: (بیگرن و لەحەفتا گەز زنجیردا بەگەزی فریشتەکان بیبەستنەوە).

---

[١٣٥] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٥٣)، وهناد (الزهد) (٢٦٦).

[١٣٦] أخرجه: ابن أبي حاتم كما في (تفسير ابن كثير) (٦/٢٥٨)، و(التخويف)(ابن أبي رجب)(ص: ١٠٣).

**ئیمامی موجاهیدش** (رحمه الله) **سەبارەت بە مانای (فاسلکوه) دەفەرموێت: (ئیمامی ضەحاك) فەرموویەتی:** " السِلك ان تُدخل السلسلة في فيّه وتَخرُجُ من دُبُرِه "[١٣٧] **. واتە: (ئەوەیە زنجیرەکە لەدەمیەوە ببرێت ژوور و لەکۆمیەوە دەربکرێت).**

**ئیبنو عەباسیش** ﷺ **دەفەرموێت:** " السلسلة تدخل في أستهِ ثم تخرُج من فيه ثم ينظمون فيها كما يُنظَّمَ الجراد في العود حتى لايقوم على رجليه"[١٣٨] **واتە: (ئەو زنجیرە دەکرێتەوە کۆمیەوە و لە دەمیەوە دەر دەکرێت یەك بەدوای یەکدا زنجیریان پیا دەکرێت وەك چۆن کۆمەڵێك کوڵلە لەشیش دەدرێت ئەوەش بۆیە هیچ یەکێکیان نەتوانن لەسەر هەردوو قاچیان بوەستن).**

**خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿ يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴾ (الرحمن: ٤١) **واتە: (تاوانباران بە ڕوخسارياندا دەناسرێنەوە، وە بەپێشی قژ و قاچیان ڕادەکێشرێن).**

**ئیمامی ضەحاك** (رحمه الله) **سەبارەت بە ئایەتی پێشوو دەفەرموێت:** "يجمع بين ناصيتهِ وقدميهِ في سلسلةٍ مِن وراءِ ظهرهِ"[١٣٩] **. واتە: (تاوانباران سەر و قاچیان لەدواوە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە وەك تۆپیان لێ دەکرێت و پاشان ڕادەکێشرێن).**

**حەسەنی بەصری** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** " إنَّ جهنم لِيغلي عليها من الدهر الى يوم القيامة، يحمي طعامها وشرابها واغلالها ، ولو أنَّ غلا منها وضِع على الجبال لقصمها الى الماء الأسود، ولو أنَّ ذراعاً مِن السلسلةِ وُضِعَ على جبلٍ لرَّضَهُ ، ولو أن جبلاً كان بينه وبين عذاب الله خمسمائة عام لذاب ذلك الجبل ، وأنهم ليجمعون في السلسلة من آخرِهم فتأكلهم النار وتبقى الأرواح "[١٤٠] **. واتە: (دۆزەخ و ئەوانەی کە تیایەتی لە خواردن و خواردنەوە و کۆت و زنجیرەکانی بەردەوام گەرم دەکرێن، گەر کەلەپچە و زنجیرێکیان بخرێنە سەرچیاکان دەیتوێنێتەوە تا دەیگەیەنێتە ئاوی ڕەش، وە گەر زنجیرێکیان بکرێتە سەر چیایەك خاپوری دەکات، وە گەر شاخێك ماوەی پێنج سەد ساڵ**

---

[١٣٧] أخرجه: الطبري (التفسير)برقم (٢٦٩٩٩).

[١٣٨] أخرجه: الطبري (التفسير)برقم (٢٦٩٩٧)، وابن المبارك (الزوائد) (٢٩٠)، وابن أبي الدنيا (صفة النار)(٧٢).

[١٣٩] انظر: (التخويف من النار) لأبن رجب (ص: ١٠٥)، وأخرجه: هناد (الزهد) (٢٦٨) وقال محققه: اسناده ضعيف.

[١٤٠] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٢٧).

دوور بێت لەو سزایەی خواوە دەتوێتەوە، ئەوانە هەموو لەو زنجیرەدا کۆ دەکرێنەوە و ئاگر جەستەیان دەسوتێنێت تەنها ڕۆحەکانیان دەمێنێتەوە).

وە شێوەی هەڵواسینی دۆزەخیەکان عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بینی لەو خەوەیدا کە بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوە و وتی: "... وإذا فيها رجالٌ مُعلّقون بالسلاسل رؤوسهم اسفلهم وعرفت فيها رجالاً من قريش "[١٤١]. واته: (تەماشای دۆزەخم کرد پیاوانێکم بینی سەر بەرەوخوار هەڵواسرابوون و هەندێك لە پیاوانی قوڕەیشیان لە ناو دا بوو).

ئیبنو عەباسش ﷺ دەفەرموێت: (هم يسحبون السلاسل)[١٤٢]. واتە: (دۆزەخیەکان دەبێت زنجیرەکان بەدوای خۆیاندا ڕابکێشن).

وەحەسەنی بەصریش (رحمه الله) دەفەرموێت: "ذكر الله السلاسل والأغلال في النار وما يكون في الدنيا" ثم قال "وآخر مِن شكلِه ازواج" قال آخر "لاترى في الدنيا "[١٤٣]. واتە: (خوای گەورە باسی هەندێك لەو کۆت و زنجیرانەی کرد کە ناسراون لە دونیادا و پاشان فەرموویەتی: چەندها شێوە و جۆری تری هەیە کە لەدونیادا نەبینراون).

## ١٩- بەندیخانەی (بۆلەس) تایبەت بە خۆبەزل زانەکان:

عەبدوڵای کوڕی عەمرى کوڕی عاص ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يُحشرُ المتكبّرين يوم القيامةِ امثال الذَّرِّ (أي: النمل السود الصغار) في صور الرِّجالِ يغشاهم الذّلُ مِن كل مكان[ يعلوُهم كُلّ شيء مِن الصَّغار] يُسقونَ الى سجنٍ في جهنم يُسَمّى بُولَسْ تعلوهم نارُ الأنيار يُسقوْنَ من عُصارةِ اهل النّار طينة الخبال))[١٤٤]. واتە: (خۆبەزل زانەکان لە ڕۆژی کۆتاییدا کۆدەکرێنەوە لە شێوەی

---

[١٤١] أخرجه: البخاري (٤٤٠)، ومسلم (٢٤٧٨).

[١٤٢] أخرجه: ابن أبي حاتم كما في (التخويف) (ص: ١٠٢).

[١٤٣] أخرجه: البخاري (٤٤٠)، ومسلم (٢٤٧٨).

[١٤٤] أخرجه: الحميدي (٥٩٨)، وأحمد (٦٦٧٧) وقال محققه: اسناد حسن ، وابن أبي شيبة (٩/٩٠)، والبخاري (الأدب (الأدب المفرد)(٥٥٧)، والترمذي (٢٤٩٢)، والبزار (٣٤ ٢٩)، وابن المبارك (الزوائد) (ص: ٥٢)، وابن أبي الدنيا (صفة النار) (٤٦) وحسنه الحافظ العراقي في (الأحياء) (٣/ ٣٢٩)، والشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٤٣٤)، و(صحيح الترمذي) (٢٠٢٥)، و(المشكاة) (٥١١٢).

پیاوانێکدا کە قەبارەیان بەوێنەی مێروولە ڕەشە بچووکەکانە، لە هەموو جێگەیەکەوە زەلیلی و ڕیسوایی دەیانگرێتەوە و هەموو شتێك ژێر پێیان دەنێت وبەسەریاندا دەڕوات دەبرێن بۆ بەندیخانەیەك لە دۆزەخدا کەناوی (بولەس)وئاگری هەرە گەورەیان بەسەرەوەیە و قوڕاوی خەبال کە گوشراوی (کیم و میز و پیسای و جەراعەت و فرمێسك و خوێن. . . هتد)ی دۆزەخیەکانە دەکرێت بە دەمیاندا و دەرخوادیان دەدرێت).

و عەبدولاّی کوڕی عەمریش ﷺ خۆی دەفەرموێت: : " إنَّ في النّار سَجِناً لايدُخلُه إلآمن كان شرّ الأشرار، قرارهُ نارٌ، وسقفهُ نارٌ، وجدرانه نارٌ، وتلفح منه نارٌ "[١٤٥] . واتە: (لە دۆزەخدا بەندیخانەیەك هەیە کە تەنها هەرە خراپەکارەکان دەخرێنە ناوی ئەو بەندیخانەیە تەختی ژێرەکەی ئاگرە، و دیوارەکان و سەقفەکەشی ئاگرە و لە هەمولایەکیەوە ئاگر دەردەچێت و دەیان سوتێنێت).

**٢٠ – هەندێك لە دۆزەخیەكان ڕیخۆڵەكانیان بەدواخۆیاندا ڕادەكێشن.**

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يؤتى بالرّجل يوم القيامة فيُلقى في النار، فتندلِقَ أقتابُ بطنه فيدُورُ بها في النّاركما يدور الحمارُ بالرّحى، قال: فيجتمعُ أهلُ النار إليه فيقولون: يا فلان [ ماشأنك] ، أماكنت تأمرنا بالمعروفِ وتنهانا عن المنكر ؟ قال: فيقول : بلى قد كنت [آمركم] بالمعروف ولا آتيه، وانهاكم عن المنكر وآتيه))[١٤٦] . واتە: (پیاوی واهەیە لە ڕۆژی کۆتایدا دەیهێنن و دەیخەنە خوارەوە بۆ ناو ئاگرو ڕیخۆڵەکانی ناوسکی بەو ناوەدا دەڕژێت ولە ئاگردا ڕادەکات ودەسوڕێتەوە بەڕیخۆڵەکانیەوە وەك چۆن گوێ درێژێك بەپەتەکەیەوە دەسوڕێتەوە بۆ گێڕانی ئاشێك. دۆزەخیەکان لێی کۆدەبنەوە و پێی دەڵێن: فلاّن کەس ئەوە تۆی بۆ وات لێ هات ئەی تۆ نەبویت فەرمانت پێ دەکردین بە چاکەو ڕێگریت لێ دەکرین لە خراپە؟ ئەویش لەوەلاّمدا دەڵێت: بەڵێ من فەرمانم پێ دەکرن بە چاکە بەلاّم خۆم ئەنجامم نەدەدا وەڕێگریم دەکردن لە خراپە بەلاّم خۆم ئەنجامم دەدا).

---

[١٤٥] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٤٢).

[١٤٦] أخرجه : أحمد (٢١٧٨٤)، والبخاري(٣٢٦٧)، ومسلم(٢٩٨٩).

**لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((يؤتى بالرجل الذي كان يُطاعَ في معاصي الله فَيَقذفُ في النار، فتندلِقُ بهِ أقتابهُ، فيستديرُ فيها كما يستديرُ الحمارُ في الرَّحى فيأتي عليه أهلُ طاعتِهِ مِن الناس فيقولون: أي قُلْ أين ماكنتَ تأمُرُنا به؟ فيقول: إني كنت آمركم بامرٍ واخالفكمْ الى غيرِهِ))[147]. **واتە: (ئەو پیاوەی کە گوێڕایەڵی دەکرا لە ئەنجامدانی تاوانەکاندا دەهێنرێت، فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخ و ڕیخۆڵەکانی دەڕژێن بەهەموولایەکدا و بڵاودەبنەوە بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشێت و دەسوڕێتەوە وەك چۆن گوێدرێژ دەسوڕێتەوە بە گوریسەکەیەوە بۆ گێڕانی دەستاڕی ئاش. لەوێدا ئەو خەڵکانەی گوێڕایەڵیان دەکرد لە دونیادا لێی کۆ دەبنەوە و پێی دەڵێن: ئەی پیاوی بچکۆلە کوا ئەوانەی فەرمانت پێ کردین لە دونیادا؟ ئەویش دەڵێت: من فەرمانێکم پێ دەکردن و خۆم بە پێچەوانەی ئەوە وە کارم دەکرد واتە: (من فرمانم پێ دەکردن بە چاکە و خۆم نەم دەکرد وەرێگریم دەکرد لە خراپە و خۆم ئەنجامم دەدا).**

**پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئەو سزایەی بە چاوی خۆی دیوە، وەك ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((رأيتُ عمرو بن عامر بن لحيّ الخُزاعي يَجُرُّ قُصَبهُ في النار وكان أوّل من سيَّبَ السوائِبْ))[148]. **واتە: (عەمری کوڕی عاص خوزاعیم لە دۆزەخدا بینی ڕیخۆڵەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا چونکە ئەو بوو یەکەم جار ئەوەی داهێنا کە هەندێك لە وشترەکان بەرەڵا بکرێن بۆ بتەکان و تەنها بۆ ئەوان سەر ببرێن).**

(أبو مُثنى الأملوكي) (رحمه الله) **دەڵێت** "إن في النّار أقواماً يربطون بنواعير من نار تدور بهم النواعِير ومالهم فيها راحةٌ ولا فترةٌ"[149]. **واتە: (لە دۆزەخدا کەسانێك هەن دەبەسرێنەوە بە ناعورە ئاگرەکانەوە و بەردەوام دەیان سوڕێنێتەوە و ماوەی پشوویان نادات. ) (ناعور واتە ئەو ئامێرەیە کەلە تەختە دروست دەکرێت و هەر دەسوڕێتەوە وئاو هەڵدەکێشێت لە ڕووبارەکانەوە بۆ ناو جۆگەکان).**

---

[147] أخرجه: أحمد (٢٧٧٩٤) وقال محققه: حديث صحيح واسناده حسن، والحاكم (٤/٨٩).

[148] أخرجه: البخاري (٣٥٢١)، ومسلم (٢٨٥٦).

[149] انظر: (صفة النار)لابن أبي الدنيا رقم (٤٨).

**٢١- سزادانی لەسەر گرێ نەدانی دوو دەنکە جۆ ، قوڕقوشمی تواوە کردن بەگوێدا:**

عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من تَحَلَّم [كاذباً] بحلمٍ لم يَرَهُ كُلِف أن يعقد بين شعيرتين، ومن استمع إلى حديث قومٍ وهم له كارهون أو يَفِرّون منهُ صُبَّ -في رواية- [أذيب] في أذنهِ الآنكَ (أي: الرصاص المذاب)يوم القيامة. . . ))[١٥٠] واتە: (هەرکەسێك خەوێك کەنەی بینیوە و بەدرۆ بیگێڕێتەوە، فەرمانی پێ دەکرێت کە دوو دەنکە جۆ بەیەکەوە گرێ بدات، هەر کەسێك گوێ بگرێت لە گفتوو گۆی کەسانێك کە پێیان ناخۆشە ئەو گوێیان لێ بگرێت و خۆیان دوور دەخەنەوە لەو کەسە، ئەو جۆرە کەسانە قوڕقوشمی تواوە دەکرێتە گوێیانەوە لە ڕۆژی کۆتایدا).

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((مَن تحلّم كاذباً دُفع اليه شعيرةٌ وعُذّبَ حتى يَعْقِدَ بين طرفيها، وليس بعاقدٍ ))[١٥١] واتە: (هەر کەسێك خەوێکی درۆ بگێڕێتەوە دەنکە جۆیەکی بچوکی دەدرێتە دەست و داوای لێ دەکرێت هەردوو سەری دەنکە جۆێکە بەیەکەوە گرێ بدات و هەرگیز ناتوانێت گرێیان بدات بەیەکەوە و بەردەوام لەسەر نەتوانینی ئەو کارە سزا دەدرێت).

**٢٢- ئاڵۆش و خورووی گەڕی:**

ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کەفەرموویەتی: (النائحة إذا لم تَتُبْ قبل موتها، تقامُ يوم القيامة وعليها سرابيلُ مِن قطرانٍ (أي: النحاس المذاب)، ودرعٌ من جربٍ))[١٥٢]. واتە: (ئەو ئافرەتانەکە شین و شەپۆڕی دەکات و خەڵکان دەخاتە گریان گەر پێش مردنی تەوبە نەکات و لەسەر ئەو کارە بمرێت لە ڕۆژی کۆتایدا کراسێکی گەڕی ئاڵۆشاوی لەگەڵ شەڕواڵێکی مسی تواوە دا بە بەردا دەکرێت).

---

[١٥٠] أخرجه: البخاري (٧٠٤٢)، وأحمد (١/٢١٦)، والترمذي (٢٢٨٣).

[١٥١] أخرجه: أحمد (١٠٥٤٩)وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري.

[١٥٢] أخرجه: أحمد (٢٢٩٠٣)، ومسلم (٩٣٤)، وابو يعلى (١٥٧٧)، وابن حبان (٣١٤٣)، والطبراني (٣٤٢٦).

**لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((. . . النائحةُ إذا ماتتْ ولم تَتُب، قطع اللهُ لها ثياباً مِن قطِران ودرِعاً من لهب النّار))[١٠٣]. واتە: (ئافرەتی شین و شەپۆڕکەر گەر تەوبەی نەکردبێت و مردبێت خوای گەورە پۆشاکێکی قەتران و کراسێکی کڵپەی ئاگری بەبەردا دەکات). ئیمامی موجاهید** (رحمه الله) **لە یزیدی کوڕی شەجەرەی صەحابی دەگێڕێتەوە کە وتویەتی:** ". . . يُسَلُّط عليهم (أي على أهل النار) الجربَ، حتى إنَّ احدهم لَيُحك جَلِدُه حتى يبدوَ العظم، فيقالُ : يافلان هل يؤذيك هذا؟ فيقول: نعم، فيُقال لَه: ذلك بما كُنت تؤذي المؤمنين "[١٠٤]. **واتە: (دۆزەخیەکان گەڕی و ئالۆشی زاڵ دەکرێ بەسەریاندا و یەکێك لەوانەی خۆی دەخورێنێت تا ئێسك دەردەکەوێت پێی دەوترێت: فلانەکەس ئایا ئەوە ئازارت دەدات؟ ئەویش دەڵێت بەڵێ، پێی دەوترێت: ئەو ئازارەت تووش هاتووە لەبەر ئەوەیە ئازاری بڕوادارنت دەدا).**

**٢٤- کەوتنە خوارەوەی بەردەوام بۆ ناو ئاگر:**

**ئیبنو ڕەجەب** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** " منهم من يُعذبُ بالصعود إلى أعلى النار، ثم يهوي فيها كذلك أبداً، ومنهم من يُكلفُ صعود جبل في النار والتردي منه "[١٠٥]. **واتە: (هەندێك لە دۆزەخیەکان بەسزادانەوە بەرز دەکرێنەوە بۆ سەرووی دۆزەخ و پاشان لەوێوە فڕێ دەدرێنەوە خوار بەردەوام، وەهەندێکی تریان فەرمانیان پێ دەکرێت سەرکەون بۆ سەر چیایەك لە دۆزەخدا و لەوێوە فڕی دەدرێتە خوارێ).**

**عەبدولای کوڕی عەباس** ﷺ **سەبارەت بەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزە** ﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾ (المدثر: ١٧). **دەفەرموێت:** ": هو جبل في النار زلِق كلما صَعُد الفاجر زلقَ فهوى في

---

[١٠٣] أخرجه: أحمد (٢٢٩٠٣)، وقال محققه، حديث صحيح، وابن ماجة (١٥٨١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(١٢٨٥).

[١٠٤] أخرجه: ابن أبي شيبة (٣٤١٣٢)، والحاكم (٤٩٤/٣)، والبيهقي (البعث)(٢٩٨-٢٩٩)، و ابن أبي الدنيا (صفة النار)(٩٩)، وهناد في الزهد (٣٠٤/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٧٧).

[١٠٥] أنظر: (التخويف)لأبن رجب (ص: ١٥١).

خراپەکار هەر جارێك پێدا سەر بکەوێت دەخلیسکێت و دەکەوێت خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ ".

صائیبی کوڕی ئەبی صائیبیش ﷺ دەفەرموێت: " هو جبلٌ من صخرة ملساء في النار". واتە: " (صەعود) چیایەکی خلیسکە لە دۆزەخدا و یکلف أن يَصعدها حتى إذا بلغ أعلاها رُدّ إلى أسفلها". "واتە: (صەعود) واتە: چیایەکە لە بەردی خلیسك پێك هاتووە و دۆزەخی داوای لێ دەکرێت پیایدا سەرکەوێت و دەڕوات تا دەگاتە سەری چیاکە لەوێوە فڕێ دەدرێتەوە خوارەوە.

وە شەفی کوڕی ماتیعش ﷺ دەفەرموێت: "في جهنم جبلٌ يدعى صعودا يطلع فيه الكافر أربعين خريفاً قبل أن يرقاهُ " [١٥٦]. "واتە: لە دۆزەخدا چیایەك هەیە ناوی (صعود)ـە بێ باوەڕ چل ساڵ پیایدا سەر دەکەوێت پێش ئەوەی بگاتە لوتکەکەی".

فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەش ﷺ ئەمانە پشت ڕاست دەکاتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . من تردّى مِن جبلٍ فقتل نفسه فهو يتردّى في نار جهنم...)) [١٥٧]. واتە: (هەرکەسێك خۆی لە شاخێکەوە بەرداتەوە خوارەوە و خۆی بکوژێت ئەو کەسە بەردەوام دەبێت خۆی بەردەداتە خوارەوە لە دۆزەخدا). وەعەبدوڵای کوڕی مەسعودیش ﷺ دەفەرموێت: ((إنّ القتل في سبيل الله يُكفّرُ الذّنوبَ كُلّها غير الأمانة، يُؤتى بِهِ وإن قُتل في سبيل الله، فيقال له: ادّ امانتكَ. قال: ربِّ كيف أؤديها وقد ذهبت الدُّنيا؟ فيقول: إذهبوا به إلى الهاويه[فيهوى فيها] حتى إذا انتهى به إلى قرار الهاوية، مُثِّلَتْ له أمانته كيومُ دُفعت اليه، فيحمِلها، فَيَضعُها على عاتقِهِ، فَيصَعد [بها] في النّارِ حتى إذا رأى أن قد خرج منها زَلّت عن عاتِقِه ، فهوتْ وهوى في أثرها أبد الأبدين. . )) [١٥٨]. واتە: (شەهیدبوون لە پێناوی خوادا هەموو تاوانەکان دەسرێتەوە تەنها ئەمانەت ناسرێنەوە، ئەو

---

(١٥٦) أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٣٧)، وهناد (الزهد) وقال محققه: رجاه ثقات، وابن المبارك (الزوائد)(٣٣٦)، وانظر: (التخويف) لابن رجب (ص: ٩٥).

(١٥٧) أخرجه : البخاري (٥٧٧٨)، ومسلم (١٠٩)، وابو داود (٣٨٧٢)، والترمذي (٢٠٤٤).

(١٥٨) أخرجه: ابو نعيم (الحلية)(٤/ ٢٠١)، والبيهقي (الشعب)(٥٢٦٦)، والدينوري في (المجالسة)(١٧٠١)وقال محققه (الشيخ مشهور بن حسن): اسناده حسن. وقد رواه الطبراني (الكبير)(١٠٥٣٧)مرفوعاً: وهو حديث ضعيف كما قال الشيخ الألباني في: (ضعيف الجامع) (٤١٣٠).

کەسە هەر چەندە کوژرابێت لە پێناوی خوادا پێی دەوترێت (واتە: لە ڕۆژی کۆتاییدا). ئەمانەتەکە بگێڕەرەوە؟ ئەویش دەڵێت: خوایە دونیا ڕۆیشت ئێستا چۆن ئەمانەتەکە بگێڕمەوە؟ دواتر دەڵێت: بیبەن بۆ دۆزەخ. ئەوکەسە دەبرێت بۆ دۆزەخ و فڕی دەدرێتە خوارەوە و بەردەبێتەوە تا دەگاتە کۆتاییەکەی خوارەوە لەوێدا ئەمانەتەکەی بە شێوەی ئەو ڕۆژەی کەدراوەتە دەستی بۆ دەهێنرێت هەڵی دەگرێت و دەیکاتە سەر شانی سەردەکەوێت بە ناو ئاگردا تا دەگاتە ئەوەی وادەزانێت کەمێکی ماوە کە ڕزگاری ببێت لەوێدا لەسارشانی دەکەوێتە خوار بۆ قوڵای ناو دۆزەخ و ئەویش بەدوایدا خۆی بەر دەداتەوە و ئەو کارە بەو جۆرە بەردەوام دەبێت).

**٢٤- سزای (الزمهرير): -**

**ئیمامی موجاهید** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** "الزمهرير: البرد المفظع"[١٥٩]. **واتە: (زەمهەریر بریتیە لە سەرمایەکی سەخت و تۆقێنەر).**

**خوای گەورە سەبارەت بە بەهەشت دەفەرموێت:** ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴾ (الأنسان: ١٣) **ئیمامی طەبری لەڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت:** "يقول تعالى: لايرون فيها شمساً فيؤذيهم حَرَّها، ولا زمهريراً: وهو البرَد الشديد فيؤذيهم بَردها"[١٦٠]. **واتە: (لەبەهەشتدا ڕۆژ نیە تا گەرماکەی ئازاریان بدات وە(زمهەریر) واتە: سەرمایەکی زۆر سارد نیە لەبەهەشتدا تا سەرماکەی ئازاریان بدات)**

**لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا** رضي الله عنه **پێغەمبەر** ﷺ **باسی سەرمای دۆزەخی کردووە و فەرموویەتی:** ((. . . . . . . فأشدَّ ماتجِدُوْن مِن البرِد زمهرير جَهَنَّم وأشدَّ ماتجدون مِن الحَرّ مِن حَرّ جَهَنم))[١٦١]. **واتە: (. . . . . . ئەو ساردیەی لە زستاندا هەستی پێ دەکەن لە زەم**

---

[١٥٩] أخرجه: الطبري (التفسير)(٢٧٧٥٣).

[١٦٠] أنظر: (تفسير الطبري)(١٤/٢٦٥).

[١٦١] أخرجه: أحمد (٧٧٢٢) وقال محققه : اسناده صحيح على شرطها، واللفظ له، وأخرجه: البخاري (٣٢٦٠)، ومسلم (٦١٧).

هەریری دۆزەخەوەیە، وە ئەو گەرمایەی لە هاویندا هەتی پێ دەکەن لە گەرمی دۆزەخەوەیە).

وەهەندێك وتەی تریش لە بارەی ئەم باسەوە هاتووە لەوانە:

١- عەبدولای کوڕی عەباس ﷺ دەفەرمویت: "یستعیذ أهل النار مِن الحَرِ فیُغاثون بریح باردٍ یَصَدعُ العظم بردها فیسألون حرَّها "[١٦٢]. واتە: (دۆزەخیەکان داوای پەنادان و دوور خستنەوە دەکەن لەگەرما و ئاگر. بەفریایان دێن و بایەکی زۆر ساردی پێ دەگەیەنن کە ئێسکەکانیان تێك دەشکێن و کەرتی دەکات ئەنجا هاوار دەکەن کەبگێڕێنەوە بۆ ناو گەرما و ئاگر).

٢- ئیمامی موجاهید (رحمە الله) دەفەرمویت: " إنَّ في النار لزمهریراً یغلون فیهربون منها إلی ذلك الزمهریر فاذا وقعوا فیه حَطَمَّ عِظامَهم حتی یُسمَع لها نقیضاً "[١٦٣]. واتە: (دۆزەخیەکان لە ئاگردا دەکوڵێن و دەسوتێن و لەگەرما و ئاگر ڕادەکەن بە ناو زەمهەریردا کە دەچنە ناوی ئێسکەکانیان تێك دەشکێێت و خۆیان دەنگی تێك شکانەکەی دەبیستن).

٣- کەعب ﷺ دەفەرمویت: " إن في جهنم برداً وهو الزمهریر یَسقُط اللحم عن العظم حتی یستغیثوا بِحرّ جهنم "[١٦٤]. واتە: (لە دۆزەخدا سەرمایەکی زۆر سارد هەیە کە زەمهەریرە و گۆشتەکانیان دەیبەستێت و پارچە پارچە لە ئێسکەکەی جیادەبێتەوە و دەکەوێتە خوار تا داوای گەرماو دۆزەخ دەکەن). وە ئەم مانایەش لە فەرموودەیەکی (لاواز)دا هاتووە کە تەنها بۆ زیاتری و بە ئاگابوون دەیهێنین. ((. . . قالوا: وما الزمهریرُ؟ قال: ((بیتٌ یُلقی فیه الکافر فیتمَّیزُ مِن شِدّةِ بردِهِ))[١٦٥]. واتە: (پرسیارکرا زەمهەریر چیە؟ فەرموی: جێگەو شوێنێکە کە بێ باوەڕانی تێ فڕێ دەدەن و پارچە پارچە دەبێت بە هۆی زۆری سەرما و ساردی ئەو جێگەیەوە).

---

[١٦٢] أخرجه: ابن أبي الدنیا (صفة النار) (١٥٢).

[١٦٣] أخرجه: ابن أبي الدنیا (صفة النار)(١٠٢).

[١٦٤] أخرجه: ابن أبي الدنیا (صفة النار) (١٥٣).

[١٦٥] أخرجه: ابن السني (٣٠٦) وقال: من روایة دَراج عن أبي الهیثم و روایته ضعیفة.

## ٢٥- تابوتە ئاگرینەکان:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَآ أُلْقُواْ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْاْ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴾ (الفرقان: ١٣) واتـە: (دۆزەخیـەکان لـە جێگەیـەکی زۆر تەسکەوە فڕێ دەدرێنـە نـاو دۆزەخەوە یاخود دەکرێنە جێگەیەکی زۆر تەسکەوە ئەوجا لەوێدا دەکەونە هاوار و ناڵە).

عەبدولای کوڕی مەسعودا ﷺ سەبارەت بەمانای ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ (النساء: ١٤٥). دەفەرموێت: "إن المنافقين في توابيت من حديد مقفلةٌ عليهم في [أسفل درك] النار "[١٦٦]. واتە: (دووڕووەکان دەکرێنە ناوچەند تابوتێکی ئاسنەوە و لەسەریان دادەخرێت و دەبرێن بۆ هەرە خواری خوارەوەی دۆزەخ). ئەبو هورەیرەش ﷺ دەفەرموێت: (([المنافقين] في توابيت تُرتجُ عليهم))[١٦٧]. واتە: (دووڕوەکان دەکرێنە چەند تابوتێکەوە لەسەریان دادەخرێت).

لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە عەبدولای کوڕی مەسعودەوە ﷺ ((إن المتكبرين يجعلون في توابيت من نار تُطبق عليهم ثم يجعلون في الدرك الأسفل من النار))[١٦٨]. واتـە: (خۆبـەزل زانـەکان دەکرێنـە چـەند تـابوتێکی ئـاگرەوە و لەسـەریان دادەخرێـت و پاشـان دەکرێنـە جێگەیەکی هەرە خواری دۆزەخەوە).

ئیبنـو ڕەجـەب (رحمە الله) دەفـەرموێت: "ومن أهل النار من يُلقى في مكان ضيق لايتمكن فيه من الحركة"[١٦٩]. واتـە: (دۆزەخـی وا هەیـە کە فڕی دەدرێتـە جێگەیـەکی زۆر تەسـکەوە لەوێـدا هـیچ جـۆرە جووڵەیـەکی پـێ ناکرێـت). وە هـەروەها لـە کەعبـەوە ﷺ گێڕادراوەتەوە کە فەرموویەتی: " إن في أسفل درك جهنم تنانير ضيقها كضيق زج [لهو

---

[١٦٦] أخرجه: الطبري (الكبير) (٩٠١٥)، والطبري (التفسير) (٨٤٥٣)، وابن أبي شيبة (٣٤١١٤)، و ابن أبي الدنيا (صفة النار) (١٠٠)، وانظر: (تفسير القرطبي) (٥/ ٤٠٣)، (وتفسيرابن كثير) (٢/١٨٦)، (وزاد الميسر)لأبن جوزي (٢/ ١٤١)، (وفتح القدير) للشوكاني(١/٧٩٣).

[١٦٧] أخرجه الطبري (التفسير)(٨٤٥٤)، وانظر: (التخويف) لأبن رجب (ص: ٥٩).

[١٦٨] أخرجه: البيهقي في (شعب الايمان)(٨١٨٦-٨١٨٧).

[١٦٩] أخرجه: الطبرى (٥/٢١٧)، وهناد (الزهد) (٢٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

أضيق على من دخل فيه من زج (وهي حديدة في أسفل الرمح] أحدكم على رمحه يقالُ له: جُب الحزن يدخلها قوم بأعمالهم فيطبق عليهم" [١٧٠]. **واتە: (لە جێگەیەکی هەرە خواری دۆزەخدا چەند تەنورێکی زۆر تەسك هەیە هەر کەسێکی تێ بکەویت ئەو جێگەی دێتەوە بەسەریدا و تەسك دەبێتەوە بە سەریەوە وەك چۆن ئاسنی کۆتایی ڕم تەسك دەکرێتەوە و ڕمەکەی تیا جێگیر دەکرێت، ئەو جێگەیە پێی دەوترێت: چاڵی غەم کەسانێك بە هۆی کردەوەکانیانەوە دەکرێنە ئەوێ و دێتەوە بەسەریانەوە و دادەخرێت).**

**عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ فەرموویەتی:** "إن جهنم لتُضَيّقُ على الكافر كتضيقِ الزُّج في الرُّمح "[١٧١]. **واتە: (دۆزەخ تەسك دەکرێتەوە بەسەر بێ باوەڕاندا وەك چۆن دەسك ڕم تەسك دەکرێتەوە بەسەر ڕمەکەدا). بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم باسە وتەکەی سوەیدی کوڕی غەفلە ﷺ دەهێنینەوە بەڵام پێویستە بزانین کە (سەنەدەکەی لاوازە) و تەنها بۆ زانیاریت دەیهێنین، دەفەرموێت:** ((إذا أراد الله أن يُنسيَ أهل النار جعل لكل واحدٍ تابوتاً مِن نار على قدره، ثم أُقفِلَ عليه بأقفالٍ من النارِ فلا يُضرَبُ مِنه عرِقٌ إلاّ وفيه مسمار من نارٍ ثم يُجْعَلُ ذلك التابوت في تابوت آخر من نار ثم يُقفل باقفالٍ من نارٍ ثُم يُضرمُ بينهما ناراً فلا يُرى أحدٌ منهم إنَّ في النّارغيرهُ فذلك قوله تعالى﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌۚ ﴾ (الزمـر: ١٦) وقوله تعالى ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأعراف: ٤١)))[١٧٢]. **واتە: (هەر کات خوا گەورە ویستی دۆزخیەکان لە بیر بکات هەموو یەکێکیان دەکرێنە تابوتێکی ئاگرەوە بە ئەندازەی خۆیان، پاشان بەچەند قوفڵ و داخەرێکی ئاگرین لەسەریان دادەخریت و لەناو تابوتەکەدا لە هەموو لایەکەوە بزماری ئاگرین هەیە و هەر جووڵەیەك بکات بەر بزمارێك دەکەوێت پاشان ئەو تابوتە دەکرێتە چەند تابوتێکی ترەوە و دادەخرێت و ئاگری تێ بەردەدرێت و ئەو کەسە وا**

---

[١٧٠] أخرجه: هناد (الزهد)(٢٢١) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن أبي شيبة (المصنف)(٣٤١٢٨).

[١٧١] أنظر: (شرح السنة) (٤٤١٥).

[١٧٢] أخرجه: ابن أبي شيبة (٧٢٦٣)، البيهقي (الشعب) (٥٣٩)، وفي (البعث) (٥٩٢، ٥٣٩)، وابو نعيم (الحلية) (١٧٦/٤). . وابن أبي الدنيا (صفة النار) (١١١)، والأصبهاني (سير السلف) (٣/ ٧٩٣) واللفظ له، وقال المنذري في (الترغيب)(٥٤٣١): اسناده حسن موقوفاً، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب) (٢١٧٥).

دەزانێت کە هەر ئەو لە دۆزەخدایە کەسی تری تیا نی یە ئەوەش مانای ئایەتەکەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿ لَهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحۡتِهِمۡ ظُلَلٌۚ . . ﴾ وە ئەو ئایەتەیترە کە دەفەرموێت﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٍۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾).

**٢٦- ڕوخسار و شێوەی دۆزەخیەکان دەگۆڕێت:**

ڕۆخساری ئەو دۆزەخیانە دەگۆڕێت کە هەردەم لە ناویا دەمێننەوە ئایەنەدەر عەبدولای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: ". . . فإذا اراد الله أن لايُخرجَ منها أحد غير وجوهَهُم وألوانهم ، فيَمُّر الرجل من المؤمنين فيقول: يارَبّ، فيقول : من أعرف رجلاً فليُخرجَهُ فينظرُ فلا يعرفُ أحداً، فيناديه الرجل: يا فلان أنا فلان : فيقول ماأعرف"[١٧٣].

واتە: (هەر کات خوای گەورە ویستی هیچ کەسێك لەوانە دەرنەکات (واتە: ئەواتەی کە بەردەوام تیایدا دەمێننەوە) ئەو کات خوای گەورە شێوە و ڕەنگی ئەو دۆزەخیانە دەگۆڕێت یەکێك لە باوەڕدارەکان کە بەلای دۆزەخدا دەڕوات و داوا دەکات و دەڵێت: ئەی خوای گەورە تکام لێ وەرگرە؟ وەخوای گەورەش دەفەرموێت: هەر کەسێك لە ئێوە یەکێکی لە ئەوانەی ناسیەوە با لە دۆزەخ دەری بکات بڕوادارەکەش تەماشا دەکات و هیچ کەسێکی تێدا نا ناسێت ئەو کات یەکێك لە دۆزەخییەکان بانگی لێ دەکات و دەڵێت: فلانە کەس من فلان کەسم؟ ئەویش دەڵێت: نات ناسم).

لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە کە هەندێکیان دەچنە سەر شێوەی کەمتیار وە هەندێکیان دەچنە سەر شێوە سەگ. وەك لە فەرموودەکەی ئیمام بوخاریدا (رحمه الله) هاتووە لە هەوڵدانی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ بۆ دەرهێنانەوەی ئازەری باوکی لە دۆزەخدا، لەو فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (. . قيل له: يا إبراهيم: أنظر ما وراءك (فيمسخَ الله اباه ضبعاً) فإذا هو بذيخٍ (أي: الضبع الذكر) مُلَطَّخٍ، فيؤخَذ بقوائمهِ ويُلقى في النار))[١٧٤]. واتە: (بە ئیبراهیم دەوترێت: تەماشای دواتەوەبکە و لەوێدا خوای گەورە

---

[١٧٣] أخرجه: الحاكم (٤/ ٥٨٧)وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، واللفظ له، وابن حبان (٢٥٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري .

[١٧٤] أخرجه: البخاري (٣٣٥٠).

شێوەی باوکی دەگۆڕێت بۆ شێوەی نێرە کەمتیارێکی بۆ گەن وقێزەون پاشان هەر چوار قاچی دەگیرێت و فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە).

وە هەندێك لە موسوڵمانە تاوان بارەکان شێوەیان دەگۆڕێتەوە سەر شێوەی سەگ، ئیبنو ئەبیل ئەوفا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الخوارج كلاب النار))[١٧٥]. واتە: (خەواریجەکان سەگەکانی ناو دۆزەخن).

وە ئیبنو ئەبیل ئەوفا ﷺ دەفەرموێت: "كنّا نسَمي اصحاب الأهواء: كلاب النار"[١٧٦]. واتە: (ئێمە کۆمەڵ و سەر لێ شێواوەکانمان ناو دەنا: سەگەکانی دۆزەخ).

هەندێکی تر لە دۆزەخیەکانی شێوەیان دەبێتە بەراز. ئەبولعالیە (رحمه الله) لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴾ (التين: ٥) دەفەرموێت: "في صورة خنزير"[١٧٧] واتە: (شێوەیان دەبێتە شێوەی بەراز). ئەبو هورەیرەش ﷺ فەرموویەتی: (شفاهم عند سُررَهم سودٌ زُرقٌ جُبنٌ (أي: عظيم البطن)مقبوحون)[١٧٨]. واتە: (لێویان شۆڕ دەبێتەوە تا ناوکیان و ڕوویان ڕەش دەبێت و چاویان شین دەبێت و ورگیان زل دەبێت و قێزەون دەبن).

ئەمەش وەك مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە دێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠٤) واتە: (لە ئاگردا دەسوتێن و دەبرژێن و شێوەیان شێوا و وقێزەون دەبێت).

**٢٧- هەردەم غەمبار و تەنگە نەفس دەبن:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾ (الزخرف: ٧٥). واتە: (سزا لەسەریان سووك ناکرێت و تەواو غەمبار و بێ ئومێد دەبن). وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (مريم: ٣٩) واتە:

---

[١٧٥] أخرجه: الطبراني (الكبير)(٨٠٤١، ٨٠٤٥)، وفي (الصغير)(٢/ ١٧٧)، وابن أبي شيبة (١٥/ ٣٠٧)، وابن ماجة (١٧٣)، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح ابن ماجة) (١٤٣)، (المشكاة)(٣٥٥٤).

[١٧٦] أخرجه: الطبراني (الكبير)(٨٠٤٣).

[١٧٧] أخرجه: ابن أبي حاتم – كما في (التخويف) (ص١٤١).

[١٧٨] أخرجه: البغوي (شرح السنة) برقم (٤٤١٧)، والخلال في (كتاب السنة) كما في (التخويف) (ص ١٣٦).

(ئاگاداریان بکەرەوە لەڕۆژی حەسرەت و داخ کاتێك کە بڕیاریان لەسەر دەدرێت بەڵام ئەوان لە دونیادا لە بێ ئاگایی و بێ باوەڕی دابوون).

و عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...یزدادُ أهل النار حُزناً إلى حُزنِهِمْ))[179]. واتە: (دۆزەخیەکان بەردەوام غەم و پەژارەیان زیاد دەکات). عەبدوڵای کوڕ ئەبی هوزەیل (تابعی) دەفەرموێت: "مافي جهنم أحدٌ يتنفس لارجلٌ ولا امرةٌ، حبسَ الله أرواحهم في اجوافهم وحبس انفاسهم في أجوافهم فذلك أشدُّ عليه من جهنم وما فيه "[180]. واتە: (هیچ کەسێکی دۆزەخی نەژن و نەپیاو ناتوانن هەناسە بدەن و خوای گەورە گیانیان لە دەمیاندا بەند دەکات وە هەناسەیان لە سنگیاندا بەند دەکات، ئەوەش سەختترە لایان لە ئاگری دۆزەخ). پێ دەچێت (والله أعلم) ئەویش لەبەر چڕی دوکەڵی ڕەشی دۆزەخەوە بێت خوا بەدوورما بکات لە ئاگری دۆزەخ.

**٢٨- دۆزەخیەکان کۆ دەکرێنەوە لەگەڵ بتەکان و شەیتانەکاندا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾ (الزخرف: ٣٦-٣٩).

سەعید جەریری (رحمه الله) سەبارەت بە مانای ئایەتەکە دەفەرموێت: "بلغني أن الكافر إذا بُعث يوم القيامة من قبرهِ شَفَع بشيطانهِ فلم يفارقه حتى يُصيّرُهما الله الى النار، فذلك حين يقول: ﴿ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴾"[181]. واتە: (بێ باوەڕەکاتێك زیندو دەکرێتەوە لە ڕۆژی کۆتایی دا دەکرێتە شەریك و هاوڕێی شەیتانەکەی

[179] البخاري: البخاري (٦٥٤٨)، ومسلم (٢٨٥٠).

[180] أخرجه : الدينوري في (المجالسة) برقم (١٥١٩) وقال محققه: اسناده واهٍ - واوردناه للعلم فقط.

[181] أخرجه: الطبري(التفسير)(٢٣٨٧٣)، والواحدي (٧٥/٤)، وعبد الرزاق-كما في (تفسير ابن كثير) (٢٦٣/٥) و (الدّرّ المنثور)(٧٢٣/٥)، (وتفسير القرطبي)(١٦/ ٧٩)، وابن أبي حاتم كما في (التخويف) لأبن رجب (١٠٩٢٥).

و لێی جیانا بێتەوە تا خوای گەورە هەر دووکیان دەخاتە دۆزەخەوە ئەویش ئەوکاتەیە کە دەڵێت: واتە: بەشەیتانەکەی دەڵێت: خۆزگە هەر دوولا بەوێنەی دووری ڕۆژ هەلات و ڕۆژ ئاوا لەیەك دوور دەبووین بەڕاستی خراپترین هاوڕێیت).

عەباسی جوشمیش (رحمه الله) دەفەرموێت: " إن الكافر إذا خرج مِن قبرِه وجد عند رأسِه مثل السرحة (أي: الشجرة الكبيرة) المحترقة شيطانة فتأخذُ بيده، فنقول: أنا قرينتك ادخل آنا وانت جهنم فذلك قوله تعالى ((يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ))"[١٨٢].

واتە: (بێ باوەڕ کاتێك لە گۆڕەکەی دێتەدەر دەبنێت شەیتانێك وەك درەختێکی گەورە سوتاو لای سەریەوەیەتی و دەستی دەگرێت، و بەبێ باوەڕەکە دەڵێت: من هاوڕێ تۆم من و تۆ هەردوو کمان بەیەکەوە دەچینە دۆزەخەوە. کە ئەوەش مەبەستی ئایەتەکەی خوایە کە دەفەرمویت: ﴿ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ﴾.

ئەبو سەعید خودری ﷺ دەفەرموێت: ((إذا بُعِث الكافر زُوِّجَ بقرينهِ مِن الشياطين فلا يفارقهُ حتى يصيره الى النار))[١٨٣]. واتە: (بێ باوەڕ کە زیندوو دەکرێتەوە و هاوتا شەیتانەکەی لێ ی جیا نابێتەوە هەتا دەخرێتە دۆزەخەوە).

ئیبنو ڕەجب (رحمه الله) دەفەرموێت: " وأخبر الله تعالى عن اختصام الكفار مع من كان معهم مِن الشياطين ومَنْ عبدوه مِن دون الله تعالى". واتە: (خوای گەورە باسی دەمەقاڵەی بێ بڕواکان لەگەڵ هاوتا شەیتانەکانیان وە لەگەڵ ئەوانەش کە پەرستویانن جگە لە خوا دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (الشعراء: ٩١- ٩٨). ومن جملة أنواع عذاب أهل النار فيها تلاعنهم و تباغضهم، وتبرؤ بعضهم مِن بعض، ودعاءُ بعضهم على بعضٍ بمضاعفة العذاب. . .

---

[١٨٢] أخرجه: ابن أبي حاتم انظر: (التخويف) الباب السادس عشر (ص: ١٠٩).

[١٨٣] أنظر: (الجامع لاحكام القرآن) للقرطبي (١٦/ ٨٠).

وحينئذٍ فلا يُبعد أن يُقرنَ كل كافرٍ بشيطانهِ الذي أضله وبصورة من عبده من دون الله مِن الحجارة "[١٨٤]. واتە: (دەرکەوت کە بەشێك لە سزاکانی ناو دۆزەخ ئەو دەمەقاڵەوە نەفرەت کردن و شەڕەجوێن و خۆبەری کردن لەیەکتری و دوعاکردن بەزیادکردن سزای یەکتر. . . کەوا بوو دوور نیە کە هەموو بێ باوەڕێك بکرێتە هاوتا لەگەڵ ئەو شەیتانەی کە گومڕاو سەرلێ شێواوی کردوە وەهەروەها لەگەڵ ئەوبتانەی کە پەرستویەتی و کرد ویەتیە هاوتای خوا).

**٢٩-گەورەترین سزا تەماشانەکردن و گفتوگۆ نەکردنیانە لەگەڵ خوای گەورە:**

**حافظ ئیبنو ڕەجەب** (رحمه الله) **دەفەرمویێت:** ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴾ (المطففين: ١٤- ١٧) **واتە: (گەورەترین سزای دۆزەخیەکان دوورخستنەوەیانە لە خوای گەورە، وە تورەیی و ڕقی خوایە لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت:** ((حجابهم عنه، ثم صليهم الجحيم، ثم توبيخهم بتكذيبهم به في الدنيا. . . )). **لێرەدا خوای گەورە سێ جۆر سزادانیان باس دەکات:**

**یەکەم: ناتوانن خوای گەورە ببینن و گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن.**

**دووەم: سزادانیانە بە دۆزەخ.**

**سێهەم: ئابڕوبردن و گازندەکردنیانە لەسەر بەدرۆخستنەوەیان بۆ ئاینە کەی خوا.**

**جەعفەری کوڕی سولەیمان** ﷺ **وتی: گوێم لێ بوو ئەبو عیمران ئەلجەوەنی دەیوت:** "إنَّ الله لم ينظر الى إنسانٍ قطّ إلا رحِمَهُ ولو نظر الى أهل النار لرحِمَهم ولكن قضى أن لا ينظر اليهم "[١٨٥]. **واتە: (خوای گەورە تەماشای هەر بەندەیەکی کرد بێت بەبەزەیی بووە بۆی. وە گەر تەماشای دۆزەخیەکانی بکردایە بەبەزەیی دەبوو بۆیان بەڵام بڕیاری ئەوەی داوە کە هەرگیز تەماشایان نەکات).**

---

[١٨٤] أنظر: (التخويف من النار)للحافظ ابن رجب (ص: ١١٠).

[١٨٥] أنظر: (التخويف)(ص: ١٥٨)، والأثر أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار)(٢٥٣).

**٣٠ – دۆزەخیەکان نەدەمرن و نە پشوو دەدەن:**

**خوای گەورە دەفەرمویێت:** ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٞ ﴾ (إبراهيم: ١٧). **ئیمـانی طـەبـری** (رحمه الله) **لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمویێت:** "يأتيه الموت مِن بين يديه ومن خلفه وعن يمينه وعن شماله ومن كل موضع من أعضاء جسده (وما هو بميت) لانه لاتخرج نفسه فيموت فيستريح ولا يحيا لتعلق نفسه بالحناجر. . . " تعلق نفسه عند حنجرتهِ، فلا تخرج من فيّه فيموت، ولا ترجع الى مكانها مِن جوفهِ فيجد لذلك راحة فتنفعَهُ الحياة "[١٨٦]. **واتـە: (لەهەر چوارلا و هەموو جێگە و ئەندامێکی جەستەیەوە مردن پێی دەگات بـەڵام نامرێت و ڕوحی دەرناچێت و پشوناداتن و ناژی و ڕوحی بەقوڕگیەوە بەندە).**

**ئیمامی موجاهید**(رحمه الله) **دەفەرمویێت: (ڕوحی هەڵواسروە بەقوڕگیـەوە نـە ئەوەیە لە قوڕگیەوە بێ تەدەر تا بمرێت وە نەئەوەشە بگەڕێتەوە جێگەی خۆی لە ناو جەستەدا تا پشوو بدات و ئەو ژیانەی سودی پێ بگەیەنێت).**

**ئیبنـو ڕەجـەب** (رحمه الله) **لـەمانای ئـەو ئایەتـەدا دەفـەرمویێت:** ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٞ ﴾ (إبراهيم: ١٧). والمعنى: " أنَّه يأتيه مثل شدّة الموت وألمهِ مِن كُلِّ جُزءٍ مِن جزاء بدنهِ حتى شعرهِ وظفره وهو مع هذا لاتخرج نفسه فيستريح "[١٨٧]. **واتە: (دۆزەخیەکان لە هەموو بەشێك لە بەشەکانی لاشەیانەوە وە لەهەموو تاڵەمو و نینۆکێکیانـەوە بەوێنـەی سـەختی و ئازاری ڕوح کێشانی پێ دەگات بەردەوام و لەگەڵ ئەوەشدا ڕوحی دەرناچێت تا پشوو بدات).**

**و عەبدوڵای کوڕی مەسعودیش** ﷺ **دەفەرمویێت:** ". . . . ويشهق أهل النار شهقه لوكان أحداً ميتاً مِن شهقهِ لماتوا". **واتە: (دۆزەخیەکان هەناسەی وا هەڵدەکێشن گـەر هـەر کەسێك هەناسـەی وا بـدات دەمرێـت بـەڵام ئـەوان نـامرن ئـەوەش مانـای ئـەو دوو ئایەتـە پیرۆزەیـــە:** ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا

---

[١٨٦] انظر: (التفسير) الطبري (١٥٦٣٢).

[١٨٧] انظر: (التخويف)(ص: ١٥٦).

شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ (غافر: ١٨) قوله تعالى ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (مريم: ٣٩) [١٨٨].

ئیمامی ئەوزەعیش لە بیلالی کوڕی سەعدەوە (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "تنادي النار يوم القيامة: يا نار احرقي، يا نار أشتفي، يا نار أنضجي، كُلي ولا تقتلي" [١٨٩]. واتە: (لە ڕۆژی کۆتاییدا ئاگری دۆزەخ دەنگ بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: ئاگر بیرژێنە، ئاگر بسوتێنە. . . . بخۆ بەڵام مەکوژە و مەمرێنە).

وە لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێین: خوای گەورە: هەزارەها جۆر سزای تری هەیە کەئێمە نایانزانین وەك ئیمانی موجاهید (رحمه الله) دەفەرموێت: " لأهل النار أنواعٌ مِن العذاب لم يطّلِع الله تعالى عليها خلقه في الدنيا "[١٩٠]. واتە: (بۆ دۆزەخیەکان جۆرەها سزای تریان هەیە کە خوای گەورە دروست کراوەکانی خۆی لە دونیادا پێ ئاشانا نەکردوون و نازانن).

## سوك نەکردنی سزاکان لە دۆزەخدا

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە دۆزەخیەکان لە ناو دۆزەخدا بە هیچ جۆرێك سزایان لەسەر سوك ناکرێت، وەکو دەفەرموێت: ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾ (النبأ: ٣٠) واتە: (بیچێژن تەنها هەر سزاتان بۆ زیادەکەین)، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ ﴾ (النحل: ٨٨) واتە: (سزایان لەسەر سزا زیاد دەکەین) لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴾(فاطر: ٣٦). واتە: (دۆزەخیەکان سزایان لەسەر سوك ناکرێت ئابەو جۆرە سزایی هەموو بێ بڕوایەك دەدەین)، بەڵکو خەڵکانی دۆزەخ هەموو هاوار دەکەن لەبەرپرسی دۆزەخ کە مالیکە داوا دەکەن تەنها یەك ڕۆژ سزایان لەسەر سوك بکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ

---

[١٨٨] أخرجه : نفس المصدر (ص: ١٦٩)، عن ابن أبي حاتم.

[١٨٩] أخرجه: أحمد بن منيع كما في (الاتحاف) (١٠١٤٦)، وابن أبي الدنيا(صفة النار)، (١٩٥)، وأبو نعيم (الحلية) (٥/ ٢٢١).

[١٩٠] انظر: (التخويف) (ص: ١٥٧).

فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾(غافر: ٤٩) واتە: (ئەوانەی لە دۆزەخدان بەدەرگاوان و هەڵسوڕێنەرانی دۆزەخ دەڵێن: ئێوە داوا بکەن لە خوای گەورە تەنها یەك ڕۆژ سزامان لەسەر سوك بكات).

عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ أهل النار ليدعون: يامالك، فيَدعَهُم أربعين عاماً، ثم يُردُ عليهم [إنكم ماكثون] فيدعون ربهم مثل الدنيا، فُيردُ عليهم [إخسئوا فيها ولاتكلمون] فلاينبسون عند ذلك وماهو إلاّ الزّفير والشهيق))[١٩١]. واتە: (دۆزەخیەكان داوا دەكەن و دەپاڕێنەوە و دەڵێن: ئەی مالیك (واتە: بەرپرسی دۆزەخ) ئەویش ماوەی چل ساڵ وەلامیان ناداتەوە و پاشان دەڵێن: ئێوە لێرە هەر دەمێننەوە پاشان دۆزەخیەكان بە ماوەی ڕۆژانی تەمەنی دونیا داوا دەكەن لە خوای گەورە پاشان خوای گەورە وەلامیان دەداتەوە و دەفەرموێت: بیدەگ بن تیایدا و هیچم لەگەڵدا مەڵین. ئیتر لە وە بەدوا هێچ ناڵێن، و هەر ناڵەونركە و ئاخ هەڵكێشانیان دەبێت).

## قەبارەی جەستەی دۆزەخیەكان

خەڵكان لەهەر تەمەنێك دا مردبن خوای گەورە لەتەمەنی سی وسێ ساڵیدا زیندوویان دەكاتەوە، لە ڕۆژی دواییدا. میقدادی كوڕی مەعدیەكروب ﷺ گێراویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما من أحدٍ يموت سقطاً ولاهرما وإنّما الناس فيما بين ذلك إلاّ بُعِثَ ابن ثلاث وثلاثين سنة. . . ومن كان من أهل النار عُظِمّوا وفُخِّموا كالجبال))[١٩٢]. واتە: (هەركەسێك بمرێت بەلەبارچوون لەسكی دایكی دا یاخود بەپیری، هەموو خەڵكانیش تەمەنیان هەر لەو نێوانەدایە، هەموو لە تەمەنی سی وسێ ساڵیدا زیندوو دەكرێنەوە، و ئەوانەیان كە دۆزەخین گەورە و زل دەكرێن وەك چیاكان).

---

[١٩١] أخرجه: ابن أبي شيبة (١٥٩٦٩)، والدينوري (المجالسة) (٢٢٩٣) وقال محققه: أثر صحيح، والحاكم (٢/٣٩٥)، البيهقي (البعث) (٥٩١).

[١٩٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٠/٦٦٣)، وقال المنذري في (الترغيب) (٦/٢٧٣) رواه البيهقي باسناد حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠/٣٣٤): اسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥١٢) اسناده صحيح، وانظر: (صحيح الترغيب)(٣٧٠١).

**خوای گەورە لاشەی هەندێك لە دۆزەخیەکان وا گەورە دەکات کە نێوانی هەردوو شانیان ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی سێ ڕۆژ دەبێت وەك ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی:** ((مابين منكبي الكافر مسيرة ثلاثة أيام للراكب المسرع))[193]. **واتە: (نێوان هەردوو شانی کافرێك لەناو دۆزەخ دا ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی سێ ڕۆژە بۆ ئەسپ سواری خێرا). لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((إنَّ غلظ جلد الكافر اثنان واربعون ذراعاً بذراع[194] الجبّار وإن ضَرُسه مثل أحد [وفخذه مثل البيضاء ]، وان مجلسهُ من جَهنم كما بين مكة والمدينة))[195] **واتە: (ئەستوری پێستی بێ باوەڕ لە دۆزەخدا چل ودوو گەزە بەگەزی پیاوێکی گەورە، وە کەڵبەکەی وەك کێوی ئوحود و ڕانی وەك کێوی بەیضاء دەبێت، شوێن دانیشتنەکەشی لەدۆزەخ دا وەك ماوەی نێوان شاری مەککەو مەدینەیە). لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت** ((وغلظ جلده مسيرة ثلاثة أيام))[196]. **واتە: (ئەستوری پێستەکەی ماوەی سێ ڕۆژە ڕێ ڕۆیشتن).**

**وە ماوەی نێوان گوێچکەی و سەرشان حەفتا ساڵ دەبێت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت** ((إنَّ بين شحمة أذن أحدهم وبين عاتقه مسيرة سبعين خريفاً تجري فيه أودية القيح والدم))[197]. **واتە: (ماوەی نێوان نەرمای گوێچکەی یەکێك لە دۆزەخیەکان هەتا سەر**

---

[193] أخرجه: البخاري (٦٥٥١)، ومسلم (٢٨٥٢، ٧١١٥).

[194] قال الحاكم (٤/٥٩٥): "(بذراع الجبار) أي: جبارٌ من جبابرة الأدمين ممن كان في القرون الأولى من كان أعظم خلقا وأطول أعضاءً وذراعاً من الناس "، وقال البيهقي (الأسماء والصفات) (ص: ٣٤٢) أي: " بذراع ذلك الجبار المعروف بطول الذراع وعظم الجسد "، وانظر: فتح الباري (١١/٥١٦).

[195] أخرجه: أحمد (٢/٣٣٤)، ومسلم (٢٨٥١)، والترمذي (٢٥٧٧، ٢٥٨١)، والحاكم (٤/٥٩٥) وصححه و وافقه الذهبي، وابن الحبان (٧٤٨٦) وقال محققه إسناده صحيح على شرطهما، وقال الحافظ في (الفتح) (١١/٥١٦) رواه البزار بإسناد صحيح.

[196] أخرجه: مسلم (٧١١٤) و(٢٨٥١) والترمذي (٢٥٧٩)، وابن الحبان (٧٤٨٧) وقال محققه إسناده صحيح.

[197] أخرجه: أحمد (٦/١١٧) رقم (٢٤٨٥٦) وقال محققه إسناده صحيح، والترمذي (٣٢٤١)، وأبو نعيم (الحلية) (٨/١٨٣)، وابن المبارك (الزهد) (ص: ٨٥)، وابن ابي الدنيا (صفةالنار) (١٨) والحاكم (٢/٤٣٦) وصححه و وافقه الذهبي، وقال المنذري(في الترغيب والترهب) (٥٤١٧) إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الترغيب) (٣٦٨٤) و(صحيح الترمذي) (٢٥٨٩) موقوفاً على ابن مسعود، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٦٥٢) حديث صحيح.

شانیان ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی حەفتا ساڵە و چەندها شیوی کێم و جەراعەت و خوێنی پیادەڕوات).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((...وغلظ جلده سبعون زراعاً...))(١٩٨) واتە: (ئەستوری پێستی حەفتا گەزە)، وە لە حارسی کوڕی ئوقەیشەوە ؓ گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . وإن من أمتي من سيُعَظّمُ للنار حتى يكون إحدى زواياها))(١٩٩) واتە: (. . . . . پیاوی وا هەیە لە ئومەتی من گەورە دەکرێت بۆ دۆزەخ تا گۆشەیەکی دۆزەخ بە تەواوی پڕدەکاتەوە). گەورەکردنی لاشەی بێ باوەڕەکان بۆ ئەوەیەکە دۆزەخیان پێ پڕ بکرێتەوە وە سزایان زیاد بێت، وەك ئەبوهورەیرە ؓ دەفەرموێت ((يُعظمون لتمتلىء منهم النّار وليذوقوا العذاب))(٢٠٠). واتە: (گەورە دەکرێت تا دۆزەخیان پێ پڕ دەکرێتەوە و سزای گەورە بچێژن).

## خواردنی دۆزەخیەکان و یەکەم شتێك کە بۆیان ئامادەدەکرێت لە دوای چوونە ژوورەوەیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴾ (الواقعة: ٥١ – ٥٦) واتە: (پاشان ئێوە ئەی گومڕاو بەدرۆزانەکان لە درەختی زەقنەبووت دەخۆن و ناوسکتانی لێ پڕدەکەن وئاوی گەرمی کوڵاوی بەسەردا دەکەن بەپەرۆشەوە وەك وشترە زۆر تینوەکان ئا ئەوەیە میوان داریتان لە ڕۆژی کۆتاییدا). (والنزلُ: هو مايُعدُّ للضيف عند قدومِهِ). واتە: (نوزل: ئەو خواردنەیە کە بۆ میوان ئامادەدەکرێت).

---

(١٩٨) أخرجه: أحمد (٢/٣٨٢)، والترمذي (٢٥٩١)، والحاكم (٤/٥٩٥) وصححه و وافقه الذهبي، وابن ابي عاصم (السنة)(٨١١)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) برقم (١١٠٥)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٨٢).

(١٩٩) أخرجه: ابن ماجة (٤٣٢٣)، ابن ابي شيبة (٣٤١٣٩)، والحاكم (٧١/١) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي وصححه الشيخ الألباني (في صحيح ابن ماجة) (٣٤٩٠).

(٢٠٠) أخرجه: البغوي في (شرح السنة) (٤٤١٣) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح.

**ئیبنو ڕەجەب** (رحمه الله) **دەفەرمویت:** " فدلت هذه الآيات على ان أهل النار يُتحفون عند دخولها بالأكل من شجرة الزقوم، والشرب من الحميم، وهم إنّما يساقون الى جهنم عطاشاً كما قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴾ (مريم: ٨٦) "[٢٠١] **واتـه: (ئـەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی دۆزەخیەكان دوای چوونیان بۆ دۆزەخ یەكەم خواردنیان لەدرەختی زەقنەبووت دەبێت وە خواردنەوەیان لە ئاوی گەرمی بەكوڵ دەبێت چونكە دۆزەخیەكان زۆر تینون لە كاتی بەڕێ كردنیان بۆ ناو دۆزەخ وەك خوای گەورە دەفەرمویت:** ﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴾).

**ئیمامی موجاهید** (رحمه الله) **دەفەرمویت:** " (ورداً) أي: منقطعةٌ أعناقهم عطشاً"[٢٠٢] **واتە: (دۆزەخیەكان كە دەبرێن بۆ دۆزەخ زۆر تینوییانەوە قورگیان وەختە لەت ببێت لە تینویەتیدا). وە لە فەرموودە كەدا پێغەمبەر ﷺ كەباس لە لێپرسینەوەی جوولەكەو گاورەكان دەكات لە گۆڕەپانی مەحشەردا لەوێدا خوای گەورە پێیان دەفەرمویت:** ((ماذا تبغون؟ فيقولون: عطشنا ربنا فاسقنا فيشار إليهم ألا تردون (أي: ألا تشربون)، فيحشرون الى جهنم كأنّها سرابٌ يُحطّمُ بعضها بعضاً فيتساقطون في النار))[٢٠٣]. **واتـه: (چیتان دەوێت؟ ئەوانیش دەڵێن: پەروەردگارمان تینوییمانە ئاومان بدەرێ؟ شوێنێكیان بۆ دەست نیشان دەكرێت و پێیان دەوترێت: بۆ ناچن لەوێ ئاو بخۆنەوە، پاشان هەموو بەرو دۆزەخ دەڕۆن و لەدوورەوە وەك ڕووبارێكی شەپۆل دار دەیبینن و كەنزیكی دەبنەوە هەموو تێكرا دەكەونە ناودۆزەخەوە).**

**وەحەسەنی بەصریش** (رحمه الله) **دەفەرمویت:** " ماظنك بقوم قاموا على أقدامهم خمسين الف سنة لم يأكوا فيها أكلةً ولم يشربوا فيها شربة حتى انقطعت أعناقهم عطشاً و احترقت اجوافهم جوعاً ثم انصرف بهم الى النار فيُسقون من عينٍ آنية قدآن حرها واشتد نضُجها"[٢٠٤] **واتـه: (گومانت چۆنە بەكەسانێك ماوەی پەنجا هەزار ساڵ بەپێوە وەستاون و خواردنێكیان**

---

[٢٠١] أنظر: (التخويف) (ص: ١٦٠).

[٢٠٢] أخرجه: البخاري (٢٢)، ومسلم (١٨٣).

[٢٠٣] أخرجه: ابن ابي الشبة (المصنف) (٣٤١٦٧)، والطبري (التفسير) (٩٦/١٦).

[٢٠٤] أخرجه: الدينوري (المجالسة) (١٦١٣) ونقله ابن رحب في (التخويف) (ص: ١٦٠).

نەخواردوە و تەنانەت کەمێك ئاویشیان نە خواردۆتەوە بۆیە قوڕگیان لە لەت بوو لەتینویەتیدا و ناوسکیان سوتاوە لە برسێتی دا و پاشان بەرەو دۆزەخیان دەبەن ولەوێ ئاوێکی بۆگەنی زۆر گەرمی بەکوڵیان دەرخوارد دەدەن).

**دۆزەخیەکان خواردنەکانیان نەك سودیان پێ ناگەیەنێت بەڵکو زیانیان پێ دەگەیەنێت وە سیفەتی خواردنەکانیان بەم جۆرەیە:**

**١-خواردنی ناو دۆزەخ خاوەنەکەی تێر ناکات و سودی پێ ناگەیەنێت و قەڵەویان ناکات:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ۝٦ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ﴾ (الغاشية: ٦ – ٧). واتە: (تەنها گیایەکی دڕکاوی وشکیان دەرخوارد دەدرێت نەتێریان دەکات و نەپێی قەڵەو دەبن).

**٢- ئەو خواردنانە زیانیان پێ دەگەیەنێت و ناو سکیشیان دەکوڵێنێت:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ۝٤٣ طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ ۝٤٤ كَٱلۡمُهۡلِ يَغۡلِي فِي ٱلۡبُطُونِ﴾ (الدخان: ٤٣ – ٤٥)، (والمهل: كل شيء اذبته من نحاس وغيره). واتە: (درەختی زەقوم خواردنی تاوانبارانە و لە ناو سکیاندا دەکوڵێت وەك زیو ومسی تواوەیە).

لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ دەفەرموێت: ((أنّه إذاب فضة من بيت المال [فجعلت تتلون ألواناً] ثم أرسل إلى أهل المسجد: من احب أن ينظر إلى المهل فلينظر إلى هذا))[٢٠٥].

واتە: (جارێکیان ئیبنو مەسعود ﷺ هەندێ زیوی توانەوە لە زیوەکانی (بيت المال) پاشان هەموو خەڵکی مزگەوتی بانگ کرد، و پێی وتن هەرکەسێك پێی خۆشە (مهل) ببینێت با تەماشای ئەم مسە تواوەیە بکات هەموو تەماشایان کرد و چەند ڕەنگێکی دەنواند).

---

[٢٠٥] أخرجه: ابن هشام (السيرة)(٢٥١)، والطبراني (الكبير) (٩٠٨٢)، والطبري (التفسير) (٧٩/٢٥).

**٤- خواردنەکانیان دڕکاویە وردناکرێت و بۆشیان قوت نادرێت:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾(المزمل: ١٣). ئیبنو عەباس ﷺ لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت ((الشوك يأخذ بالحلق لايدخل ولايخرج))[٢٠٦]. واتە: (خواردنێکی دڕکاویان هەیە کە دەیکەنە ناو دەمیانەوە ودڕکەکانی لە قورگیان دەگیرێت نەدەچێتە خوار و نەدێتە دەرەوە). وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴾ (الغاشية: ٦). ئیبنو عەباس ﷺ لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: " الضريع: نبتٌ ذو شوكٍ لاطيءٍ بالأرض فإذا هاج سمي ضريعاً"[٢٠٧]. واتە: (ئەوان تەنها خواردنی (الضريح) یان هەیە. وە (الضريع)یش: گیایەکی دڕکاویە و دڕکەکانی لکاوە بەزەویەوە کە ووشك بوو ئەو جار پێی دەوترێت (ضريع). وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ ﴾ (إبراهيم: ١٧) (أي: لايستطيع ابتلاعه لشدة كراهته و نتنه). واتە: (بەهیچ جۆرێك ناتوانێت قوتی بدا و بەهۆی ناخۆشی و بۆگەنی نەکەیەوە)، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴾ (الكهف: ٢٩). واتە: (گەر هاوار بکەن بۆ ئاو ئاوێکیان دەردخوار دەدرێت وەك مسی تواوەیە کەنزیك دەگرێتەوە لە دەموچاویان، هەمووی دەبرژێنێت لە ڕاستیدا خراپترین جێگەو خواردنەوەیان هەیە).

**٥-خواردنی دۆزەخیەکان بۆنی زۆر ناخۆش و قێزەون و تاڵە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾ (الصافات: ٦٤ – ٦٥). واتە: (درەختی زەقنەبووت درەختێکە لە بنی دۆزەخەوە بەرز بۆتەوە و هاتووەتە دەر سەری درەختەکە وەکو سەری شەیتانەکانە).

---

[٢٠٦] أخرجه: ابن ابي الدنيا (صفة النار) برقم (٨٣)، والطبري (التفسير) (٢٩/٨٥)، والحاكم (٢/٥٠٦) وصححه، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب) (٢١٦١).

[٢٠٧] أنظر: (تفسير الطبري) (٣/١٣٠).

وەدرەختی (زقوم) درەختێکی نەفرەت لێکراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾(الإسراء: ٦٠). وە ئەو درەختەش زۆرتاڵە.

لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لو أنَّ قطرة من الزقوم قُطرت في الارض لافسدت على أهل الارض معيشتهم، فكيف بمن ليس له طعام غيرة)). واتە: (گەر دڵۆپێك لە زەقوم بکەوێتە سەر زەوی ژیانیان لێ تاڵ دەبێت، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە لەو خواردنە زیاتر هیچی تری نی یە).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لو أنَّ قطرة من الزقوم قطرت في [بحار الدنيا] لامرَّت على أهل الارض عيشهم))[٢٠٨]. واتە: (گەر دڵۆپێك لە زەقوم بکرێتە ناو دەریاکانی زەویەوە ژیان لە هەموو سەر زەوی تاڵ دەکات).

هەندێکی تر لە دۆزەخیەکان بەردو پارچە ئاگریان دەرخوارد دەدرێت لەسەر تاوانی سواڵکردن و خواردنی ماڵی بێ باوك:

١ - خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾(النساء: ١٠)ی واتە: (ئەوانەی ماڵی بێ باوك هەتیوو دەخۆن بەستەم ئەوانە ئاگر دەکە نەناوسکیان و دۆزەخیان پێ دەچێژرێت).

٢- ئوم و سەلەمە (رضي الله عنها) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان الذي يأكل أو يشرب في آنية الذهب أو الفضة إنمّا يُجرجر في بطنه نارجهنم))[٢٠٩]. واتە: (ئەوەی دەخوات یان دەخواتەوە لە قاپ و پەرداخی ئاڵتون و زیودا ئەوە ئاگری دۆزەخ دەشلەقێنرێت بە ناوسکیدا).

---

[٢٠٨] أخرجه: أحمد (١/١٣٠) رقم (٣١٣٦) و (٢٠٧٣٥) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح على شرطهما، و الطبري (التفسير) (٢٦٤٣)، والترمذي (٤٣٢٥) وابن ماجة (٤٣٢٥) والطبراني (الكبير) (١١٠٦٨)، والحاكم (٢/٢٩٤) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، والطيالسي (٢٦٤٣) وابن حبان (٧٤٧٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، ووصححه البغوي في (مصابيح السنة) رقم (٤٤١١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٥٢٥٠) والمشكاة (٥٦٨٣)، و(ضعيف الترغيب) (٢١٥٩).

[٢٠٩] أخرجه: البخاري (٦٣٢)، ومسلم (٢٠٦٥) وللفظ له.

٣- (حبشي بن جنادة ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((. . . من سأل الناس [من غير فقرٍ] ليثري به ماله كان خموشاً في وجهه ورضفاً [ملهبة] (اي: حجارة محماةً) يأكله من جهنم، فمن شاء فليقلل من شاء فليُكثِر))[٢١٠]. واتە: (ئەوەی داوا لە خەڵکی دەکات و سواڵ دەکات بێ ئەوەی هەژار بێت تەنها بۆ ئەوە داوا دەکات کە سامانەکەی پێ زیاد بکات ئەو کارەی دەبێتە ڕنینەوەی ڕوومەت ودەم و چاوی و دەبێتە بەردی گەرمی گڕگرتوو کەدەیخوات لەدۆزەخدا جا هەر کەسێك دەیەوێت بازیادی بکات یان کەمی بکات).

## خواردنەوەی دۆزەخیەکان

دۆزەخیەکان چوار جۆر خواردنەوەیان هەیە:

**١-حەمیم:** ئاوی گەرمی بەکوڵە، ئەوەی ئەو ئاوە بخواتەوە دەم و چاوی دەبرژێنێت و ڕیخۆڵەی پارچە پارچە دەکات. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ﴾(الكهف: ٢٩). وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾(محمد: ١٥) واتە: (خراپترین خواردنەوەیان پێ دەدرێت ئەویش ئاوی گەرمی بەکوڵە وەك مس و زیوی تواوەیە و ڕوویان دەبرژێنێت وە ڕیخوڵەیان پارچە پارچە دەکات). وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ﴾(الدخان: ٤٨) وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ﴾(الحج: ١٩ – ٢٠) واتە: (سزا دەدرێن و ئاوی گەرمی بەکوڵیان بەسەردا دەکرێت و پێست و ناوسکیان دەتوێتەوە).

عەبدولای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: " إنَّ الحميم ليصَبَ على رؤوسهم فينفذ الحميم حتى يخلص إلى جوفه [فيسلت ما في جوفه] حتى يمرق من قدميه وهو الصهر ثم

---

[٢١٠] أخرجه: ابن خزيمة (٣/ ١٠٠)، والترمذي (٦٥٣)، والطبراني (الكبير) (٣٣٩١)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٨٠٢-٨٠٦).

یُعاد کما کان "[٢١١]. واتە: (ئاوی کوڵای زۆر گەرم دەڕژێت بەسەر دۆزەخیەکاندا و دەچێتە ناو سکیانەوە و هەموو ناو سکیان دا دەماڵێت تا لە هەر دوو قاچیانەوە دەردەچێت ئەویش مانای توانەوەیە و پاشان وەکو خۆیان لێ دەکرێتەوە و ئەو سزایە بۆیان بەردەوام دەبێت).

ئیبنو ڕەجب (رحمه الله) دەفەرمویت: "وقد دل القرآن على انهم يأكلون من الزقوم حتى تمتلئ منها بطونهم فتغلي في بطونهم كما يغلى الحميم (وهو الماء الذي قد أنتهى حرّهُ) ثم بعد أكلهم منها يشربون عليه (مزاجاً) من الحميم شربُ الهيم قال قتادة: الهيم: هو داء يأخذُ بالابل فلا تروى ابداً حتى تموت فكذلك أهل جهنم لايروون من الحميم ابداً. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ﴾ (الكهف: ٢٩)" واتە: (قورئان بۆمان باس دەکات: کە دۆزەخیەکان زەقووم دەخۆن تا تەواو ناوسکیانی لێ پڕدەکەن و هەموو ناوسکیان دەکوڵێنێت، پاشان تێکەڵەیەکی ئاوی بەکوڵ بەسەریدا دەخۆنەوە وەکو ئەو وشترانەی کە توشی تینویەتی هاتوون کە پێی دەوترێت (الهیم)).

قەتادە ﷺ دەفەرمویت : ((الهیم) دەردێکە تووشی وشتر دەبێت و هەرگیز تێر ئاو نا بێت تا دەمرێت). کەواتە دۆزەخیەکانیش بەو جۆرەیان لێ دێت و هەرگیز تێر ئاو نابن و بەردەوام هەر تینون. خوای گەورەش دەفەرمویت:

﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ﴾ (الكهف: ٢٩). سەعدی کوڕی جوبەیر (رحمه الله) لە مانای ئەوئایەتەدا دەفەرمویت: "دۆزەخیەکان برسیان دەبێت و لە تاو برسیەتی هاوار دەکەن و دەرختی زەقوومیان فریا دەخرێت و لێی دەخۆن تا دەم و چاویان دادە ماڵێت لە دوای تەواو بوونی ئەو خواردنەیان تینویان دەبێت و هاواردەکەن. و ئاوی گەرمیان بۆ دێنن وەك مسی تواوە کە نزیکی دەکەنەوە لە دەمیان هەموو دەم و چاویان دەسوتێنێت و ناوسکیان دادەماڵێت، وە پاشان بەچەکوشی ئاسن بەسەریاندا دەکێشرێت و هەموو پارچەیەکی جەستەیان بەجیا دەکەوێتە خوارەوە و ئەو کاتە هاوار و باوکە

---

[٢١١] أخرجه: الترمذي (٢٥٨٢)، و ابن المبارك (الزهد) (٨٩، ٣١٢)، والحاكم (٣٨٧/٢) وصححه و وافقه الذهبي، والبيهقي (البعث) (٥٧٩)، وحسنه كلّ من الأرناؤوط في (شرح السنة) (٤٤٠٦)، والشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٤٧٠)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٧٩).

ڕۆدەکەن ". خوای گەوەر دەفەرمویێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴾ (الصافات: ٦٨) واتە: (لە دوای خواردنی زەقوم و خواردنەوەی ئاوی بە کوڵ دەیانگێڕنەوە بۆ ناو دۆزەخ). ئەمەش بەڵگەیە کە ئاوە بەکوڵەکە لە دەرەوەی ئاگر و ئەوانە. وەك ووشترە تینویەکان دەبرێن ولەو ئاوە گەرمە دەخۆنەوە و پاشان دەیانگێڕنەوە بۆ ناو دۆزەخ، وە بە بەڵگەی ئایەتەکەی تریش کە دەفەرمویێت: ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴾ (الرحمن: ٤٣ — ٤٤) واتە: (ئەوە ئەو دۆزەخەیە کە زاڵم و ستەمکارەکان بەدرۆیان دەزانی، ئەوان بەردەوام لە هاتوو چۆدان لە نێوان دۆزەخ و ئاوەگەرمەکەدا. ئەمەش وتەی قەتادە و ئیبن جوریجە)[٢١٢].

٢- **صەدید**: کێم و جەراعەت، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾ (إبراهيم: ١٦). واتە: (ئەوانە دۆزەخیان چاوەڕێ یە و ئاو و کێم و جەراعەتیان دەدرێتی). موجاهید ﷺ دەفەرمویێت: (القيح والدم). واتە: (ئاوی جراعەتی تێکەڵ بەخوێن یان دەدرێتی). قەتادە ﷺ دەفەرمویێت: "مايسيلُ من بين لحمه وجلده وقال تعالى (يتجرّعُهُ) اي يتحسّاه (ولا يكادُ يُسيغُهُ) أي لايكاد يزدرِدُه من شدّة كراهيته، وهو يسيغهُ من شدّة العطش"[٢١٣]. واتە: (ئەو ئاوەیە کە لەنێوان گۆشت و پێستیان دێتە خوار وە خوای گەوەر دەفەرمویێت: (يتجرّعه) واتە: بەزەحمەت بۆی دەخورێتەوە وە دەفەرمویێت: (ولايكاد يسيغه) واتە: زۆر بە ناڕەحەتی و ئازار بۆی دەخورێتەوە وە ناچارن چونکە زۆر تینوویانە). لە فەرموودەکاندا هاتووە کە ئەو (کێم و جەراعەتە) ئارەق و گوشراوی دۆزەخیەکانە لەگەڵ قوڕاوی خەبال کە بەشێوەی ڕووبارو چاووگە، ئەمەش لەم فەرموودانەدا دەردەکەوێت: جابر ﷺ دەفەرمویێت: ((. . . قالوا يارسول الله و ما طينةُ الخبال؟ قال: عرقُ أهل النار أو عصارة أهل النار))[٢١٤]. واتە: (وترا: ئەی پێغەمبەر ﷺ قوڕاوی خەبال چیە؟ فەرمووی: ئارەق و گوشراوی دۆزەخیەکانە). لە ڕیوایەتێکی تردا

---

[٢١٢] أنظر: (التخويف من النار) لابن رجب الحنبلي (ص: ١١٧).

[٢١٣] أنظر: (تفسير الطبري) (٨/٢٥٦).

[٢١٤] أخرجه: مسلم (٢٠٠٢)، وأحمد (٣/٣١٣)، والنسائي (٥٧٠٩)، وابن ماجة (٣٣٧٧).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قالوا ومارَدغةُ الخبال؟ قال: عصارة أهل النار))[٢١٥]. واتە: (وترا: ئەی پێغەمبەر ﷺ قوڕاوی خەبال چیە؟ فەرمووی: شەربەتاو وگوشراوەی دۆزەخیەکانە).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((. . . من عين خبال. قيل وما عين خبَال؟ قال: ((صديد أهل النار))[٢١٦]. واتە: (ئەوان لە چاوگی خەبالیان دەدرێتی. وترا: ئەی چاوگی خەبال چیە؟ فەرمووی. کێم و جەراعەتی دۆزەخیەکانە).

((. . . قيل: وما طينة الخبال يارسول الله؟ قال: صديد أهل النار))[٢١٧]. (وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ئایا قوڕاوی خەبال چیە؟ فەرمووی: جەراعەتی دۆزەخیەکانە).

لەڕیوایەتێکی تردا بە عەبدوڵای کوڕی عەمریان ﷺ وت: : "وما نهر الخبال: قال: نهر يجري من صديد أهل النار"[٢١٨]. واتە: (ئایا ڕووباری خەبال چیە؟ وتی: ڕووبارێکە کێم و جەراعەتی دۆزەخیەگان).

وە لەڕیوایەتێکی (لاواز)دا هاتووە: ((وما نهر الغوطةِ؟ قال: ((نهر يخرج من فروج المومسات يؤذي أهل النار نتنُ فروجهم))[٢١٩] واتە: (وترا: ڕووباری غوطە چیە؟ فەرمووی: ڕووبارێکە لە داوێنی ئافرەتە زیناکارەکان دەردەچێت، و هەموو دۆزەخیەکان ئازار دەدەن بە هۆی بۆگەنی داوێنیانەوە).

ئەو ڕووباری کێم و جەراعەتەش زیاتر بۆ ئەوانەیە مەی و ئارەقیان خواردووەتەوەو تۆبەیان نەکردووە تا مردن وە بۆ خۆبەزلزانەکان، وەك جابر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان على الله عهداً لمن شرب المسكرات ليسقيه من طينة الخبال))[٢٢٠].

---

[٢١٥] أخرجه: أحمد (٢/١٧٨)، والنسائي (٨/٣١٧)، وابن ماجة (٣٣٧٧) اللفظ له، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٧٢٢).

[٢١٦] أخرجه: أحمد (٦٧٧٣) وقال محققه: صحيح.

[٢١٧] أخرجه: ابو داود (٣٦٨٠)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٠٣٩).

[٢١٨] أخرجه: الترمذي (١٨٦٢)، والحاكم (٤/١٤٦) وصححه و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٢٣٨٣).

[٢١٩] أخرجه: ابن حبان (٥٣٤٦) وقال محققه: إسناده ضعيف.

[٢٢٠] أخرجه: مسلم (٢٠٠٢).

واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە ئەوانەی ئارەق و سەرخۆش کەرەکان دەخۆنەوە دەبێت قوڕاوی خەباڵ بکاتە خواردنەوەیان). وە عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يحشر المتكبرون يوم القيامة. . . يُسقَونَ من عصارة أهل النار طينة الخبال))[٢٢١]. واتە: (خۆبەزل زانەکان. . . خواردنەوەیان گوشراوی دۆزەخیەکانە واتە: شەربەتاوی قوڕاوی خەباڵە).

٣- غەسساق: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾(النبأ: ٢٤ – ٢٥) واتە: (دۆزەخیەکان لە دۆزەخدا ئاو وشەراب نانۆشن بەڵکو ئاوی گەرمی بەکوڵ و غەساق خواردنەوەیان دەبێت).

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴾ (ص: ٥٧ - ٥٨) واتە: (دۆزەخیەکان با بچێژن لە ئاوی گەرم و غەساق وچەندەها شتی تریش لەو جۆرە).

لەڕیوایەتێکدا ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لو انَّ دلواً من غساق –في رواية [من غسلين] يُهراقُ في الدنيا لانتن أهل الدنيا))[٢٢٢] واتە: (گەر سەتڵێکی (غەساق) یاخود (غسلين) بڕژێنە سەر زەوی هەموو دونیا بۆگەن دەکەن).

عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دوو ڕوونکردنەوەی هەیە لەسەر ئەم وشەیە:

یەکەمیان: - دەفەرموێت: "الغساق: مايسيل من بين جلد الكافر ولحمه "[٢٢٣]. واتە: (غەساق بریتیە لەوەی دەڕژێت لە نێوان پێست وگۆشتی بێباوەڕە دۆزەخیەکان).

---

[٢٢١] أخرجه: أحمد (٦٦٧٧) وقال محققه: إسناده حسن، والبخاري (الأدب) (٥٥٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٤٣٤).

[٢٢٢] أخرجه: أحمد (١١٢٣٠) وقال محققه حسن لغيره، والترمذي (٢٥٨٤)، والطبري (التفسير) (١٧٨/٢٣)، والحاكم (٦٠٦/٤) وصححه و وافقه الذهبي، وابو يعلى (١٣٨١)، والبيهقي (البعث) (٥٦٦)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترمذي) (٢٦٢/١)، (المشكاة) (٥٦٨٢).

[٢٢٣] أخرجه: هناد (الزهد) (٢٨٩) من قول عطية وقال محققه: اسناده صحيح.

دوومیان: - دەفەرموێت: الغساق: الزمهرير البارد أو(الشديد البرد))[٢٢٤] واتە: (غەساق بریتیە لە شارابێکی زەمهەریری زۆر زۆر سارد) و بەڵگەش ئایەتەکەی خوای گەورەیەکە دەفەرموێت: ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾ (النبأ: ٢٤ – ٢٥) لەو ئایەتەدا ووشەی (غەساقی) لە وشەی (برد)جیاکردەوە وەك چۆن وشەی (الحميم)ی لە وشەی (الشراب)ی جیاکردەوە. ئیمامی طەبری (رحمه الله) دەفەرموێت: "هوالسائل من الزمهرير في جهنم الجامع شدّة برده النتن" واتە: (ئاوی شلی زەمهەریرە لە دۆزەخدا کە زۆر ساردە وە زۆر بۆگەنە. وەعەبدولای کوڕی عومەریش ﷺ فەرموویەتی: "الغساق: " القيح الغليظ ". واتە: (غەساق: بریتیە لە کێم و جەراعەتی زۆر خەست و ئەستور).

وەکەعبیش فەرموویەتی: "غساق عينٌ في جهنم يسيل إليها حمة (أي: السم) كل ذات حمة من حيّة وعقرب وغير ذلك فيستنقع، فيؤتى بالآدمي فيغمس فيها غمسة واحدة فيخرج وقد سقط جلده ولحمه عن العظام "[٢٢٥] واتە: (چاوگێکە لە دۆزەخدا ژەهری هەموو مار و دووپشك و خاوەن ژەهرەکانی ناو دۆزەخی بۆ دێت و تیایدا کۆ دەبێتەوە، و یەك لە دۆزەخیەکان دەهێنن و تیایدا هەڵی دەکێشن و دێتەدەرەوە گۆشت و پێستی داماڵدراوە و تەنها هەر ئێسکەکانی ماوە).

**٤- ئاوی ڕەش و پڕ لەخلتە و تواوە:**

خواو گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴾(الكهف: ٢٩) سەرەت بەمانای ئەم ئایەتە ڕیوایەتێکی (لاواز) هاتووە ئێمە دەیهێنین بۆ زیاتر ئاشنابوون ئەویش ڕیوایەتەکەی ئەبو سەعیدی خودریە ﷺ کە دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کەفەرموویەتی: ((كعُكر الزّيت فاذا قُرِّب الى

---

[٢٢٤] أخرجه: هناد (الزهد) (٢٩٠) من قول مجاهد وقال: اسناده صحيح.

[٢٢٥] أنظر: (التخويف من النار) لحافظ ابن رجب (ص: ١٢١)، و(تفسير الطبري) (٢٧٩٤٥ _٢٧٩٥٧) وقول المنذري في (الترغيب) تحت الحديث رقم (٥٤٠٣).

وجهِهِ سقطت فروةُ وجهه فيه))[٢٢٦] . واتە: (وەك خڵتەی ڕۆن وایە كە نزیك دەكرێتەوە لە ڕوخساری پێستی هەموو دەم و چاوی دادەماڵێت).

عەبدولاَی كوڕی عەباس ﷺ فەرموویەتی: "(كالمهل): غليظٌ كدردي الزيت (أي: ما يبقى في اسفله)" وفي رواية [أسودكمهل الزيت][٢٢٧] . (المهل) واتە: (خڵتەی ژێركەوتوی ڕۆن- لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت: ڕەشە وەك خڵتەی ڕۆن). وەلە دۆزەخدا چەندەها ڕووبارو خواردنەوەی بۆگەن و زیان بەخش و قێزەونتری تێدایە خوا پەنامان بدات بەڕەحم و سۆزی خۆی ئامین.

ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: "[غيٌّ وآثامٌ ] نهران في أسفل جهنم يسيل فيهما صديدُ أهل النار"[٢٢٨] واتە: ([غيٌّ وآثامٌ ] دوو ڕووبارن لە خوارەوەی دۆزەخن و هەموو جەراعەتی دۆزەخیەكانی تێدا كۆدەبێتەوە).

وەعەبدولاَی كوڕی مەسعودیش ﷺ دەفەرموێت: "[الغيٌّ] نهر حميمٍ في النار يُقذفُ فيه الذين يَتَّبِعُونَ الشهوات "[٢٢٩] واتە: ([الغيٌّ] ڕووبارێكی ئاوی بەكوڵی گەرمە لە ناو دۆزەخدا و ئەوانەی تێ فڕی دەدرێت كە شوێن ئارەزواتی خۆیان كەوتوون).

---

[٢٢٦] أخرجه: أحمد (٣/٧١)، والترمذي (٢٥٨١٩)، وضعفه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٥٦٧٨).

[٢٢٧] اورده: ابن رجب في (التخويف) (ص: ١٢٤)، و(الطبري) في (التفسير) (١٧٣٦٩- ١٧٣٧٢)، وهناد (الزهد) (٢٨٤) وقال محققه: اسناده ضعيف.

[٢٢٨] أخرجه: ابن المبارك (زوائد الزهد) (ص: ٨٦)، وابن ابي الدنيا (صفةالنار) (٢٥).

[٢٢٩] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩١٠٦- ٩١١٤)، والطبري (التفسير) (١٦/٧٥) والبيهقي (البعث) (٤٧١)، وابن ابي الدنيا (صفة النار) (ص: ٣٨)، وقال الهيثمي في(المجمع) (١٠/٢٩٠): ورجاله رجال الصحيح.

# پۆشاکی دۆزەخیەکان

هەموو دۆزەخیەکان پۆشاکەکانیان لە ئاگرە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ ﴾(الحج: ١٩) واتە: (ئەوانەی کە بێ باوەڕ و دۆزەخین پۆشاکی ئاگریان بۆ بڕاوە و دروست کراوە). ئیبراهیمی تەمیم (رحمه الله) هەرکات ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە دەیووت: "سبحان من خلق من النار ثياباً" واتە: (پاکی و شکۆمەند بۆ ئەو خوایەی کە پۆشاکی لە ئاگر دروست کردووە). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾(إبراهيم: ٥٠). واتە: (دۆزخیەکان کراس و پۆشاکەکانیان (قەترانە) واتە: قیری گرگرتوە).

وەهەروەها خوای گەورە باسی فەرشی و ڕاخەرو و پەتوەکانیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ﴾(الأعراف: ٤١). موحەمەدی کوڕی کەعب وضەحاك و سەدی (رحمهم الله) دەفەرموون: "المهاد: الفراش، و(الغواش) اللحف"[٢٣٠] واتە: (ڕاخەرو پەتووی دۆزەخیەکان سەرجەم لە ئاگرە).

وپاڵ کەوتنیشیان لەسەردەم و ڕوو دەبێت لە دۆزەخدا، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ بوو بەلای ئەبو زەڕدا و بینی لەسەردەم خەوتوە و قاچێکی لێدا و پێی فەرموو: ((ياجُنيدب إنما هذه ضجعة أهل النار))[٢٣١]. واتە: (ئەی جوندبی بچکۆلە ئەو جۆرە پاڵ کەوتنەت پاڵ کەوتی دۆزەخیەکانی ناو ئاگرە).

حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ...وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴾(الإسراء: ٨) واتە: (دۆزەخمان کردۆتە حەسیر وڕاخەر بۆ بێ باوەڕان وەهەر کات باسی دۆزەخ بکرایە. دەیفەرموو: [: "قد حُذيت لهم نعالٌ من نار وسرابيل من قطران، وطعامهم من نار، وشرابهم من نار، و فراشٌ من نار، ولحفٌ من نار، ومساكن من نار، في شرِّ دارٍ وأسوءِ عذابٍ في الاجساد أكلاً أكلاً، وصهراً صهراً، وحطماً حطماً". واتە:

[٢٣٠] أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار)(١٢٥)، والطبري (١٣٢/٨)، وهناد(الزهد)(٢٦٤) وقال محققه: اسناد ضعيف.
[٢٣١] صحيح ابن ماجة (٣٠٠١).

(دۆزەخیەکان نەعلەکانیان ئاگرە، وە کراسەکانیان قیری سوتاوە، وە خواردنیان ئاگرە، و خواردنەوەیان ئاگرە، و ڕاخەریان لە ئاگرە، و پەتوەکانیان ئاگرە، و ماڵەکانیان ئاگرە، لە خراپترین جێگەدا، وە لە خراپترین سزادا لەناوبردن بە دوای لە ناوبردندا و توانەوە لەدوای توانەوەدا و تێك شکان لە دوای تێکشاندا).

وە عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنه دەفەرموێت: "يقطع للكافر ثيابٌ من نار حتى ذكر القباء والقميص والكمة"](٢٣٢). واتە: (بۆ باوەڕەکان کراس و کڵاو و پاڵتاو و پۆشاکیان لە ئاگرە).

وە لەهەندێك فەرموودەدا هاتووە کە (نەعل و پشتەماڵ و مستیلە و بازنی ئاگریان هەیە) لەوفەرموودانەش:

١- موستەورید کوڕی شەدا رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من اكل برجُلٍ مسلم اكله في الدنيا، أطعمهُ الله مثلها في جهنم، ومن كسا أو اكتسى برجل مسلم كساهُ الله مثله في جهنم))(٢٣٣). واتە: (هەر کەسێك بە ئازاردانی موسوڵمانێك پاروە نانێك لەدونیا بخوات و دەست بخات، خوای گەورە هاوشێوەی ئەوەی دەرخوارد دەدات لە دۆزەخدا، وەهەر کەسێك بەئازاردانی موسوڵمانێك پۆشاکێك بپۆشێت و دەست بخات خوای گەورە هاشێوەی ئەو دەکاتە پۆشاکی لە دۆزەخدا).

٢- خوبەیەیب رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من وطيء على إزاره خيلاء وطِئَهُ في النار))(٢٣٤) واتە: (هەر کەسێك پۆشاکەکەی بەفیزەوە درێژ بکات بە دوای خۆیدا و قاچی پێدا بنرێت. هەمان پۆشاکی درێژی بۆ ئامادە دەکرێت لە دۆزەخدا و قاچی بەسەردا دەنرێت).

ئیبنو ڕەجەب (رحمه الله) دەفەرموێت: ئەمە مانای ئەو فەرموودەیەی تر ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرموێت: "((ما تحت الكعبين من الازار ففي النار)) والمراد ما تحت الكعب من البدن

---

(٢٣٢) انظر: (التخويف) لابن رجب (ص: ١٢٨)، و(صفة النار) لابن أبي الدنيا (٤٣).

(٢٣٣) أخرجه: أبو داود (٤٨٨١)، وأحمد (١٨٠١١)وقال محققه: حديث حسن، والبخاري (الأدب) (٢٤٠)، والطبراني (الكبير)(٢٥/٧٣٤)، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح أبي داود) برقم (٤٠٨٤)، و (الصحيحة) (٩٣٤).

(٢٣٤) أخرجه: أحمد (١٨٠٧٧- ١٨٠٧٨) وقال محققه: حديث صحيح.

والثوب معاً وانه یسحبُ ثوبه في النار کما یسحبه في الدنیا خیلاء"[٢٣٥]. واتە: (هەر پۆشاکێك لە قولەپێ درێژتر بێت و ئەوکەسە بەفیزەوە بە دوای خۆیدا ڕای بکێشێت بە هەمان شێوە دەبێت پۆشاکی ئاگرینەی لە دۆزەخدا بەدوای خۆیدا ڕابکێشێت).

٣- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنّ أهون أهل النار عذاباً من له نعلانِ وشرا کان من نارٍ یغلي منها دماغهُ، کما یغلي المرجلُ، مایری أنَّ احداً اشد منه عذاباً وانّهُ لأهونهم عذاباً))[٢٣٦]. واتە: (سوکترین سزا لە دۆزەخدا سزای ئەو کەسەیە کە دوو نەعل و دوو قەیتانی ئاگر زۆر گەرمی لە پێ دەکرێت کە دەماغی دەکولێنێت وەك چۆن ئەوەی لە ناو مەنجەڵدایە دەکولێت، ئەو کەسەوا دەزانیت هیچ کەسێك نیە سزای لەو گەورەتر و سەختر بێت بەڵام نازانێت کە کەمترین و سوکترین سزای هەیە).

٤- عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: "أن رجلاً. . . أخذ خاتماً من حدید فلبسه و أتی النبي ﷺ، فقال النبي ﷺ: ((هذا شرٌ هذا حلیة أهل النار))[٢٣٧]. واتە: (پیاوێك... مستیلەیەکی ئاسی لە دەست کردوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ، وە پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (ئەمەیان خراپترە ئەمەیان خشڵی دۆزەخیەکانە).

٥- وەهەروەها عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: " ان امراة أتت النبي ﷺ ومعها ابنة لها، وفي ید ابنتها مسکتان (أي: سواران) غلیظتان من ذهبٍ فقال لها ((اتعطین زکاة هذا))؟ قالت: لا، قال: ((ایسرُّكِ أن یُسَوِّرَكِ الله بهما یوم القیامة سوارین من نار))[٢٣٨] واتە: (ئافرێتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و کچێکی خۆی لەگەڵدا بوو، کە کچەکەی دوو بازنی زۆر ئەستوری ئاڵتونی لە دەست دا بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ئایا زەکاتی ئەو دوو بازنە دەدەیت) ئەویش وتی: نەخێر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێت خۆشە خوای گەورە لە جیاتی ئەو دوو بازنە دووبازنی ئاگر بکاتە دەستت لە ڕۆژی کۆتاییدا).

---

[٢٣٥] أنظر: (التخویف) (ص: ١٢٨).

[٢٣٦] أخرجه: مسلم (٢١٣).

[٢٣٧] أخرجه: أحمد(٢/١٦٣)، والبخاري (الأدب) (١٠٢١)، وحسنه الشیخ الألباني في (صحیح الأدب المفرد) (٧٧٩).

[٢٣٨] أخرجه: أحمد (٦/٤٦١)، وابو داود (١٥٦٢)، والترمذي (٦٣٧)، وحسنه الشیخ الألباني في(صحیح الترغیب)(٧٦٨).

٦- ئەبو مالکی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب وفي رواية [من لهب النار]))[239]. واتە: (ئافرەتی شین و شەپۆڕکار گەر پێش مردنی تەو بەنەکات لە ڕۆژی کۆتایدا دەوەستێنرێت و ئاوەڵ کراسێکی قیری سوتاوی لەبەر دەکرێت لەگەڵ کراسێکی ئاڵۆشاوی لە ڕیوایەتێکی تردا (گڕی دۆزەخ)).

٧- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من لبس ثوب شهرة في الدنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة ثم الهب فيه ناراً))[240]. واتە: (هەرکەسێك پۆشاك و جلێکی گران بەها بۆفیز و دەرکەوتن لەبەر بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا جلێکی سەر شۆڕی لەبەر دەکات و پاشان ئاگری تێ بەردەدات).

---

[239] أخرجه: مسلم (٩٣٤)، وابن ماجة (١٥٨١)، وابن حبان (٣١٣٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٢٨٥).

[240] أخرجه: ابو داود (٤٠٢٩)، وابن ماجة (٣٦٠٧)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٣٣٩٩)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٩٠٦)، واللفظ له، وفي (صحيح الجامع)(٦٥٢٦)، و(حجاب المرأة) (١١٠).

# داخ و پەشیمانی دۆزەخیەکان

دۆزەخیەکان لە ڕۆژی پەشیمانیدان وەك خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ﴾(مریم: ٣٩) واتە: (ئاگاداریان بکەرەوە لە ڕۆژی پەشیمانی و یەکلابوونەوە). وەهەروەها دەفەرمویێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾ (البقرة: ١٦٧)واتە: (ئا بەو جۆرە خوای گەورە کارەکانیان نیشان دەداتەوە و دەبێتە پەشیمانی بۆیان و لەدۆزەخ دەرناکرێن).

دۆزەخیەکان پەشیمانن لەکارە خراپەکانیان ئاوات دەخوازن کە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بوو نایە. وەك خوای گەورە دەفەرمویێت:. ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا﴾ (الأحزاب: ٦٦) واتە: (لەو ڕۆژەدا کەڕوویان لە ئاگردا بەهەموولایەك دەسوتێنن و دەڵێن: خۆزگە گوێڕایەڵی خودا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر دەبووین).

وە دۆزەخیەکان لە داخ و حەسرەتدان بۆ لە دەست دانی جێگەکانیان لەبەهەشتدا. ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مامنكم من أحد إلا له منزل في الجنة ومنزل في النار، فإذا مات فدخل النار ورث أهل الجنة منزله فذلك قوله: ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ﴾(المؤمنون: ١٠)))[٢٤١]. واتە: (هەرکەسێك لە ئێوە دوو جێگای هەیە، جێگەیەکیان لەبەهەشتدا و ئەوی تریان لە دۆزەخ گەر مردو کرایە ناو دۆزەخ بەهەشتیەك جێگەکەی دەگرێتەوە ئەوەش مەبەستی وتەکەی خوایە کە دەفەرمویێت: ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ﴾). واتە: (ئا ئەوانە میرات گری و خاوەنی بەهەشتن). لەفەرموودەیەکی تردا ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لايموت رجلٌ مسلم

(٢٤١) أخرجه: ابن ماجة (٤٣٤١) وقال القرطبي (التذكرة) (٣٥٢/٢) إسناده صحيح، وصحح إسناده أيضاً الحافظ في (الفتح) (٥٤٠/١١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٥٠٣)، و(السلسلة الصحيحة) (٢٢٧٩).

إلا أدخل الله مكانه من النار يهودياً أونصرانياً))[٢٤٢]. واتـە: (هـەر پیـاوێکی موسـوڵمان بمرێت خوای گەورە جولەکەیەك یان گاورێك دەخاتە جێگەکەی ئەو لەدۆزەخدا).

بەهەشتیەکان جێگـەی دۆزەخیـەکانیان نیشـان دەدرێـت تـا زیـاتر سـوپاس گـوزارتربن، دۆزەخیەکانیش جێگەی بەهەشتیەکانیان نیشان دەدرێت تا زیاتر خەفەت بارتربن.

ئـەبو هـورەیرە ﷺ گێڕاویەتیـەوە لـە پێغەمبـەر ﷺ کـە فەرموویـەتی: ((لايدخل أحد الجنة إلا أُرى مقعده من النار لو أساء ليزداد شكراً، ولا يدخل النار أحدٌ إلا أُرى ومقعده من الجنة لو أحسن ليكون عليه حسرة))[٢٤٣]. واتـە: (هەرکەسـێك بچـێتە بەهەشـتەوە جێگەکەی لە دۆزەخدا نیشان دەدرێت گـەر تاوانبـار بوایـە، تـا زیـاتر سوپاسگوزار بێت، وە هەرکەسێك بچێتە دۆزەخەوە جێگەکەی لە بەهەشتدا نشیان دەدرێت گـەر چاکە کـار بوایـە تا زیارت بەداخ و پەژارەوە بێت).

وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((كل أهل النار يرى مقعده من الجنة فيقول: لو أن الله هـداني فتكـون عليـه الحسـرة. )). ﴿ أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾(الزمر: ٥٦)))[٢٤٤]. واتە: (هەموو دۆزەخیەك جێگەکەی خـۆی دەبینێـت لەبەهەشتدا و دەڵێت: خۆزەگە شایستەی هیداتی خوا دەبووم، ئەویش دەبێتە ئـاخ و پـەژارە بۆی پاشان پێغەمبەر ئـەو ئایەتـەی خوێنـدەوە ﴿ أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾واتە: (ڕۆژێك دێت نفسی(تاوانبار) دەڵێت ئای بەداخەوە بۆ ئەو هەموو تاوان و خراپەیـەی کـردم بەرانبـەر خـوا و بـۆ ئـەو هـەموو بەدرۆخستنەوە و گاڵتـە جاریەی کردم بەرانبەر خواو پێغەمبەر و ئاینەکەی).

بەهەشتیەکان دۆزخیەکان دەبینن و هەندێك لە کارەکانی دونیایان بـەبُیر دەهێننـەوە و پێیان پێ دەکەنن.

---

[٢٤٢] أخرجه: مسلم (٢٧٦٧).

[٢٤٣] أخرجه: البخاري (٦٥٦٩)، وأحمد (٥٤١/٢)، وابن ماجة (٤٢٦٨)، وابن حبان (٧٤٥١).

[٢٤٤] أخرجه: أحمد (٥١٢/٢)، والحاكم (المستدرك. (٤٢٦٨/٢)، و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (السلسة الصحيحة) (٢٠٣٤).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ (المطففين: ٣٤). واتـە: (ئـالـەم ڕۆژەدا واتـە: (ڕۆژی دوایـی) بڕواداران پێدەکەنن بە بێ باوەڕان و لەسەر تـەخت و کورسیەکانیانەوە تەماشایان دەکەن، ئایا بێباوەڕن هەمان پاداشتی کردەوەکانیان خۆیان نەدرایەوە؟).

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٞ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ ﴾ (الصافات: ٥٠ – ٦٠). واتـە: (بەهەشـتیەکان هەنـدێکیان ڕوودەکەنە هەندێکیان پرسیار لە یەکتری دەکەن و یەکێ لەوان دەڵێت: من هاوڕێیەکم هەبوو دەیووت: ئایا تۆ بەڕاستی دەزانی ئایا ئێمە دوای ئەوەی دەبینە خۆڵ و ئیسك ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە و دەگێڕدرێنەوە. پێان دەوترێت: دەتانەوێت حاڵیان بزانن و بەچاو بیان بینن؟ بەهەشتیەکە تەماشا دەکات لەناوەڕاستی دۆزەخدا هاوڕێکەی خۆی دەبینێتەوە وپێی دەڵێت: سوێند بەخوا نزیك بوو منیش فریوبدەیت و گەر نیعمەتی خوا نەبوایە ئێستا منیش لەگەڵ تۆدا ئامادەی ئەو سزایە دەبووم، ئەوەتا ئێمە لەدوای مردنمان زیندوکراینەوە وجارێکی تر نەمردینەوە، ئێستا ئێمە لە سزا دراوەکان نین. ئا ئەوە بەڕاستی بردنەوەیەکی زۆر گەورەیە بۆ بەهەشتێکی ئاوها کۆشش کاران کۆشش بکەن و تێبکۆشن).

وە هـەروەها بەهەشـتیەکان بـانگ لـە دۆزخیـەکان دەکـەن و بەڵێنـەکانی خوایـان بیردەخەنـەوە، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأعراف: ٤٤). واتە: (بەهەشتیەکان بانگ لە دۆزەخیەکان دەکەن و دەڵێن: ئێمە بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی خوا دابووی بە ئێمەی پێی گەیشتین و هاتە دی، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنانەی

خوا دابووی بەئێوە پێی گەیشتن و هاتەدی؟ ! ئالەوێدا بانگ دەرێك جاڕدەدات و لە نێوان هەر دوولادا دەڵێت: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت).

وە دۆزەخیەکانیش داوای ئاو و ڕۆزی دەکەن لە بەهەشتیەکان، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (الأعراف: ٥٠). واتە: (دۆزەخیەکان بانگ لەبەهەشتیەکان دەکەن و دەڵێن: لە ئاو یاخود لەوانەی کە خوا پێی بەخشیون بەسەرماندا برێژن). بەهەشتیەکانیش دەڵێن: خودای گەورە هەموو ئەوانەی لە بێباوەڕەکان قەدەغەکردووە).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویت: ((ینادي الرجُل أخاهُ أني قد احترقت فافِضْ عليَّ من الماء، فيقال لهم: أجيبوهم، فيقولون: إن الله حرمهما على الكافرين))[٢٤٥]. واتە: (پیاوێکی دۆزەخی بانگ لە براکەی دەکات کە لەبەهەشتدا و دەڵێت: سوتام ئاوم بەسەردا برێژە ئەنجا بە بەهەشتیەکان دەوترێت وەڵامیان بدەنەوە. ئەوانیش دەڵێن. خوای گەورە هەموو ئەوانەی لەسەر دۆزەخیەکان حەرام کردووە).

وەهەندێك جاریتر بەهەشتیەکان پرسیاری تاوانەکانی دۆزەخیەکان دەکەن خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ۝٤٠ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝٤١ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ۝٤٢ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ۝٤٣ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ۝٤٤ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ۝٤٥ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤٦ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴾ (المدثر: ٤٠ – ٤٧)، واتە: (بەهەشتیەکان لەبەهەشتەکانی خۆیاندا پرسیار لە تاوانبارە دۆزەخیەکان دەکەن و پێیان دەڵێن: چی بوو ئێوەی بردە ناو دۆزەخ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لە نوێژ خوێنەکان نەبووین، وە لەوانە نەبووین کە نانیان دەدا بە هەژارەکان و لەگەڵ ڕۆچوانی تاوانەکاندا ئێمە ڕۆدەچووین، و ڕۆژی دوایشمان بە درۆدەزانی تا لە سەر ئەو حاڵە مردین).

---

[٢٤٥] أخرجه: الطبري (التفسير) (١٤٤/٨)، وهناد (الزهد) (٢٨٨) وقال محققه: اسناد صحيح.

ئیمانی شەعەبی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((يشرفُ قومٌ في الجنة على قوم في النار فيقولون: مالكم في النار، وإنما كنا نعمل بما كنتم تُعَلِّمون ؟ فيقولون: انّا كنا نُعَلِّمكُم ولا نعملُ به))[٢٤٦]. واتە: (کەسانێك لەبەهەشتدا لەسەرەوە تەماشای کەسانێك دەکەن لە دۆزەخدا و پێیان دەڵێن: ئێوە بۆ لە ئاگردان خۆ ئێمە لە ئێوەوە فێری کارەچاکەکان بووین؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە ئێوەمان فێری چاکە دەکرد و خۆمان کارمان پێ نەدەکرد). کەواتە دۆزەخیەکان لەم غەم و پەژارە و ئاخ و حەسرەتێکی گەورەدان چونکە ئەوان دوور خراونەتەوە لە هەموو ئەوانەی کە پێیان خۆشەوە وەك تەوبەکردن و داوای لێ خۆش بوون. حەسەنی بەصری (رحمه الله) سەبارەت بە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە "﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾. . . . . . . هي التوبة"[٢٤٧]. واتە: (دۆزەخیەکان دوور خراونەتەوە لەوەی کە ئارەزوویان لێ یە کە تەوبەکردنە).

## گریانی دۆزەخیەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴾(الأنبياء: ١٠٠). واتە: (دۆزەخیەکان لە دۆزەخدا تەنها لوشکە و دەنگ و گریان نەبێت هیچی تر نابیستن). وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴾(هود: ١٠٦). واتە: (دۆزەخیەکان لە دۆزەخدان و دەنگ و قریشکەو لورەی گریانیان دێت).

خوای گەورە سزای گریان دەدات بەسەر دۆزەخیەکاندا دەگرین تا فرمێسك تەواو دەبێت پاشان فرمێسکیان دەبێتە خوێن.

ئەنەس ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((يُرسلُ البكاء على أهل النار، فيبكون حتى تنقطع الدموع ثم يبكون الدم حتى يصير في وجوههم كهيئة الأخدود ولو أرسِلَتْ فيه السُفنُ لأرسِلتْ))[٢٤٨]. واتە: (گریان دەنێردرێتە سەر دۆزەخیەکان و دەگری تا فرمێسك تەواو دەبێت پاشان فرمێسکی گریانە کەیان دەبێتەوە خوێن وەك جۆگەی زۆر

---

[٢٤٦] أخرجه: أحمد في (كتاب الزهد) (ص: ٣٦٩).

[٢٤٧] أخرجه: الدينوري في (المجالسة) (٤٤) وقال محققه: إسناده صحيح.

[٢٤٨] أخرجه: ابن ماجة (٤٣٢٤)، وابن ابي الدنيا (صفة النار) (١٢/١) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٨٠٨٣).

گەورە بەسەر ڕوومەتیاندا دێتە خوار گەر کەشتی تێ بکرێت دەتوانێت هاتوو چۆی تێدا بکات).

عەبدولای کوڕی قەیس ﷺ دەفەرموێت: ((إن أهل النار ليبكون حتى لو أُجريت السُفُن في دموعهم لجرت وإنهم ليبكون الدم مكان الدمع))[٢٤٩] واتە: (دۆزەخیەکان ئەوەندە دەگرین گەر کەشتیەکان بکرێنە ناو فرمێسکەکانیانەوە دەتوانن هاتوو چۆیان پێدا بکەن و گریانی ئەوان خوێن دەبێت لە دوای تەواو بوونی فرمێسك).

وە گریانی زۆری دۆزەخیەکان لە دوای بێ ئومید بوونیان دەبێت، عەبدولای کوڕی عەمر کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: ((ثم ييأس القوم (فوالله ما يئس القوم إلا بعد هذه الكلمة) فما هو الاّ الزَّفير (مايكون في الصدر) والشهيق (وهو مايكون في الحلق) تشبهه أصواتهم أصوات الحمير أو لها شهيق وأخرها زفير))[٢٥٠]. واتە: (دۆزەخیەکان بێ ئومێدی ڕوویان تێ دەکات، سوێند بە خوا ئەوان تەواو بێ ئومێد نابن تا ئەو وشەیە لە خوای گەورە دەبیستن ﴿ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾. واتە: (بچوك و بێ دەنگ بن و قسەم لەگەڵ مەکەن)، ئەو جار دۆزەخیەکان تەواو بێ ئومێد دەبن و تەنها دەنگی سیخەی سەرسنگ و هەناسەی گریانیان لێ دێت و دەنگی هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوەیان وەك زەڕە زەڕی گوێدرێژی لێ دێت).

---

[٢٤٩] أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٤١٢٠)، والحاكم (٦٠٥/٤) وصححه و وافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٠٣٢)، وفي (السلسلة الصحيحه) (١٦٧٩)، وقال في (ضعيف الترغيب) (٢١٧٩) ووصح موقوفاً.

[٢٥٠] أخرجه: ابن ابي شيبة (١٥٩٦٩)، والحاكم (٥٩٨/٤) وصححه على شرطهما، والبيهقي (البعث)(٥٩١- ٦٤٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٩١).

# هاوار و قیژەی دۆزەخیەکان

خوای گەورە هاوار و قیژەی دۆزەخیەکانی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئەبو ئومامە رضي الله عنه گێراویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کەفەرموویەتی ((. . ثم انطلقنا وإذا نحن نرى دخاناً ونَسمعُ عُواءً قلتُ: ماهذا؟ قال: هذا عواء أهل النار. . . ))[٢٥١]. واتە: (پاشان بەرێ کەوتین تا گەیشتنە جێگەیەك لەوێ دوکەڵمان بینی و گوێمان لە هاوار و قیژەبوو. وتم: ئەوە چیە؟ جبریل عليه السلام وتی: ئەوە هاوار وقیژەی دۆزەخیەکانە).

هاواری دۆزەخیەکان بۆ ئەوەیە خوای گەورە لەدۆزەخ دەریان بکات، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ (فاطر: ٣٧). واتە: (دۆزەخیەکان لە دۆزەخدا هاوار دەکەن و دەڵێن: خوایە لە دۆزەخ بمان بەرە دەر تا بەپێچاوانەی جارانەوە کاری چاکە ئەنجام بدەین).

دۆزەخیەکان هاوار دەکەن تا خوای گەورە سەرکردە و گەورەکانی بێ باوەڕ دوو ئەوەندە سزا بدات و نەفرتیان لێ بکات، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴿٦٧﴾ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴾(الأحزاب: ٦٧-٦٨) واتە: (دۆزەخیەکان هاوار دەکەن و دەڵێن: خوایە ئێمە مل کەچی سەرکردەو گەورەکانمان بووین، ئەوانیش ڕێگەی ڕاستیان لێ ون کردین و گومڕایان کردین، خوایە تۆش دوو ئەوەند سزایان بۆ زیاد بکە و نەفرەتی هەرە گەورەی خۆتیان لێ بکە).

پاشان دۆزەخیەکان هاوار لە فریشتەکانی دۆزەخ دەکەن تا ئەوانیش داوا بکەن لە خوای گەورە تەنها ڕۆژێك سزایان لەسەر سوك بکات خوا گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنَ الْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَىٰ قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴾ (غافر: ٤٩ — ٥٠). واتە: (ئەوانەی لە دۆزەخدان بە فریشتەکانی دۆزەخ دەڵێن: ئێوە داوا بکەن لە خوای گەورە تا

---

[٢٥١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٦٦٦) واللفظ له، وابن خزيمة (١٩٨٦)، والحاكم (٤٣٠/١) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، والنسائي (الكبير) (٣٢٨٦)، وابن حبان برقم (٧٤٩١) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني (صحيح الترغيب)(٩٩٥)، وصححه أيضاً الشيخ مقبل (الصحيح المسند) (٤٨٣).

ڕۆژێك سزامان لەسەر سوك بكات. فریشتەكانیش وەڵامیان دەدەنەوە و دەڵێن: ئایا پێغەمبەرەكانیان بەڵگە ئاشكرا كانیان پێ نەگەیاندن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ پێیان گەیاندن. فریشتەكانیش دەڵێن: ئێوەش داوا بكەن و داوای بێ باوەڕانیش لەسەر لێ شێواویی دایە واتە: (ون دەكرێت و وەرناگیرێت)). پاشان دۆزەخیەكان هاوار و تكای خۆیان دەگەیەننە فریشتەی بەرپرس هەموو دۆزەخ وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ﴾(الزخرف: ٧٧) واتە: (هاوار دەكەن و دەڵێن: ئەی مالیك واتە: (بەر پرسی دۆزەخ) ئێمە گەر دەرناكرێین و سزامان لەسەر سوك ناكرێت دەبا خوای گەورە لە ناومان بەرێت وبمرین و ڕزگارمان ببێت؟ ئەویش لە وەڵامیاندا دەڵێت: ئێوە هەر ئەمە جێگەتان دەبێت و هەر لێرەش دەمێننەوە).

عەبدوڵای كوڕی عەمرو كوڕی عاصەوە دەفەرموێت: ((إن أهل النار يدعون مالكاً فلا يجيبهم أربعين عاماً، وفي رواية ابن عباس: (مكث عنهم الف سنة) ثم يقول (أنكم ماكثون) ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾ فلا يجيبهم مثل الدنيا، ثم يقول: ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ ثم ييأسُ القوم فما هو الا الزفُير والشهيق، تشبهُ أصواتهم أصوات الحمير، أو لها شهيقٌ وآخرِها زفيرٌ))[٢٥٢]. واتە: (دۆزەخیەكان هاوار لە مالك دەكەن تا چل ساڵ - لەریوایەتێكدا - تا هەزار ساڵ وەڵامیان نا داتەوە، پاشان پێیان دەڵێت: ئێوە هەر لێرە دەمێننەوە، ئینجا داوا لە خوا دەكەن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾واتە: (خوایە ئێمە لە دۆزخ دەربكە گەر گەڕاینەوە بۆ كارە خراپەكانمان كەواتە ئێمە بەڕاستی ستەم كارین. خوای گەورەش تا ماوەی هەموو تەمەنی دونیا وەڵامیان ناداتەوە)، پاشان دەفەرموێت: ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾. واتە: (بێدەنگ بن ئێوە دوور خراوە و دەركراون چیتر قسەم لەگەڵ مەكەن). پاشان دۆزەخیەكان بێ ئومێد دەبن و

---

[٢٥٢] أخرجه: ابن ابي شيبة (١٥٩٦٩)، والحاكم (٥٩٨/٤) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، والبيهقي (البعث) (٥٩١)، وابن ابي الدنيا (صفة النار) (١٦٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٩١)، ورواية ابن عباس أخرجه: الحاكم (٤٤٨/٢) وصححه و وافقه الذهبي، والبيهقي (البعث) (٥٨٨)، وابن ابي الدنيا (صفة النار) (٨٥).

تەنها هەر دەنگی گریان و هەناسەدانیان دەمێنێت دەنگیان وەك دەنگ و زەڕەی گوێ درێژی لێ دێت).

لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ١٣ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ﴾ (الفرقان: ١٣ – ١٤) واتـە: (کاتێـك ئـەوان فڕێ دەدرێنە جێگەیەکی زۆر تەسکەوە لە ناو دۆزەخدا، لەوێدا داوای لـە ناوچوونی خۆیان دەکەن و مەرگی خۆیان بەئاوات دەخوازن. (ئنجا پێیان دەوترێت: )ئـەمڕۆ تـەنها یـەك جار داوای تیاچوون و مردن مەکەن بەڵکو داوای تیاچوونی زۆرو بێشماری خۆتان بکەن). پاشان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٠) واتـە: (دۆزەخیەکان لەتاو دەنگی لوشکە و گریانیان گوێیان لە دەنگی یەکتری نی یە).

موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەضی ﷺ دەفەرموێت: "لأهل النار خمس دعوات يكلمون في أربعٍ منها ويسكت عنهم في الخامسة فلا يكلمون يقولون: پـێج جـار داوا دەکـەن لـە چواریاندا وەڵامیان دەدرێتەوە و لەپێنجەمیاندا وەڵامیـان نادرێتـەوەدەڵێن: ﴿ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ﴾ (غافر: ١١) واتـــە: (خـــوای گـەورە دووجـار ئێمـەت زینـدووکردەوە و دوو جـاریش ئێمـەت مرانـد ئـیتر دانمـان بـە تاوانەکانماندا نا ئایا هیچ ڕێگەیەك هەیە بۆ دەرباز بوونمان).

وەڵامیـــان دەردێتـــەوە: ﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴾ (غافر: ١٢) واتە: (هەر ئێـوە بـوون کـە تـەنها نـاوی خـوا دەبـرا بـێ باوەڕ دەبوون وە هاوتاتان بۆ بڕیار دەدا ئەو جار باوەڕتان پێی هەبوو حوکم تەنها هـەر بـۆ خوای گەورە و بەرزو بڵندە).

پاشـــان دەڵـــێن: ﴿ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾ (السجدة: ١٢) واتە: (خوایە ئێمـە بیستمان و بینیمـان بمـان گێـڕەرەوە تاکاری چاکە ئـەنجا بـدەین ئێستا ئێمە تەواو دڵنیاین لە باوەڕ و ڕاستیەکان).

وەڵامیـــــان دەدرێتــــــــەوە: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾(السجدة: ١٣) واتە: (گـەر بمان ویستایە هـەموو نەفسێکمان ڕێنمونی دەکرد واتە: (ئێوە شایستەی ڕێنمونی نەبوون) بەڵام وتەی من جێگیرە و دێتە دی دەبێت دۆزەخ پڕ بکەم لە جنۆکەو خەڵکان (کەبڕوایان بەخوا و پێغەمبەرە کەی نەبووە).

پاشان دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ ﴾ (إبراهیم: ٤٤) واتە: (خوایـە دوامـان بخـە تاماوەیـەکی نزیـك واتـە: (بمـان گێـڕەرەوە بـۆ دنیـا) تـا وەڵامـی بانگەوازەکەت بدەینەوەو ببینە شوێن کەوتووی پێغەمبەرەکەت).

وەڵامیان دەدرێتـەوە: ﴿ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾(إبراهیم: ٤٤) واتـە: (ئێـوە نـەبوون (لـە دونیـادا) سـوێندتان دەخـوارد کـە هـەرگیز لـە نـاو ناچـن واتـە: (باوەڕتان بەڕۆژی دوایی نەبوو).

پاشـان دەڵـێن: ﴿ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ (فاطر: ٣٧). واتــە: (خوایـە دەرمـان بکـە لـەدۆزەخ تـا کـاری چاکە ئـەنجام بـدەین بەپێچـەوانەی کارەکـانی پێشووترمان).

وەڵامیان دەردێتەوە ﴿ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ ﴾ (فاطر: ٣٧) واتە: (ئایا ئێوە لەدونیادا تەمەنێکتان بەسەر نەبرد گەر ئێوە سودتان لـە ڕاسـتی وەرگرتایـە لەتەمـەنی دونیاتانـدا سـودتان لێ وەردەگرت وە ئێـوە پێغەمبـەرانی ئاگادارکارتـان بـۆ هـات. واتە: (ئەگەر بتان ویستایە باوەڕبێنن).

پاشـان ئـەوان دەڵـێن: ﴿ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠٧) واتــە: (خوایە لە دۆزەخ بمان هێنەدەر گەر ئێمە گەڕاینەوە سەر خراپـە کانمـان ئـەوجار بەڕاسـتی ئێمە ستەمکارین).

وەڵامیان دەدرێتەوە ﴿ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠٨- ١١٠). واتە: (ئێوە دەرکراو ودوور خراوەن چیتر قسەم لەگەڵ

مەکەن، لەدونیادا کۆمەڵێك لەبەندەکانم دەیانووت: خوایە ئێمە بڕوامان هێناوە لێمان خۆش بەو بەزەیت پیاماندا بێتەوە تۆ چاکترین خاوەن بەزەییت، بەڵام ئێوە گاڵتەجاڕیتان پێ دەکردن هەتا گەیشتە ئەوەی یادی منتان لەبیر چۆوە وە بەردەوام پێیان پێ دەکەنین)."[٢٥٣]

## شەڕە قسەی نێوان دۆزەخیەکان

لەکاتێکدا دۆزەخیەکان سزا دەچێژن ئینجا دەست دەکەن بەشەڕە قسەو دەمەقاڵێ لەنێوان خۆیانداو بەم شێوەیە:

**١- دەمەقاڵێ دەکەن لەگەڵ سەرکردەکانی خۆیان تاکو شتێکیان لە سزا لێ دووربخەنەوە:**

وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِنَ النَّارِ ﴾(غافر: ٤٧). واتە: (لە دەۆزەخدا دەست دەکەن بەشەڕە قسە، لاواز و شوێن کەوتووەکان بەسەرکردە و خۆبەزل زانەکانیان. دەڵێن: ئێمە شوێن کەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن بەشێك سزا وئاگرمان لێ کەم بکەنەوە. . . سەرکردەکان دەڵێن: ئێمە ناتوانین ئاگرلە خۆمان دورخەینەوە هەردوولامان لە دۆزەخ داین ئەمەش حوکمی خوایە). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ ﴾(إبراهيم: ٢١). واتە: (لاواز و شوێن کەوتووەکان بەسەکردەکانیان دەڵێن: ئێمە لە دونیا شوێن کەوتووی ئێوە بووین، ئایا ئێوە دەتوانن شتێکی کەم سزای خوامان لێ دوربخەنەوە، ئەوانیش دەڵێن: گەر خوای گەورە ئێمەی ڕێنمویی بکردایە ئەوا ئێمەش دەبووین بە ڕێنماکاری کاری ئێوە، ئارام گربین یاخو ئارام گرنەبین هەردووکی وەکو یەك وایە هەردوولا ڕزگاربوونمان نی یە).

---

(٢٥٣) أخرجه: ابن أبي الدنيا (صفة النار) (٢٥١)، وابن المبارك (زوائد الزهد) (ص: ٩١)، وأخرجه ابن أبي حاتم كما في (التخويف) (ص: ١٦٦).

**٢- شوێن کەوتەکان خۆیان بێ بەری دەکەن لەسەرکردەکانیان وە سەرکردەکانیش خۆیان بێ بەری دەکەن لە شوێن کەوتوەکانیان:**

وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾(البقرة: ١٦٦- ١٦٧). واتە: (کاتێك سەرکردە و گەورەکان خۆیان بێ بەری دەکەن لەشوێن کەوتوو لایەنگرەکانیان و هەموو سزای خوا دەبینن و دەچێژن و پەیوەندیەکانی دونیایان دەپچڕێت و سودی نابێت بۆ هیچ لایەکیان پاشان شوێن کەوتوو و لایەنگرەکان دەڵێن: خۆزەگە دەگەڕاینەوە دونیا تا ئێمەش خۆمان بێ بەری بکەین لێیان وەك چۆن ئەوان لێرە خۆیان بێ بەری کرد لە ئێمە. ئابەو جۆرەش خوای گەورە کارەکان و چارەنووسیان نیشان دەدات و دەبێتە داخ و پەشیمانی بۆیان و هەرگیز لە دۆزەخ نایەنەدەر).

**٣- داوا دەکەن خوای گەورە سزای گەورەکانیان بدا و نەفرەتیان لێ بکات:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا (٦٧) رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾ (الأحزاب: ٦٧ -٦٨). واتە: (دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئێمە مل کەچ و شوێن کەوتووی پیاو ماقوڵ و سەرکردە و گەورەکانی خۆمان بووین. بەڵام ئەوان گومڕایان کردین خوای گەورە ئەوانە دووجار سزابدە، خوای گەورە نەفرەتێکی گەورەیان لێ بکە). وەهەروها دەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِنَ النَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَكِنْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف: ٣٨). واتە: (دەڵێن خوایە ئا ئەوانە بوون ئێمەیان گومڕا و وێلکرد خوایە ئەوانە سزایان بۆ زیاد بکە لە دۆزەخدا. خوای گەورەش دەفەرموێت: هەموو یەکێکتان سزای زیادی خۆتان هەیە بەڵام ئێوە نازانن).

**٤- داوادەکەن ئەو سەرکردانەیان نیشان بدرێت تا تۆڵەی خۆیانی لێ بسێننەوە و بیان خەنە ژێر پێیانەوە:**

وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ﴾ (فصلت: ٢٩). واتە: (بێ باوەڕەکان دەڵێن:

خوای گەورە ئەوانەمان نیشان بدە کە گومڕایان کردین لە جنۆکە و مرۆڤ تابیان بەینە ژێر پێمانەوە و لەژێری هەموو مانەوەبن).

**٥- لەناو دۆزەخ دا نەفرین لەیەکتری دەکەن و یەکتر تاوانبار دەکەن:**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ (الأعـراف: ٣٨ – ٣٩). واتە: (هەر کات ئەوە و کۆمەڵێك چوونە ناو دۆزەخ نەفرت لەوانی تریـان دەکـەن کەلـە نـاو دۆزەخـدان، تـا هـەموویان تیایـدا کۆدەکرێنـەوە وبەیـەك دەگـەن کۆتاییـەکانیان بەسـەرەتاکانیان دەڵێن: خوایـە ئـا ئەوانـە بـوون ئێمـەیان وێـڵ و گـومڕاکرد خوایـە سزای زیاتریان بدە لە ئاگردا خوای گەورە دەفەرموێت: هەموو بەشی سزای زیـادی خۆیـان هەیـە بەڵام ئێوە نازانن. پاشان سەرەتاکانیان بـە کۆتاییـەکانیان دەڵێن: خـۆ ئێـوە لـە ئێمـە چاکتر نەبوون بچێژن سزای کارە خراپەکانتان).

وە خوای گەورە لە ئایەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُو النَّارِ ﴾ (ص: ٥٩). واتـە: (دۆزەخیـەکان دەڵێن: ئـەوەش کۆمـەڵێکن لەگـەڵمان دەچنـە دۆزەخ پێشوازیان لێ نەبێت ئەوان ئەمەیان بۆ ئێمە پێش خست).

**٦- ئەوکەسانەی کەزۆر دڵسۆز و هاوڕێی یەکتربوون لۆمەو گلەیی لەیەکتر دەکەن:**

وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ ﴾ (الزخرف: ٦٧) واتـە: (هـەرە خۆشەویستەکان لـەناو دۆزەخ دا دەبـن بـەدوژمنی یـەکتری تـەنها موسـوڵمانە لەخواترسـەکان نـەبێت کەسـودیان گەیانـد بەیـەکتری)، وە خـوای گـەورە دەفەرموێت﴿ قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِالْوَعِيدِ ﴾ (ق: ٢٧ – ٢٨). واتە: (ئەو شەیتانەی کە لەگەڵ بێباوەڕەکەدا ژیانی بەسـەر بـردوە دەڵێت: خوای گەورەمان مـن گـومڕام نـەکرد بـەڵکو خـۆی لـە گومڕاییـەکی زۆر دوور دابـوو.

خوای گەورەش دەفەرمویت: لای من دەمەقاڵە مەکەن ئەی پێش تر هەڕەشەی خۆمم نەگەیاندەلاتان).

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً ﴾ (الأحقاف: ٦) واتە: (کاتێک خەڵکان کۆکرانەوە هەر دوور لادەبنە دوژمنی یەکتر).

**٧- بێ باوەڕان بۆیان دەردەکەوێت لەوێدا کەخۆیان نەفام وگێل بوون و دانی پیادەنێن:**

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ (الشعراء: ٩٦ – ٩٩). واتە: (لە دەمەقاڵەیاندا لەگەڵ یەکتر دەڵێن سوێند بە خوا ئێمە تەواو گوڕا بووین. ئێمە بەڕاستی گێل ونەزان وبێ ئەقڵ بووین، کەئێوەمان خستبووە ڕیزی خوای هەموو جیهان بەڵام هەرتاوانکاران ئێمەیان گومڕاکرد و بەم شوێنەیان گەیاندین لێرە کەس نیە تکامان بۆبکات و هاوەڵێکی دڵسۆزیشمان نیە سودمان پێ بگەیەنێت).

خوای گەورە دەفەر مویت: ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾ (العنكبوت: ٢٥). واتە: (ئەو بتانەی ئێوە بەخواتان دەزانین جگە لە خوا، و یەکتریان لەسەری خۆش دەویست لە دونیادا پاشان ئێوە لە ڕۆژی کۆتاییدا بێ باوەڕی خۆتان بەرانبەری ڕادەگەیەنن و نەفرەت لەیەکتر دەکەن و جێگەشتان تەنها هەر دۆزەخ دەبێت و هیچ کەسێك ناتوانێت سەرتان بخات).

وەهەروەها دەفەرمویت: ﴿ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴾ (مريم: ٨٢). واتە: (بێ باوەڕان لە ڕۆژی کۆتاییدا بێ باوەڕی و پەرستنی خۆیان بۆ بت و خواکانیان ئاشکرا دەکەن و دەبنە دوژمنیان).

**٨- بێ باوەڕان لۆمەی ئیبلیس دەکەن و شەڕە قسەی لەگەڵ دەکەن:**

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ

﴿مِن قَبْلُ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (إبراهيم: ٢٢). واتە: (شەیتان لە دوای بڕیاری خوا و چوونە دۆزەخ بە بێباوەڕەکان و شوێن کەوتوەکانی دەڵێت: خوای گەورە بەڵێنی ڕاستی پێدان و منیش بەڵێنی درۆم پێدان و نەم بردەسەر وهیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەرتاندا تەنها بانگم کردن. بۆ کارەخراپەکان و ئێوەش گوێڕایەڵیتان کردم، کەواتە لۆمەی خۆتان بکەن و لۆمەی من مەکەن ئەمڕۆ نە من دەتوانم فریاتان کەوم و ڕزگارتان بکەم وە نەئێوەش دەتوانن فریام کەون و ڕزگارم بکەن. من بەری بوونی خۆم ڕادەگەیەنم لەوەی منتان کردوەتە هاوتای خوا و گوێڕایەڵیتان کردوم پێشتر لە دونیادا، ئەمڕۆ ستەمکاران لە ئەشکەنجە و سزایەکی پڕ ئازاردان).

## سووک و قورسی سزاکانی ناو دۆزەخ

سزاکانی ناو دۆزەخ وەکو یەک نیە هەندێکی سوکەو هەندێکی قورس و سەختە... وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ﴾ (آل عمران: ١٦٣) واتە: (هەموو یەکێك لە بەهەشتی و دۆزەخی پلەی خۆی هەیە لا خوا)، وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾ (الأنعام: ١٣٢) واتە: (هەموو کەسێك پلەی بەئەندازەی کردەوەکانی خۆی دەبێت). وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَزَآءً وِفَاقًا﴾ (النبأ: ٢٦). ئیبنو عەباس ﷺ لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: " واتە: (سزای خوا لە ئاستی کردەوەکانیاندا دەبێت).

کەواتە دۆزەخیەکان سزاکانیان جیاوازە بەتایبەت یەکخواپەرستان کە چوونە دۆزەخ سزای ئەوان وەك بێباوەڕەکان نابێت. خواپەرستان لاشەیان گەورە ناکرێت وە دەمرن بە جۆرە مردنێك تیایدا و هەندێك لەشوێنەکانیان ناسوتێت بەتایبەت جێگەی سوجدەکانیان وەئاگریش هەندێك بەشی جەستەیان دەگرێتەوە سزایان لەسەر سوك دەکرێت و دێنە دەر لە دۆزەخ.

سەمرەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((منهم من تأخذهُ النار الى كعبيه، ومنهم من تأخذه الى ركبتيه ومنهم من تأخذه الى حجزته ومنهم من

تأخذه الى ترقوته))[٢٥٤]. واتە: (هەندێ لە باوەڕدارەکان ئاگر تەنها تاقوڵە پێیان دەسوتێنێت وە هەیانە ئاگر تا هەر دوو ئەژنۆیان دەسوتێنێت، وە هەیانە ئاگر تا پشتێنەیان دەسوتێنێت، هی واشیان هەیە ئاگر تاقوڕ قوڕاگەیان دەسوتێنێت. بڕوادارن هەموو جێگەیەکیان لەناو ئاگردا ناسوتێت بەتایبەت نوێژخوێنەکانیان... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((تأكل النار ابن آدم إلا أثر السجود، حرَّم الله على النار أن تأكل أثر السجود))[٢٥٥]. واتە: (ئاگری دۆزەخ هەموو جێگەیەکی مرۆڤ دەسوتێنێت تەنها جێگەی سوجدەکانیان نەبێت. خوای گەورە حەرامی کرد وە لەسەر دۆزەخ شوێنی سوجدەکانیان بسوتێنێت). وەك سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە ﷺ دەفەرموێت: ((. . . ولكن أُناسٌ أصابتهم النار بذنوبهم [يريد الله عزوجل إخراجهم] فأماتتهم إماتةً [فيحترقون حتى إذا كانوا فحماً أذن بالشفاعة]))[٢٥٦]. واتە: (. . . هەندێ لەکەسان بە ئاگر سوتاون بەهۆی گوناهەکانیانەوە (خوای گەورە ویستی وایە دەریان بهێنێت) وە شێوە مردنێك دەیان مرێنێت، وە دەسوتێن تادەبن بە خەڵوز پاشان تکایان بۆ دەکرێت و دێنەدەر لەدۆزەخ).

سوکترین کەس لەدۆزەخ دا سزا دەدرێت (ئەبو طالیب)ە وەك ئیبن عباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ أهون أهل النار عذاباً أبو طالب وهو منتعلٌ نعلين من نار -في رواية- [ أخمص قدميه جمرتان ][تبلغ كعبيه]يغلي منهما دماغهُ [كمايغلي المرجل بالقمقم] -وفي رواية مرسلة - [ ومسامعه جمرٌ، واضراسه جمرٌ وشفاهه لهب النار وتخرج أحشاء جنبيه من قدميه][ مايرى أن أحداً أشد منه عذاباً وأنه لاهونهم عذاباً]))[٢٥٧]

---

[٢٥٤] أخرجه: أحمد (٢/٩٤)، ومسلم (٢٨٤٥) والنسائي (١١٢/٨)، وابن ماجة (٦٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٥١)، و (السلسة الصحيحة) (٢٢٥٠).

[٢٥٥] أخرجه: البخاري (٨٠٦)، ومسلم (٢٩٩)، وابن ماجة (٤٣٢١).

[٢٥٦] أخرجه: أحمد (٣/٢٥)، الدرامي (٢/٣٣١)، ومسلم (١٨٥)، وابن حبان (٧٤٨٥) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (السلسة الصحيحة) (١٥٥١).

[٢٥٧] أخرجه: أحمد (٢٦٣٦) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح على شرط مسلم، وأخرجه أيضاً البخاري (٦٥٦٦)، ومسلم (٢١٠-٢١٣)، و الترمذي (٢٦٠٧)، والدارامي (٢/٣٤٠)، والحاكم (٤/٥٨٦)، وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٣٤٠)، والرواية المرسلة أخرجه ابن أبي شيبة (١٣/١٥٧)، والهناد (الزهد) (٣١٥) مرفوعاً وأبو نعيم (الحلية)(٣/٢٧٤) موقوفاً، وقال ابن رجب في(التخويف)(ص: ١٤٤): اسناده صحيح إلى عُبيدٍ وهو مرسل.

واتە: (سوك ترین سزا لە دۆزەخدا سزاکەی ئەبوطالیبە کە دوو نەعلی ئاگرین لە قاچیدایە. لەڕیوایەتێکدا: دوو پشکۆ ئاگرگە هەردوو قاچیدا هەر لە پاژنەیەوە تا دەگاتە هەر دوو قوڵە پێی و دەماغی دەکوڵێت وەك قوڵپە قوڵپی ناو مەنجەڵ. و هەر دوو گوێی پشکۆی ئاگرەو ددانەکانی هەموو پشکۆی ئاگرن وە لێوەکانی گڕی ئاگری لێ دەردەچێت و هەموو ناوسکی دادەماڵێت لە هەر دوو قاچیەوە دەردەچێت، وادەزانێت هیچ کەسێك نیە سزای لەو توندتربێت بەلام نازانێت کە سزای ئەو لە هەموو سزاکان سوکترە). ئەم فەرموودەیەش ئەوە دەردەخات کە سزاکانی ناو دۆزەخ هەموو پڕ ئێش و ئازارن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(البقرة: ١٠) واتە: (سزایەکی زۆر بەئازار). وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(الجاثية: ١٠) واتە: (سزایەکی زۆر گەورە). وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾(الفرقان: ٦٥) واتە: (سزایەك بەردەوام).

سزای دۆزەخ زۆر سەختە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((يؤتىٰ بانعم من أهل الدنيا من أهل النار فيصبغ في النار صِبغة ثم يقال له: ياابن آدم هل رأيت خيراً قط؟، هل مرَّبك نعيم قط ؟ فيقول: لاوالله يا ربِّ))[٢٥٨]. واتە: (بەختەوەرترین کەسی دونیا لە دۆزەخەکان لە ڕۆژی کۆتاییدا دەهێنرێت و یەك جار هەڵدەکێشرێت بەناو دۆزەخدا و پاشان پێی دەوترێت: ئەی مرۆڤ لە ژیانتدا خێرت دیوە ؟ لەژیانتدا خۆشیت دیوە ؟ ئەویش دەڵێت: نا سوێند بەخوا لە ژیانمدا خێرم نەدیوە وە لەژانمدا خۆشیم نەدیوە).

لەبەر ئەو سزا زۆر سەختەیەکە مرۆڤ هەموو شتێك دەبەخشێت تا ڕزگاری ببێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْاْ بِهِۦٓ﴾(الرعد: ١٨). واتە: (ئەوانەی وەرگری ئاینی خوا نەبوون گەر هەموو سەر زەوی و ئەوەندی تر مولکی ئەوان بێت دەیبەخشن تاڕزگاریان بێت لەسزای خوای گەورە). وە لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ

[٢٥٨] أخرجه: مسلم (٢٨٠٧).

بِهِۦ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ ﴾ (یونس: ٥٤) واتە: (هەموو ستەمکارێك سەر زەوی مولکی ئەو بێت دەیبەخشێت، تەواو پەشیمانی دای دەگرێت بەبینی سزای خوای گەورە).

ئەنەس ﷺ گێراویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یقول الله لأهون أهل النار عذاباً یوم القیامة لو أن لك ما في الأرض من شيء، أكنت تفتدی به ؟ فیقول نعم، فیقول أردت منك أهون من هذا وأنت في صلب آدم أن لاتشرك بي شیئاً [ولاأُدخِلك النار]فأبیت إلاّ أن تُشرك بي))[٢٥٩]. واتە: (خوای گەورە دەفەرموێت بەکەسێکی دۆزەخی کەسوکترین سزای هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەگەر تۆ لەسەر زەویدا شتێکت هەبوایە ئایا دەت بەخشی بۆ ئەوەی ڕزگارت بێت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: لەوە ئاسانترم لێ داوا دەکردیت کە تۆ لەپشتی ئادەمدا بوویت تەنها داوای ئەوەم لێ کردیت کەهاوبەشم بۆ بڕیارنەدەیت گەر وابکەیت ناتخەمە ئاگری دۆزەخەوە ئاوا نەدەچویتە ناو ئاگرەوە، بەڵام تۆ سەرپێچیت کرد و هاوبەشت بۆ بڕیاردام).

ئیمامی قورتوبی دەفەرموێت: : " لاشك أن الكفار في عذاب جهنم متفاوتون كما قد علم من الكتاب والسنة ولأننا نعلم على القطع على الإثبات أنه ليس عذاب من قتل الأنبياء والمسلمين وفتك بهم وافسد في الأرض وكفر مساوياً لعذاب من كفر فقط وأحسن للأنبياء والمسلمين. . . ))[٢٦٠]. واتە: (گومانی تیا نیە کەسزای کافران لەدۆزەخدا وەکو یەك نیە ئەوەش شتێکی زانراوە لەئایەتەکان و فەرموودەکاندا چونکە سزای کەسێك کە پێغەمبەرێکی لە پێغەمبەران کوشتبێت و وە موسوڵمانانی ئازاردا بێت و خراپەکاری نابێتەوە لەسەر زەویدا هەرگیز وەکو ئەو کەسە نیە کە کافرە و بەڵام ئەو کارە خراپانەی ئەنجام نەداوە. و چاکە کارە بوو بۆ پێغەمبەران وموسوڵمانان...).

پێغەمبەر ﷺ باسی کۆمەڵێك لەوانەی بۆ کردووین کە توند ترین سزایان هەیە لە دۆزەخدا لەوانەش:

---

[٢٥٩] أخرجه: البخاري (٦٥٥٧)، ومسلم (٧٠١٤).

[٢٦٠] التذكرة: (٣١٩/٢).

**١- فرعەون و بنەماڵەو شوێن کەوتوانی:**

خـــوای گـــەورە دەفــەرموێت: ﴿... وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾ (غافر: ٤٦) واتە: (لە ڕۆژی کۆتاییدا فیرعەون بنەماڵ و شوێن کەوتووەکانی بکە بەتونـدترین شێوە سزا دەدرێن).

**٢- وێنەگران:**

لەئیبنو عومەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((أشد الناس عذاباً يوم القيامة المصورون يقال لهم أحيوا ماخلقتم))[٢٦١]. واتـە: (سـەخت تـرین سـزا لـە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو کەسانەیە کە وێنەیان کێشاوە وە پێیان دەوترێت زیندووی بکەنەوە ئەوەی کە دروستتان کردووە).

**٣- ئافرەتێك سەرپێچی مێردەکەی دەکات، وە پێشەوای قەومێك کەئەو قەومە پێیان ناخۆش بێت پێشەوایەتیان بۆبکات:**

عومـەری کوڕی حـەرس ﷺ دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((كان يقال أشد الناس عذاباً يوم القيامة اثنان: إمرأة عصت زوجها وإمام قوم وهم له كارهون))[٢٦٢]. واتـە: (لـەناو ئێمـەدا وا بـاو بـوو کەئـەمان وت تونـدترین سـزا بـۆ دوو چینە). یەکـەمیان: ئافرەتێـك کەسەرپێچـی مێردەکـەی کـردووە. وە دووەمیـان: پێشـەوای قـەومێك کەخـەڵکان ئەویان نەوێت پێشەوایەتیان بۆ بکات). ئیتر پێشوایەتی نوێژ بێت یان کاری تر (والله أعلم).

**٤- ئەو کەسانەی کەئازار و ئەشکە نجەی خەڵکان دەدەن:**

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ((أشد الناس عذاباً عند الله يوم القيامة أشد الناس عذاباً للناس في الدنيا))[٢٦٣]. واتـە: (تونـدترین سـزا لـە قیامەتـدا بـۆ ئـەو کەسـەیە کـە ئازاری خەڵکانیانداوە لە دونیادا).

---

(٢٦١) أخرجه: أحمد (٤٧٩٢) وقال محققه: صحيح، والنسائي (٢١٤/٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٩٩٩).

(٢٦٢) أخرجه: الترمذي (٣٥٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(٢٩٤).

(٢٦٣) أخرجه: أحمد (٤٠٣/٣)، والطبراني في (الكبير) (١٠٦/١٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٣٠/٥) رجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٩٩٨) و(السيسلة الصحيحة) (١٤٤٢).

**٥- ئەوکەسانەی کەبکوژی پێغەمبەرانن وە پێشەوا گومڕاکارەکان و ئەوانەی لاسایی خەڵك دەکەنەوەو ئابڕوویان دەبەن:**

ئیبن و مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((أشد الناس عذاباً يوم القيامة: رجل قتل نبياً أو قتله نبيّ أو رجل يُضل الناس بغير علم وممثل من الممثلين [وفي رواية] (أومُصور يصور التماثيل))[٢٦٤]. واتە: (توندترین سزا لە قیامەتدا بۆ پیاوێکە پێغەمبەرێکی کوشت بێت، یاخود خۆی بەدەستی پێغەمبەرێك کوژرابێت وە پیاوێك بەبێ شارەزایی خەڵکان گومڕا بکات، وە (ممثل)ئەوانەن کە ئابڕووی موسوڵمانان دەبەن). واتە: (گەر بەواتای لاسای کردنەوە بێت وەکو توانج تێگرتن و لاسایی کردنەوە).

**٦- پێشەوا ستەمکارەکان:**

ئەبو سەعیدی خوری ﷺگێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أشد الناس يوم القيامة عذاباً إمام جائر))[٢٦٥]. واتە: (سەخت ترین سزا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ پێشەوایەکی ستەمکارە). لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إن أشد أهل النار عذاباً يوم القيامة. . . وإمام ضلالة))[٢٦٦]. واتە: (سەخت ترین سزای دۆزەخیەکان لە ڕۆژی کۆتاییدا بۆ پێشەوایەکی گومڕاکارە).

**٧- زانایەك سودی لە زانستەکەی وەرنەگرتبێت:**

لە ئەبو دەردائەوە ﷺ فەرموویەتی: ((إن أشد الناس عذاباً يوم القيامة عالم لم ينفعه الله عزوجل بعلمه))[٢٦٧] واتە: (سەخت ترین سزا لە ڕۆژی کۆتاییدا بۆ ئەو کەسەیە کە

---

[٢٦٤] أخرجه: أحمد (٤٠٧/١)، والطبراني (الكبير) (٢٦٦/١٠)، وأبو نعيم (الحلية)(١٢٢/٤٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع)(١٠٠٠) و(السلسلة الصحيحة)(٢٨٠).

[٢٦٥] أخرجه: عبد الرزاق، وأبو يعلى (١٠٨٨)، والطبراني (الأوسط) (١٦١٨) واللفظ له وفي (الصغير) (٦٦٣)، وحسن الشيخ الألباني في (الصحيح الجامع)(١٠٠١)، وانظر (ضعيف الترغيب)(١٣١٩).

[٢٦٦] أخرجه: أحمد (٣٨٦٨)، وقال محققه: اسناده حسن، والبزار (الكشف) (١٦٠٣)، وقال المنذري (الترغيب والترهيب) (٣٢٣٢)اسناده جيده، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيح الترغيب) (٢١٨٥).

[٢٦٧] أخرجه: الدارمي (٨٢/١)، وابن المبارك (الزهد) (٤٠)، وأبو نعيم (الحلية) (٢٢٣/١) وقال محقق: (المحسالة) رقم (٩٠) رجاله ثقات.

زانستێکی هەبوو بێت و سودی پێ نەگەیاندبێ)وە سوفیان کوڕی ئیبن عویەینە (رحمه الله) دەفەرموێت: ((یغفر للجاهل سبعون ذنباً قبل أن یغفر للعالم ذنبٌ واحدٌ))[٢٦٨]. واتە: (نەزان خوا لە حەفتا گوناهی خۆش دەبێت، پێش ئەوەی لە تەنها گوناهێکی زانا یەك خوش بێت).

**٨- ئەوانەی کەلاسای دروست کراوەکانی خوا دەکەنەوە:**

عائیشە (رضي الله عنها)دەفەرموێت: ((إن من أشد الناس عذاباً یوم القیامة الذین یشبهون بخلق الله))[٢٦٩]. واتە: (توند ترین سزا لە ڕۆژی کۆتاییدا بۆ ئەوانەیە کەلاسایی دروست کراوەکانی خوادەکەنەوە).

## دەرچونی یەکخواپەرستان لەدۆزەخ

خوای گەورە ئەهلی بەهەشت دەخاتە ناو بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ دەخاتە ناو دۆزەخ کە دوو بەشن: کافرە بێ باوەڕەکان کە ئەهلی ئاگرن و هەتا هەتایە تیایدا دەمێننەوە، بەشەکەی تر یان هەندێك لە ئەهلی قیبلە و تاوانبارەکانن کە گوناهە گەورەکانیان ئەنجامداوە وە هەروەها بیدعەچیەکان و گومڕاکانی تری لە ئەهلی یەکخواپەرستی، وە ئەم بەشەی دووایی خوای گەورە دەریان دەکات لە ئاگر دوای ئەوەی لە ناو ئاگردا دەبن بە پێی گوناه و تاوانەکانیان دەسوتێن وە خوای گەورە ڕێگە دەدات تا شەفاعەتیان بۆ بکرێت، لە چەند فەرموودەیەکدا ئەم باسە هاتووە:

عەبدوڵای کوڕی عمروﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((یَدخُلُ مِنْ أَهلِ هذهِ القِبلَةِ النّار مَنْ لا یُحصَی عَدُدهُم إلا الله بِما عَصوا اللهَ، و اجترءَوا علی مَعْصیَتِهِ و خالَفُوا طاعَتَهُ ؛ فیُؤْذَنُ لي في الشّفَاعَةِ...))[٢٧٠] واتە: (دەچێتە ناو ئاگرەوە

---

[٢٦٨] أخرجه: أبو نعیم (الحلیة)(٧/٢٨٦)، والخطیب البغدادي (صحیح الفقیه والمتفقة) (٧٢١)، وقال محققه: اسناده صحیح.

[٢٦٩] أخرجه: البخاري (٥٩٥٤)، ومسلم (٢١٠٧)، واللفظ له.

[٢٧٠] أخرجه: الطبراني في (الکبیر)و (الصغیر) بإسنادٍ حسن کما قال المنذري في (الترغیب) (٥٣٢٥)، وقال الهیثمي في: (المجمع): (١٠/٦٨٣) رقم (١٨٥١١): رواه الطبراني في (الکبیر)، و الصغیر: (١٠٣)، وإسناده حسن وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الترغیب) (٣٦٤٠).

لە ئەهلی ئەم قیبلەیە ژمارەیەکی زۆر تەنها لەبەر ئەوەی فەرمانەکانی خوایان بە جێ نەهێناوە ومل کەچ نەبوون و بێ ترس بوون لە ئەنجامدانی تواناکان ئەنجا ڕێگەم پێ دەدرێ تا شەفاعەتیان بۆ بکەم. . . . ).

جابر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((. . . يُعَذَّبُ ناسٌ مِنْ أَهلِ التَّوحيدِ في النَّارِ ؛ حتَّى يَكونوا فيها حُمَماً ثُمَّ يدرِكُهُمُ الرَّحمَةَ فَيخرُجُونَ. . .))[٢٧١].
واتە: (. . . خەڵکانێکی یەك خوا پەرست سزا دەدرێن هەتا دەبن بە خۆڵە مێش پاشان بەزەیی خوای گەورە دەیانگاتێ و دێنە دەرەوەلە ئاگر. . . . ).

عمرانی کوڕی حوصین ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ليخرُجَنَّ قَومٌ مِنْ أُمَّتي مِنْ النَّارِ بِشَفاعَتي يُسَمّونَ جَهَنَميُونَ))[٢٧٢] واتە: (کۆمەڵە کەسانێك لە ئۆمەتەکەم دێنە دەرەوە لە ئاگر بە شەفاعەتی من پێیان دەڵێن دۆزەخی یەکان). لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يخرجُ الله قوماً منتنين قد محشتهم النار بشفاعة الشافعين فيدخلهم الجنة فيُسمونَ الجهنميون))[٢٧٣] واتە: (خوای گەورە کەسانێکی سوتاوی بۆن ناخۆشی دۆزەخی بە تکای تاکاران لە دۆزەخ دەردەهێنێت و دەیانکاتە بەهەشتەوە).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو بەکر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...ثم إنه يؤذن في الشفاعة للملائكة، والنبيين، والشهداء، أن يشفعوا فيشفعون ويخرجون، فيشفعون ويخرجون (ثلاثاً). . . يخرجون منها من كان في قلبه مايزنُ ذرة من إيمان))[٢٧٤] واتە: (پاشان ڕێگە دەدرێت بە فریشتەکان و پێغەمبەرەکان و شەهیدەکان بۆ تکاکردن، و ئەوان تاکا دەکەن تا ئەو کەسانەش دەردەکەن لە دۆزەخ کە بەئەندازەی گەردێك بڕوا لە دڵیاندا هەبووە).

---

[٢٧١] أخرجه: أحمد (٣/٣٩١)، و الترمذي (٢٥٩٧) و قال: حسنٌ صحيح، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٤٥١).

[٢٧٢] أخرجه: الترمذي (٢٦٠٠) و قال: حسن صحيح، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٠٦١).

[٢٧٣] أخرجه: أحمد (٢٣٤٢٣) وقال محققه: حديث صحيح.

[٢٧٤] أخرجه: ابن أبي عاصم (السنة) (٨٦٣) وقال محققه: اسناده حسن.

# ئەوانەی شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەیانگرێتەوە و ئەوانەی خوای گەورە بواری شەفاعەتیان پێ دەبەخشێت و دەریان دەکات لە ئاگر

ئیبن ئەبو ئەلعیز (رحمه الله) دەفەرموێت: ((... أنَّ مِنْ أقْسامِ شَفاعتِهِ ﷺ شفاعَتَهُ لأهلِ الكبائِرِ مِنْ أُمَّتِهِ ؛وشَفاعَتِهِ في تخفيف العَذابِ عَمَّنْ يَستَحِقّه و شَفاعَته في رَّفْعِ دَرَجاتِ المؤمنينَ في الجَنَّةِ))[٢٧٥] واتە: (. . . لە بەشەکانی شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت کردنە بۆ خاوەنی گوناه و تاوانە گەورەکان لە ئۆمەتەکەی وە شەفاعاتەکەشی بۆ کەم کردنەوەی سزا لەسەر ئەوانەی کە شایەنی سزان و وەبەشێکی تری شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ بۆ بەرز کردنەوەی پلەی باوەڕدارانە لە بەهەشت)دا، ئەوانەی شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەیانگرێتەوە، و خوای گەورە دەریا دەهێنێت لە ناو ئاگری دۆزەخ ئەمانەن:

**یەکەم: دڵسۆزان لە خوا پەرستندا:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...شَفاعَتي لِمَنْ شَهِدَ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ و أنَّ مُحَمّداً رَسولَ اللهِ مُخلِصاً يَصدُقَ لِسانَهُ قلبَه و قَلبُه لِسانَهُ))[٢٧٦] واتە: (. . . شەفاعەتم بۆ ئەو کەسەیە شایەتی دابێت بەتاك و تەنهایی خوا و پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، ئەو شایەتیەی بە دڵسۆزی دابێت و زمانی دڵی بەڕاست خستبێتەوە وە دڵیشی زمانی بەڕاست خستبێتەوە).

لە ڕیوایەتیکدا هاتووە: ((مَنْ شَهِدَ أنَّ لا إله إلا الله يوماً واحداً مُخلِصاً و ماتَ على ذلكَ))[٢٧٧] واتە: (گەر کەسێك شایەتی بە (لا إلهَ إلا اللهُ و أنَّ مُحَمّداً رَسولَ اللهِ)دا بێت بە دڵسۆزی و لەسەر ئەوە مردبێت).

---

[٢٧٥] أنظر: (شرح العقيدة الطحاوية) (٢/ ٢٩٠)، و(النهاية والبداية) لابن كثير (١/ ٣٩١).

[٢٧٦] أخرجه: أحمد (٢/ ٣٠٧) (٨٠٧) وقال محققه: حديث صحيح، و الحاكم (١/ ٧٠) و صححه و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٦٤٦٦) و قال محققه: حديث حسن.

[٢٧٧] أخرجه: أحمد (٣/ ١٧٨) و رجاله رجال الصحيح: كما قال الهيثمي في (المجمع) (١٠/ ٣٧٤)، وابن خزيمة (التوحيد) (٢/ ٦١٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٣٦٣٩).

**دووەم: ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە و لەسەر ئەوە مردوون:**

**عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((...شَفاعَتي لِمَنْ ماتَ لَمْ يُشْرِكَ باللهِ مِنْ أُمَّتي))[٢٧٨] **واتە: (... شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسانەیە لە ئومەتەکەمدا کە مردوون و هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە، لە ڕیوایەتێکدا ئەبو ذەر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((مَنْ ماتَ مِنْ أُمَّتي لا يُشرِكُ باللهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّة ... و إنْ زَنى و إنْ سَرَقْ))[٢٧٩]. **واتە: (هەر کەسێك لە ئۆمەتەکەم بمرێت و هاوەڵی بۆ خوا پەیدا نەکردبێت دەچێتە ناو بەهەشت... وە ئەگەر زینای کردبێت ئەگەر دزیشی کردبێت).**

**سێ هەم: ئەو کەسەی کە دوا ووشەی (لا إله الا الله) بووە:**

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((لَقِّنوا موتاكُم لا اله إلا اللهَ، فإنّهُ مِنْ كانَ آخِرُ كَلِمَتِهِ لا اله إلا الله عِنْدَ الموتِ دَخَلَ الجَنَّة يَوماً مِنَ الدَّهرِ ؛ و إنْ أصابَه قَبْلَ ذلك ما أصابَه))[٢٨٠] **واتە: (مردووەکانتان (لا إله الا الله)، یان پێ بڵێنەوە لەسەرەمەرگدا چونکە هەر کەسێك دوا وتەی (لا اله الا الله) بێت لە کاتی مردندا دەچێتە بەهەشت، ئەگەر پێش ئەوە جۆرەها شتی تووش بوو بێت).**

**لە ڕیوایەتێکدا ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((إنَّ غُلاماً يَهودِّياً كانَ يَخدُمُ النبيَّ ﷺ فَمرِضَ ؛ فقال رسول الله ﷺ لأصحابِهِ: ((اذهَبُوا بِنا إليهِ نَعُودُه)) قال: فأتوهُ و أبوه قاعِدٌ عِنْدَ رَأسِهِ ؛ فقالَ النبيّ ﷺ: ((قُل لا اله إلا الله أشَفَعُ لَكَ بِها يَومَ القيامَةِ)) ... فقالَ: أشْهَدُ أنَّ لا اله إلا الله و أنَّ مُحَمَّداً رَسول اللهِ، فقالَ ﷺ: ((الحَمْدُ للهِ الّذي أنقذَهُ مِنْ نارِ جَهَنَّم)) ))[٢٨١]. **واتە: (هەرزەکارێکی جولەکە لەبەر دەست پێغەمبەری خوا ﷺ کاری دەکرد و نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ بە**

---

[٢٧٨] أخرجه: الترمذي (٢٤٤١)، و ابن ماجة (٤٣٠٧)، و البيهقي في(البعث) (٢٨)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٨٦)، و في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٧٦).

[٢٧٩] خرجه: البخاري (١/١١٥٦).

[٢٨٠] أخرجه: ابن حبان (٣٠٠٤) و قال محققه: حديث صحيح و أخرجه البزار (٣) بإسناد صحيح.

[٢٨١] أخرجه: البخاري (٥٦٥٧)، وأبو داود (٣٠٥٩)، و إبن حبان (٢٩٦٠) و اللفظ له، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٦٥٣) و (الإرواء): (١٢٧٢).

هاوەڵەکانی فەرموو: ((با بڕۆین سەردانی بکەین))، فەرمووی: کە چوون بۆ لای بینیان باوکی لای سەریەوە دانیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بڵێ (لااله الا الله) با شەفاعەتت بۆ بکەم لە ڕۆژی کۆتایی دا)). . . وتی: أَشْهَدُ أَنَّ لا اله إلا الله و أَنَّ مُحَمَّداً رَسول اللهِ، فەرمووی: ((سوپاس بۆ خوا کە ڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ)) وە بە شێوەیەکی تر هاتووە: ((... الحَمْدُ للهِ الّذي أَخْرَجَهُ بي مِن النار))[٢٨٢]. واتە: (. . . سوپاس بۆ خوا کە بە هۆی منەوە لە ئاگر دەری هێنا).

**چوارەم: هەموو موسڵمانانی لە ئەهلی قیبلە**

عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ شَفاعَتي لِكُل مُسلمٍ))[٢٨٣] واتە: (شەفاعەتی من (واتە: شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ) بۆ هەموو موسڵمانێکە، لە ڕیوایەتێکدا عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... اخترتُ الشَّفاعَة ... هي لِكُل مُسلمٍ))[٢٨٤]. واتە: (...شەفاعەتم هەڵبژارد. . . ئەویش بۆ هەموو موسوڵمانێکە)، لە ڕیوایەتێکدا: ((...من أَهلِ التّوحيد))[٢٨٥]. واتە: (. . . بۆ ئەو موسوڵمانانەیە کەیەك خواپەرستبوون ، لە ڕیوایەتێکدا: ((... مِنْ أهل القِبْلَةِ))[٢٨٦]. واتە: (. . . لە ئەهلی موسوڵمانانی قیبلە بن).

---

[٢٨٢] في رواية: أحمد (١٧٥/٣).

[٢٨٣] أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٠٧/١٨)، و قال الهيثمي في (المجمع) (٣٧٠/١٠) رواه الطبراني بأسانيد و رجالُ بعضها ثقات، و صححه محقق الطبراني، و قال المنذري: رواه الطبراني بأسانيد أحدها جيد كما في (الترغيب) (٥٣٢٢)، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٣٧).

[٢٨٤] أخرجه: ابن ماجة (٤٣١٧)، و الحاكم (٦٦/١) و صححه على شرط مسلم، و الطبراني في (الكبير) (١٢٦/١٨)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٨٥).

[٢٨٥] أخرجه: الترمذي (٢٥٩٧) و قال حسن صحيح، و صححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٤٥١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٤٠).

[٢٨٦] أخرجه: الطبراني في (الكبير) بإسناد حسن، كما قال المنذري في (الترغيب)، (٥٣٢٥) وقال المنذري (المجمع) (٦٨٣/١٠) رواه الطبراني في (الكبير) و (الصغير) (١٠٣) واسناده حسن، و صححه الشخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٣٦٤٠).

وە ئەبێ بزانین ئەو موسوڵمانانەی کە بەر شەفاعەت دەکەون لە ئەهلی نوێژن، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مَنْ صَلَّى صلاتَنا ؛ و استَقْبَل قِبلَتَنا ؛ و أَكَلَ ذَبِيحَتَنا ؛ فَذلِكَ المسلِم الّذي لَهُ ذِمةُ الله و ذِمةُ رَسولِهِ فلا تخفِروا اللهَ في ذِمَّتِه))[٢٨٧] واتە: (هەر کەسێك ئەم نوێژانەی ئێمە ئەنجام بدات وڕووبکاتە ڕووگە و (قیبلە) کەمان و لە قوربانیەکانمان بخوات ئەوە ئەو موسوڵمانەیە کە بەڵێنی خوا و پێغەمبەری پێ دراوە و ئێوەش ئەو بەڵێنە بپارێزن).

و لە فەرموودەکان دا هاتووە کە ئەو کەسانەی شەفاعەت دەیانگرێتەوە و دێنەدەر لە ئاگر ئەو موسوڵمانانەن کە نوێژیان کردووە، مەلائیکەکان دەیناسنەوە بە هۆی شوێنی سوجدە و کڕنووش بردنیان کە بەئاگر ناسوتێت؟

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...فَيَعرفونَهم في النّار بأثَر السجُودِ تأكُل النّار ابنَ آدمَ إلا أثَرَ السجُودِ ... فيَخرجُونَ مِنَ النّار قد اُمتحِشوا))[٢٨٨]. واتە: (. . . لە ناو ئاگردا دەناسرێنەوە بە شوێنی سوجدە و کڕنووش بردنیان، ئاگر هەموو شوێنێکی ئادەمی دەسوتێنێت تەنها شوێنی کڕنووش بردن نەبێت. . . پاشان دێنە دەرەوە دوای ئەوەی لە ئاگردا سوتاون).

هەروەها ئەم مژدەیە موسوڵمانەکانی ئەهلی حەج و زەکات و ڕۆژووش دەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی باوەڕداران کاتێك شەفاعەتیان بۆ دەکەن بە براکانیان دەڵێن:

ئەبو سعد ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... يَقولون: رَبَّنا [اخواننا] كانوا يُصَلّونَ مَعَنا ؛ و يَصومَونَ معَنا ؛ و يَحجّونَ مَعَنا فادخلتَهم النّار...))[٢٨٩] واتە: (. . . دەڵێن: خوای گەورە (براکانمان) لەگەڵ ئێمەدا نوێژیان دەکرد، لەگەڵ ئێمەدا ڕۆژوویان دەگرت، لەگەڵ ئێمەدا حەجیان دەکرد، بەڵام تۆ ئەوانت کردوەتە ناو ئاگرەوە).

---

[٢٨٧] أخرجه: البخاري (٣٩١).

[٢٨٨] أخرجه: البخاري (٦٥٣٩)، و مسلم (٣٠١).

[٢٨٩] أخرجه: البخاري (٤٧٣٩)، و مسلم (٣٠٢)، و أنظر: (صحيح ابن ماجة) (٥١).

**پێنجەم: ئەوانەی تاوان و گوناهە گەورەکانیان ئەنجام داوە:**

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((شَفاعَتِي لأَهلِ الكَبائِرِ مِنْ أُمَّتِي))[٢٩٠] واتە: (شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسانەیە کە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە لە ئومەتەکەم). وە لە ڕیوایەتێکی تردا ((. . . واعطيت الشفاعة للمذنبين من امتي يوم القيامة))[٢٩١]. واتە: (ڕێگەدراوم تکا بکەم بۆ گوناهبارانی ئومەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا).

**شەشەم: ئەو موسوڵمانانەی کە نیشتەجێی شاری مەدینە بوون و جێیان نەهێشتووە:**

ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لايَصبِرُ أَحدٌ عَلى (لاواء المدينة) إلا كُنتُ لَهُ شَهيداً أَو شَفيعاً يَومَ القيامَةِ إذا كانَ مُسلِما))[٢٩٢] واتە: (هەر کەسێك ئارامگربێت لە سەر ناڕەحەتی ژیان بەسەر بردن لەشاری مەدینەدا ئەو کەسە من شایەتی بۆ دەدەم و شەفاعەتی بۆ دەکەم لە ڕۆژی کۆتایی دا گەر موسوڵمان بێت).

**حەوتەم: ئەو موسلمانانەی کە لە مەدینە مردوون:**

عەبدوڵای کوڕی عمر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مَنْ اِسْتَطاعَ أَنْ يَموتَ بالمدِينَةِ فَلْيَفعَلْ فإنّي أَشفَعُ لِمَنْ يَموتَ بِها))[٢٩٣]واتە: (ئەو کەسەی توانای هەیە لە شاری مەدینە بمرێت با وابکات چونکە من شەفاعەتی بۆ دەکەم ئەگەر ئەو لەوێ بمرێت).

---

[٢٩٠] أخرجه: أحمد (٣/٢١٣)، و أبو داود (٤٧٣٩)، و الترمذي (٢٤٣٥)، و ابن ماجة (٤٣١٠)، و الحاكم (٢١٣/٣)، و ابن حبان (٦٤٦٨)، و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم و صححه العلامة الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٨٣)، و في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٧٩)، و في (المشكاة) (٥٥٩٩)، و في (الروض) (٤٥)، و في (الظلال) (٨٣٠)، في (صحيح أبي داود) (٣٩٦٥).

[٢٩١] أخرجه: ابن عساكر (٤/٥٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٧٢٨).

[٢٩٢] أخرجه: مسلم (١٣٧٨)، و أحمد (٢/٢٨٧) و الترمذي، (٣٩١٨)، و ابن حبان (٣٧٤٠)و قال محققه: إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في: (صحيح سنن الترمذي) (٣٠٧٧).

[٢٩٣] أخرجه: أحمد (٤/٧٤)، و الترمذي (٣٩١٧)، و ابن ماجة (٣١١٢)، و ابن حبان (٣٧٤١) و قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٥٢٩)، و (صحيح الترمذي) (٣٠٧٦).

**هەشتەم: ئەو موسوڵمانانەی کە لە خوای گەورە دەترسن:**

ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((أنَّ رَسول اللهِ ﷺ قَرَأ يوماً هذه الآية ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ ﴾ فَقُلْتُ: و إنْ زَنى و إنْ سَرَق (ثلاثاً) ... فَقالَ: ((و إنْ رَغَمَ أنفِ أَبي الدرداء)) ))[٢٩٤] واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ ﴾ وتم: ئەگەر زینا و دزی کردبێت (سێ جار)...فەرمووی: ئەگەر (ئەبو دەرداء)یش پێی ناخۆشبێت).

## ئەو کەسانەی کە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ نایان گرێتەوە

ئەبو ئومامەوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((صِنْفانِ مِنْ أُمَّتي لَنْ تَنالُهُما شَفاعَتي: إِمامٌ ظَلومٌ غَشَومُ (أي غاصبٌ) ؛ وَ كُل غالٍ (في الدِّينِ) مارِقٌ (مِنهُ)))[٢٩٥]. واتە: (دووجۆرە کەسان لە ئومەتەکەمدا شەفاعەت نایانگرێتەوە: پێشەوایەکی ستەم کار و ئەوانە زیادەڕەوی دەکەن لە ئایندا ولێ ی دەردەچن). وەهەروەها ئەو کەسانەش شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ نایان گرێتەوە کە باوەڕیان بەو شەفاعەت و تکاکردنە نەبووە. ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: ((مَن كَذَّبَ بالشفاعة فليس له فيها نصيب))[٢٩٦]. واتە: (هەرکەسێك شەفاعەت بەدرۆ بزانێت هیچ بەشێکی لە شەفاعەتدا نابێت).

---

[٢٩٤] أخرجه: أحمد (٣٧٠/٢)، و ابن جرير (التفسير) (٨٥/٢٧)، و النسائي (السنن الكبرى) رقم (١١٥٦٠)، و (التفسير) رقم (٥٨٠) و قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما و اللفظ له، والبغوي (شرح السنة) (٤١٨٩) وقال محققه: اسناده صحيح، و ابن أبي عاصم (السنة) (٩٧٥)، و قال الحافظ العراقي في: تخريج الأحياء (٥٣٢/٤): رواه أحمد بإسناد صحيح، و قال الهيثمي في: (المجمع) (١١٨/٧): رواه أحمد ... و رجاله رجال الصحيح.

[٢٩٥] أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٣٩٦/٢٠)، و صححه العلامة الشيخ الألباني في تحقيقه لكتاب (السنة) لإبن أبي عاصم (٤١)، و في (السلسلة الصحيحة) (٤٧٠).

[٢٩٦] أخرجه : الأجري (الشريعة) (٨٢٩) وقال محققه: رجاله ثقات، و قال الحافظ في (الفتح) (٤٢٦/١١) أخرجه: سعيد بن منصور بسند صحيح.

# سزای هەندێك موسوڵمانانی لە ئەهلی قیبلە لە ناو ئاگردا

خوای گەورە و باڵادەست سزای موسوڵمانە تاوانبارەکان نادات وەك بێ بڕوایانی دۆزەخیەکان کە هەتا هەتایە لە ناو ئاگردا دەمێننەوە لە کافر و ئەوانەی هاوەڵیان بۆ خوا داناوە و موونافیقەکان، بەڵکو سزای تاوانبارە موسوڵمانەکان بە پێی کردەوە و هەڵەکانیان دەبێت، هەندێکیان ئاگر تا چۆکی دەسوتێنێت، و هەندێکیان تا پێی، و هەندێکیان تا ملی دەسوتێنێت.

سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مِنهُم مَنْ تَأخُذُهُ النّارُ إلى كَعبيهِ (... فَمنِهُم مَنْ أخذته إلى انصاف ساقية...)[٢٩٧] وَ منهُم مَنْ تأخُذُهُ النّارُ إلى ركبتّهِ، و مِنهُم مَنْ تأخذهُ النّار إلى حُجزَتِهِ ؛ وَ مِنْهُم مَنْ تأخذُهُ النّار إلى تَرقُوتِهِ))[٢٩٨]. واتە: (هەندێکیان ئاگر تا چۆکیان دەڕوات (. . . هەندێکیان دەگاتە نیوەی لاقی. . . ) و هەندێکیان تا ئەژنۆیان و هەندێکیان تا قوڕقوڕاگەیان و هەندێکیان تا ملیان)، لە ڕیوایەتێکدا: ((و مِنْهُم منْ في النّارِ إلى ارنَبتهِ مَعَ أجراءِ العذاب ... قَد إغتَمَر))[٢٩٩] واتە: (و هەندێکیان ئاگر دەگاتە سەری لوتیان لەگەڵ بەردەوام بوونی سزادا. .. و نوقم دەبێت).

و ئەو تاوانبارانە دەسوتێنرێن لە ئاگری دۆزەخ تا وەك خۆڵە مێشیان لێ دێت، ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... أمّا أَهل النّار الّذينَ هُم أَهْلُها (الذين لا يُريدُ اللهُ عز و جَل إخراجهُم) [٣٠٠] فأنَّهم لا يَموتونَ فيها ولا يَحيَون ؛ و لكن أُناسٌ أصابَتُهم النّارُ بِذنوبهم (يُريدُ الله عزَ و جل إخراجَهُم) فأماتَتَهُم إماتَةً

---

[٢٩٧] في رواية: أحمد (٩٤/٢)، و النسائي (١١٢/٨)، و ابن ماجة (٦٠)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٥)، و في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٥٠).

[٢٩٨] أخرجه: مسلم (٥٣٦/٢) كتاب الجنّة (باب شدة حرّ جهنّم).

[٢٩٩] رواه: أحمد في (المسند) رقم (١١١٠٠) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣٠٠] في رواية: أحمد رقم (١١١٥١) و قال محققه الأرناؤوط: حديث صحيح.

(فَيَحترِقونَ]) حتّى اذا كانوا فَحْماً أذّنَ بالشَفاعةِ. . . ))[٣٠١] **واتە: (. . . بەڵام دۆزەخیەکان ئەوانەی کە (خوای گەورە نایەوێت دەریان بهێنێت) تیایدا نامرن و زیندوو ناکرێنەوە، بەڵام خەڵکانێکی تر کراونەتە ناو ئاگر بەهۆی هەندێك لە گوناهەکانیانەوە (خوای گەورە دەیەوێت دەریان بهێنێت) دەیانمرێنێت و (دەسوتێن) تا دەبن بە خۆڵە مێش ئەنجا خوای گەورە ڕێگە دەدات بەتکا کردن بۆیان).**

**وە ئەو تاوانبارانە هەموو ئەندامەکانیان دەسوتێت تەنها دەم و چاویان نەبێت، ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((انَّ اللهَ يخرِجُ قَوماً مِنَ النّارِ بَعدما لا يبقى مِنهم فِيها إلا الوجوه ؛ فَيُدخِلَهُم اللهُ الجَنّةَ))[٣٠٢] **واتە: (خوای گەورە کۆمەڵە کەسانێك دێنێتە دەرەوە لە ئاگر دوای ئەوەی هیچیان نەماوە تەنها دەم و چاو نەبێت و خوای گەورە دیانخاتە ناو بەهەشت)، و ئەو کەسانە ئاگر دەم و چاویان ناسوتێنێت لەبەر ئەوەی کە شوێنی کڕنووش بردن بووە لە کاتی نوێژدا، هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئاگر، ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((تأكل النّارُ ابنُ آدَمَ إلاّ أثَرَ السجود حرَّمَ اللهُ على النّار أنْ تأكُلَ أثَرِ السّجود))[٣٠٣] **واتە: (ئاگر هەمووجێگەکەی ئادەمی دەسوتێنێت تەنها شوێنی کڕنووش بردن نەبێت، خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئاگر شوێنی کڕنووش بردن لە ئادەمیەکاندا بسوتێنێت).**

---

[٣٠١] أخرجه: أحمد (٣/٢٥)، و الدارمي (٢/٣٣١)، و مسلم (١٨٥)، و ابن حبان (٧٤٨٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، و صححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٥٥١).

[٣٠٢] أخرجه: عبد بن حميد في (المنتخب) (١/١٠٠)، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٦٦١).

[٣٠٣] أخرجه: البخاري (٨٠٦)، و مسلم (٢٩٩)، و ابن ماجة (٤٣٢١)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٩٢).

# کەی خوای گەورە بواری شەفاعەت دەدات و یەکخواپەرستان دێنێتە دەرەوەی ئاگر؟

یەکخوا پەرستان لە ناو ئاگر دەمێننەوە و دەسوتێن تا ئەو کاتەی خوای گەورە دەیزانێت و دواتر بەزەییان پێ دەبەخشێت و دەریان دەهێنێت، ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:

((یكونُ قومٌ في النارِ ما شاءَ اللهُ أنْ يَكونوا ثُمَّ يَرحَمُهُم اللهُ، فَيخرِجُهُم مِنها...))[٣٠٤]

واتە: (کۆمەڵە کەسانێك لە ئاگردا دەمێننەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە دەیزانێت دواتر بەزەییان پێ دەبەخشێت و دەریان دەهێنێت لە ئاگرەکە. . . ) .

ئەو تاوانبارانە دەچنە دەرەوە لە ئاگر دوای ئەوەی دەسوتێن و ڕەنگیان دەگۆڕێت، ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَخرُجُ قومٌ مِنَ النارِ بعدَ ما مَسّهُم مِنها سفعٌ (أي غيّرت بِشرَتَهُم) فَيدخُلونَ الجَنّة فيُسَمّيهم أهل الجَنّة الجَهَنميّون))[٣٠٥] واتە: (کۆمەلە کەسانێك دێنە دەرەوە لە ئاگری دۆزەخ دوای ئەوەی ڕەنگی دەم و چاو یان دەگۆڕێت و دەچنە ناو بەهەشت و ئەهلی بەهەشت پێیان دەڵێن: دۆزەخیەکان)، وە لە ڕیوایەتێکدا: ((بَعدما لا يَبقى مِنهُم فيها إلاَّ الوُجوهَ فيُدخِلُهُم اللهُ الجَنّةَ...))[٣٠٦] واتە: (دوای ئەوەی تەنها دەم و چاویان دەمێنێت و خوای گەورە دەیانباتە بەهەشت. . . ). ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((و أمّا أُناسٌ فَيُؤخَذونَ بِذنوبٍ و خَطايا؛ فَيُحرَقونَ فَيكونون فَحماً ؛ ثُمّ يُؤذَنُ في الشّفاعةِ ...))[٣٠٧] واتە: (هەندێ کەسان بە هۆی تاوان و هەڵەکانیان دەسوتێنرێن و دەبن بە خۆڵە مێش، دواتر بواری شەفاعەتیان بۆ دەدرێت. . . ).

وە خوای گەورە ئەو یەکخوا پەرستانە دەهێنێتە دەرەوەی ئاگر دوای ئەوەی سزای خۆیان وەردەگرن و دەسوتێن بە پێی کردەوەکانیان و کافرەکان لە ئاگری دۆزەخ دا پێیان

---

[٣٠٤] أخرجه: ابن أبي عاصم في (السنة) (٨٣٤)، و ابن حبان (٧٤٣٣) و قال محققه: إسناده قويّ.

[٣٠٥] في رواية: البخاري (١٤٢١/٤) رقم: (٦٥٥٩).

[٣٠٦] أخرجه: البخاري (٨٠٧)، ومسلم (١٩١)، وأنظر: (السلسلة الصحيحة) (١٦٦١).

[٣٠٧] أخرجه: أحمد (٢٦/٣) و ابن حبان (٧٣٧٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

پێ دەکەنن، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يُخرِجُ اللهُ أُناساً مِنَ المؤمنين مِنَ النارِ بَعدما يأخُذُ نقْمَتُهُ مِنْهُم قالَ: لما أدخَلَهُم اللهُ النّارَ معَ المشركينَ ؛ قال المشرِكونَ: (٣٠٨) أ لَيسَ كُنتُم تَزعمُونَ في الدّنيا أنّكُم أولياءُ، فَما لَكُمْ، مَعَنا في النارِ ؟ فإذا سَمِعَ اللهُ ذلك مِنهُم، أذِنَ في الشّفاعةِ ؛ فَيَستَشفعُ لَهُم الملائِكةُ و النبيون حتّى يُخرَجوا بإذنِ الله. . .))(٣٠٩) واتە: (خوای گەورە ئەو یەکخوا پەرستانە دەهێنێتە دەرەوەی ئاگر دوای ئەوەی سزای خۆیان وەردەگرن فەرمووی: کە دەیانخاتە ئاگرەوە لەگەڵ کافرەکان، پێیان دەڵێن: ئەی ئێوە لە دونیا چاکەکار نەبوون؟ ئەی بۆ ئێستا لەگەڵ ئێمەن لە ئاگردا؟ کە خوای گەورە گوێ بیستی ئەمە دەبێت، بواری شەفاعەت دەدات و مەلائیکەکان و پێغەمبەران شەفاعەتیان بۆ دەکەن تا دێنە دەرەوە لە ئاگر).

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە هێنانە دەرەوەی یەکخواپەرستان لە ناو ئاگر دوای ئەوە دەبێت کە خوای گەورە بەندەکان جیا دەکاتەوە، واتە دوای لێپرسینەوە و ڕۆیشتن بە سەر پردی صراط دا و چوونە ژوورەوەی باوەڕداران بۆ ناو بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((... حتّى إذا فَرَغَ اللهُ مِنَ القَضاءِ بينَ العِبادِ ؛ و أرادَ أنْ يُخرِج بِرَحمَتِهِ مَنْ أرادَ مِنْ أهلِ النارِ أمَرَ الملائِكة أنْ يُخرِجوا مِنَ النارِ مَنْ كانَ لا يُشرِكُ باللهِ شيئاً...))(٣١٠) واتە: (...دوای ئەوەی کە خوای گەورە بەندەکان جیا دەکاتەوە و بڕیارەکانی خۆی سەبارەت بە بەندەکانی تەواو دەکات، وە دەیەوێت بە بەزەیی خۆی ئەوانەی کە خۆی دەیەوێت دەریان بکات لە دۆزەخ، فەرمان دەکات بە فریشتەکانی ئەوانە دەربکەن لە دۆزەخ کە هیچ هاوتایەکیان بڕیار نەداوە بۆ خوا . سەعیدی کوڕی جبیر ﷺ دەفەرموێت: " لما أمر باخراج

---

(٣٠٨) و في رواية: [فيقول أهل النار: ما أغنى عنكم إنّكُم كنتم تعبدون الله لا تُشركونَ بِهِ شيئاً ؛ فَيقولُ الجبّارُ: تَبارَكَ لأغتِقَنَّهُم مِنَ النارِ، فَيُرسِلُ إليهم فَيخرجون...] أخرجه: أحمد (المسند) رقم (١٢٤٦٩) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده جيد.

(٣٠٩) أخرجه: ابن حبان (٧٤٣٢) و قال محققه: حديث صحيح.

(٣١٠) أخرجه: البخاري رقم (٦٥٧٣، ٧٤٣٨)، و في رواية: (يَفتَقِدُ أهل الجنّة ناساً كانوا يَعرفونَهُم في الدنيا فيأتون الأنبياء فيذكرونَهم فَيَشفعُونَ فيهِم، يقالَ لهم الطلقاء ...) رواه الطبراني في (الأوسط) (٣٠٤٤) وقال محققه: اسناده ضعيف و إسناده حسن كما قال الهيثمي في (مجمع الزوائد)(١٠/٣٧٩) اسناده حسن وأوردنه للعلم.

من دخل النار من أهل التوحيد فقال من فيها من المشركين: تعالوا فلنقل لا إله الا الله لعلنا أن نخرج مع هؤلاء فقالوا. فلم يصدقوا، قال فحلفوا ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾ قال: فقال الله تعالى: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ (الأنعام: ٢٤) (٣١١). **واتە (کاتێك فەرمان دەکرێت بەدەرکردنی یەکخواپەرستان. هەندێك لە هاوتابڕیاردەرەکان دەڵێن: وەرن با بڵێین (لا إله الا الله) بەڵکو ئێمەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دەرچین کە وایان وتوە. ڕاست ناکەن، وە سوێند دەخۆن دەڵێن: سوێند بەخوا ئەی خودا ئێمە لە هاوتابڕیاردەران نین).**

# شەفاعەت و هاتنە دەرەوەی باوەڕداران لە ئاگر

**یەکەم کەس کە خوای گەور شەفاعەتی لێ وەر دەگرێت لە ڕۆژی کۆتایی دا، خۆشەویست و پێغەمبەر و بەندەی سەروەری و کۆتایی پێغەمبەران و نەوەی ئادەم محمدە ﷺ، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((أنا أوّلُ شفيعٍ في الجَنّة)) (٣١٢) **واتە: (من یەکەم شەفاعەت کارم لە ناو بەهەشت دا).**

**پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە چۆن خوای گەورە بواری دەدات بۆ هێنانە دەرەوەی باوەڕداران لە ناو ئاگر، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((إذا كانَ يوم القيامةِ، ماجَ النّاسُ بَعضهَم إلى بعض، فيأتون آدمَ ؛ فَيَقولون لَهُ: اشفع لِذرّيّتِكَ ؛ فَيَقولُ: لَستُ لها ؛ و لكن عليكُم بإبراهيم فإنّهُ خليلُ الرحمنِ ؛ فيأتونَ إبراهيم، فَيَقولُ إبراهيم ؛ لستُ لها، و لكن عَليكُم بموسى فإنَّهُ كليمُ الله، فيأتونَ موسى ؛ فَيَقولُ: لستُ لَها؛ و لكن عَلَيكُم بِعيسى فإنَّهُ رُوحُ اللهِ و كَلِمَتُهُ، فيأتون عيسى ؛ فيقولُ: لستُ لها، و لكن عَليكُم بِمحمدٍ ؛ فيأتوني ؛ فأقولُ أنا لَها ؛ فأنطَلِقُ فأستأذنُ على رَبّي فيُؤذَنُ لي، فأقومُ بينَ يدَيهِ فأحمَدُهُ بِمحامِدَ لا أقدِرُ عليهِ الآن يُلهِمُنيهِ الله ؛ ثُمّ أخِرُّ لَهُ ساجداً (٣١٣) فَيُقال لي: يا محمد: إرفعْ رأسَكَ، و قُلْ يُسمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعطِه ؛و اشفَعْ تُشَفَّعْ، فأقولُ: يا ربِّ أمّتي أمّتي ؛ فَيُقالُ: انطَلِقْ فَمَن كانَ في قَلبِهِ مِثقالَ حَبّةٍ مِن بُرةٍ أو شعيرةٍ مِنْ إيمانٍ فاخرجهُ مِنها، فأنطلِقُ فافعَلُ، ثُمّ

(٣١١) أخرجه: الطبري (١٠٧/٧)، وهناد (الزهد) (١٩٤) و قال محققه: اسناده صحيح.

(٣١٢) أخرجه: مسلم (١٩٦)، و أحمد (١٤٠/٣).

(٣١٣) في رواية: أحمد (المسند) رقم (١٥) و قال محققه: إسناده حسن بلفظ (قَدْر جُمعَة) و أخرجه: ابن أبي عاصم (السنة) رقم (٨١٢) و قال محققه الشيخ الألباني: إسناده حسن.

أعودُ فأحْمَدُهُ بِتِلكَ المحامِدِ، ثُمَّ أخِرُّ لَهُ ساجداً[٣١٤] فَيُقال: يا محمد إرفَعْ رأسَكَ، و قُلْ يُسمعْ لَكَ، واشفَعْ تُشَفَّعْ، و سلْ تُعطَ، فأقولُ: يا رَبِّ أمّتي أمّتي ؛ فَيُقال لي انطَلِقْ فَمَنْ كانَ في قَلْبِهِ مِثقالَ ذرَّةٍ (حبةٍ) مِنْ خردلةٍ مِنْ إيمانٍ فاخرِجهُ مِنها، فأنطَلِقُ فأفعَلُ ثُمَّ أعودُ (إلى رَبِّي) فأحْمَدُهُ بِتِلكَ المحامِدِ ثُمَّ أخِرُّ لَهُ ساجداً فَيُقالُ (لي): يا محمد ؛ إرفَعْ رأسَكَ و قُلْ يُسمَعْ لَكَ وسلْ تُعط واشفَعْ تُشَفَّعْ ؛ فأقولُ: يا رَبِّ: أمّتي أمّتي، فَيُقالُ (لي): إنطَلِقْ فَمَنْ كانَ في قَلْبِهِ أدنى أدنى أدنى مِنْ مثقالَ حبةٍ مِنْ خَردلةٍ مِنَ الإيمانِ فاخرِجهُ مِنَ النارِ ؛ فأنطَلِقُ فأفعلُ. ثُمَّ أرجعُ إلى رَبِّي في الرابعة فأحْمَدُهُ بِتِلكَ المحامِدِ ثُمَّ أخِرُّ لَهُ ساجداً، فَيُقالُ لي: يا محمد إرفَعْ رأسَكَ و قُلْ يُسمَعُ لَكَ، و سَلْ تُعطَ واشفَعْ تُشَفَّعْ ؛ فأقولُ: يا ربِّ ائذنْ لي فيمَن قال لا إله إلا الله ؛ (قال: ليسَ ذاكَ إليكَ و لكنْ و عزّتي و كبريائي (وجلالي) و عظمَتي: لأخرِجَنَّ مِنها منْ قال لا إله إلاّ الله)))[٣١٥] **واتە: (کاتێک ڕۆژی کۆتایی بەرپا دەبێت خەڵکان دەچن بۆ لای ئادەم و پێی دەڵێن: تکا بۆ نەوەکەت بکە، دەڵێت: ئەوە بۆ من نیە بچن بۆ لای ئیبراهیم ئەو خۆشەویستی خوایە، دەچن بۆ لای ئیبراهیم، ئیبراهیم دەڵێت: ئەوە بۆ من نیە بچن بۆلای موسا کە قسەی لەگەڵ خوا کردووە، و موسا دەڵێت: ئەوە بۆ من نیەبچن بۆ لای عیسا ئەو ڕۆح و وشەی خوایە، دەچن بۆ لای عیسا، عیسا دەڵێت: ئەوە بۆ من نیە بچن بۆ لای محمد، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەنجا دێن بۆ لای من، ومنیش دەڵێم: ئەو کارە بۆ منە ئەنجا دەڕۆم و مۆڵەت لە خوای گەورە وەردەگرم و ڕێگەم پێ دەدرێت لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستم و سوپاسی و ستایشێکی دەکەم کە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا دەیخاتە دڵمەوە ئێستا نایزانم پاشان دەچمە سوجدە بۆ کڕنوش بردن ئەنجا پێم دەوترێت: ئەی محمد سەر بەرز کەرەوە، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوا بکە پێت دەبەخشرێت، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، منیش دەڵێم: خوای گەورە ئۆمەتەکەم ئۆمەتەکەم، دەوترێت: بڕۆ ئەوەی بە قەدەر دەنکێک گەنم یان جۆ باوەڕی هەیە دەری بێنە لە ئاگر، دەڕۆم ئەوانە دەردەهێنم، دواتر دەگەڕێمەوە و سوپاس و ستایشی دەکەم، و کڕنووشی بۆ دەبەم، و پێم دەوترێت: ئەی محمد سەر بەرز کەرەوە، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوا بکە پێت دەبەخشرێت، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، منیش دەڵێم: خوای گەورە**

---

[٣١٤] في رواية: أحمد (المسند) رقم (١٥) و قال محققه: إسناده حسن بلفظ (قدر جمعة) و أخرجه: ابن أبي عاصم (السنة) رقم (٨١٢) و قال محققه الشيخ الألباني: إسناده حسن.

[٣١٥] أخرجه: البخاري (٧٥١٠)، و مسلم (١٩٣) و (٣٢٦)، و اللفظ لأبي نعيم في: (المسند المستخرج) (٤٨٢).

ئۆمەتەکەم ئۆمەتەکەم، دەوترێت: برۆ ئەوەی بە قەدەر دەنکە خەرتەلەیەک یان مسقالە زەرەیەک باوەڕی هەیە دەری بێنە لە ئاگر، دەڕۆم ئەوانە دەردەهێنم، دواتر دەگەڕێمەوە و سوپاس و ستایشی دەکەم، و کڕنووشی بۆ دەبەم، پێم دەوترێت: ئەی محمد سەر بەرز کەرەوە، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوا بکە پێت دەبەخشرێت، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، دەڵێم: ئەی خوای گەورە ئۆمەتەکەم ئۆمەتەکەم، دەوترێت: بڕۆ ئەوەی بە قەدەر کەمتر (سێ جار) لە دەنکە خەرتەلەیەک باوەڕی هەیە دەری بێنە لە ئاگر، دەڕۆم ئەوانە دەردەهێنم، دواتر چوارەم جار دەگەڕێمەوە و سوپاس و ستایشی دەکەم، و کڕنووشی بۆ دەبەم، پێم دەوترێت: ئەی محمد سەر بەرز کەرەوە، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوا بکە پێت دەبەخشرێت، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، دەڵێم: خوای گەورە ڕێگەم بدە تا تکا بکەم بۆ ئەوەی وتویانە (لا إله الا الله) دەریان بهێنم لە ئاگر ، دەفەرموێت: ئەوە بۆ تۆ نییە بەڵام سوێند بە گەورەیی و میهرەبانی و دەستەڵاتی خۆم ئەوانەی کە وتویانە (لااله الا الله) خۆم دەریان دێنم لە ئاگر).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((. . . فأوحى الله إلى جبريل: إذهب إلى محمد فقل له: إرفع رأسك سل تعطه واشفع تُشَفَّع، قال: فشفعتُ في أمتي أن أخرج من كل تسعة وتسعين إنساناً واحداً، قال: فمازلتُ اترددُ على ربي عزوجل فلا أقوم مقاماً الاّ شفَعتُ حتى اعطاني الله عزوجل من ذلك أن قال: يا محمد أدخل من أُمتك من خلق الله من شهد أن لاإله الاَ الله يوماً واحداً ومات على ذلك))[٣١٦]. واتە: (خوای گەورە بەجبریل دەفەرموێت: بچۆ بە موحەمەد بڵێ: سەرت بەرزبکەرەوە و داوا بکە تا بۆت جێبەجێ بکرێت و تکا بکە تا لێت وەربگیرێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت تکا دەکەم. بۆ ئومەتەکەم لە هەر نەوە تو نۆ کەسێك تەنها یەك کەس ڕزگار بکەم لە دۆزەخ دەفەرموێت: بەردەوام دەچم بۆ لای خوای گەورە و لەهەر جێگەوە ساتێکدا تکا دەکەم تا خوای گەورە پێم دەفەرموێت: ئەوانە بکەرە ژوورەوە لە ئومەتەکەت واتە: (بەهەشت) کە تەنها یەك ڕۆژ شایەتیان بە تاك و تەنیایی من دابێت و مردبن لە سەر ئەو کارە).

---

[٣١٦] أخرجه: أحمد (١٧٨/٣)، وابن خزيمة (التوحيد) (ص: ٢٥٤)، وقال الشيخ مقبل الوادعي في (كتاب الشفاعة) رقم (٦٨): حديثٌ حسنٌ.

تکا کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها چینێکی تایبەت دەگرێتەوە لە موسوڵمانان، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...فأرفعُ رأسي فأحْمَدُ رَبِّي بِتَحميدٍ يُعَلِمنيهِ رَبِّي ؛ ثُمَّ أشفعُ ؛ فَيَحُدُّ لي حداً ؛ فأخرِجهم مِنَ النارِ و أُدخِلهم الجَنّة ثُمَّ أعودُ فأقَعُ ساجداً ...فأرفعُ رأسي، فأحمدُ رَبِّي بِتَحميدٍ يُعلِمنيهِ ثُمَّ اشفَعُ فَيَحُدُّ لي حداً فأخرجُهُم مِنَ النار، وأدخِلهُم الجَنّة، [ قال أبو عوانة: فلا أدري قال في الثالثة أو في الرابعة] ((فأقولُ يا رَبِّي ما بقيَ في النارِ إلاّ مَنْ حَبَسَتْهُ القرآنُ)) [أي وَجَبَ عليهِ الخَلودُ. . ]))[٣١٧] واتە: (. . . دواتر سەر بەرز دەکەمەوە و سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەم بە شێوەیەك کە خۆی فێرم دەکات، دواتر تکا دەکەم و بەشێکم بۆ دیاری دەکرێت و دەریان دێنم لە ئاگر و دەیانکەمە ناو بەهەشت. . .)، ((ئەبو عەوانە فەرمووی: نازانم وتی لە سێهەم دا یان لە چوارەهەم دا)) دەڵێم: خوای گەورە لە ئاگر دا ماونەتەوە تەنها ئەوانەی کە قورئان بەندی کردوون (واتە: ئەوەی کە پێویستە هەتا هەتای تییدا بمێنێتەوە) .

هەروەها تکا کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بۆ هەندێك لە باوەڕداران دەبێت، لەبەر ئەوەی لە چەند فەرموودەیەك دا هاتووە کە خوای گەورە کۆمەڵە کەسانیك دەردێنێت کە وشەی (لااله الا الله) یان وتووە یان یەك دەنك باوەڕ لە دڵیان دا هەبووە و کۆمەڵە کەسانێك کە هیچ کارێکی خێریان نە کردووە لە ژیانیان دا، ئەمەش بە بەزەیی خوای گەورە دەبێت پاشان شەفاعەتی مەلائیکەکان، و باوەڕداران ئەوەش دوای ئەوەی خوای گەورە بواریان دەدات.

پێدەچێت کە شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەتی ئافرەتە موسوڵمانەکان دەگرێتەوە، هەروەها پیاوە موسوڵمانەکان دەگرێتەوە بەلاّم بە شێوەیەکی کەمتر، ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...اطّلَعْتُ في النّارِ فرأيتُ أكثَر أهلِها النّساء))[٣١٨] واتە: (. . . تەماشای ئاگرم کرد و بینیم زۆربەی خەڵکانی ئافرەتن).

---

[٣١٧] أخرجه: مسلم (١٩٣)، و ابن حبان (٦٤٦٤) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣١٨] أخرجه: مسلم (٢٧٣٦).

هەروەها تکا کردنی بۆ کەم کردنەوەی ئەشکەنجە وسزای دۆزەخ لەسەر هەندێك کەس دەبێت، وەك تکا کردنی بۆ (ابی طالب)ی مامی[٣١٩] بۆ کەم کردنەوەی ئەشکەنجەدان لەسەری، عەباسی کوڕی عەبدو لموطلیب ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((أنَّهُ قال: يا رسولَ الله: هل نَفَعَتْ أبا طالب بِشيءٍ ؛ فإنَّهُ كانَ يَحُوطُكَ و يَغضَبُ لَكَ ؟ قال ((لَعلّهُ تَنْفَعَهُ شَفاعتي يومَ القيامة فَيُجعَل في ضَحضاحٍ مِنَ النارِ تَبلُغُ كَعبَيْهِ يغلي مِنهُ دِماغُهُ))[٣٢٠] ولو لا أنا لَكانَ في الدّرك الأسفَلِ مِنَ النارِ))[٣٢١] واتە: (فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هیچ سوودێکت بە ئەبو طالب گەیاند چونکە ئەو پارێزگاری لێ دەکرێت و لە پێناوتدا لە دوژمنانت تووڕەدەبوو. فەرمووی: بەڵکو لە تکاکردنی من سوودی پێ بگەیەنێت لە ڕۆژی کۆتایی دا بکرێتە پارچە ئاگرێکەوەو کە قولە پێیەتی و مێشکی دەکوڵێنێت، گەر من نەبومایە دەکەوتە خواری خوارەوەی ئاگر).

لەبەر شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەبو طالبی مامی، خوای گەورە کردوویەتی بە کەمترین سزادان و ئەشکەنجەدانی ئەهلی دۆزەخ، ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((أهونُ أهلِ النارِ عذاباً أبو طالب ؛ و هو مُنتَعِلٌ بِنَعلَين مِنْ نارٍ ؛ يَغلي مِنهُما دِماغُهُ))[٣٢٢] واتە: (کەمترین ئەشکەنجەو سزادانی ئەهلی ئاگر ئەبو طالبە کە جووتێك نەعلی ئاگرینیە لە پێ دایە، بەهۆی گەرمیەکەیەوە مێشکی سەری دەکوڵێنێت).

## تکا کردنی مەلائیکەکان و پێغەمبەران

پێغەمبەری خوا ﷺ تکا دەکات (واتە: شەفاعەت دەکات)، دواتر خوای گەورە بواری تکاکردن دەبەخشێت بە مەلائیکەکان و پێغەمبەران و باوەڕداران بۆ کەسانی ناو دۆزەخ، ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... فَيَقولُ عيسى: إنطَلِقوا إلى سيّد وِلدِ آدمَ إنطَلِقوا إلى محمدٍ ﷺ فَلْيَشفَع لَكُم إلى رَبِّكُم عز وجل

[٣١٩] انظر: (شرح العقيدة الطحاوية) لابن أبي العز (٢/٢٨٩).
[٣٢٠] أخرجه: البخاري (٣٨٨٥)، و مسلم (٢١٠) عن أبي سعيد الخدري.
[٣٢١] أخرجه: البخاري (٣٨٨٣)، و مسلم (٢٠٩).
[٣٢٢] أخرجه: مسلم (٥١٤)، و انظر: (صحيح الجامع) (٢٠٣٢).

قال: فَيَنطَلِقونَ ؛و آتي جبريل ؛ فيأتي جبريلُ رَبَّهُ ... قال: فَيَنطَلِقُ بِهِ جبريلُ ؛ فَيَخِرُّ ساجداً قَدرَ جُمعةٍ ؛ ثُمَّ يَقولُ اللهُ تبارك و تعالى: يا محمد إرفَع رأسَكَ، و قُلْ تُسمَعْ و اشفَعْ تُشَفَّعْ، فَيرفَعُ رأسَهُ، فإذا نَظَرَ إلى (وجهِ) رَبِّهِ خَرَّ ساجداً ؛ قدرَ جُمعةٍ أخرى، فَيقولُ اللهُ: يا محمد: إرفَعْ رأسَكَ، وقُلْ تُسمَعْ واشفَعْ تُشَفَّع ؛ فَيَذهَبُ لِيَقَع ساجداً ؛ فيأخُذَ (جبريل) بِضَبعَيْهِ (أي أعلى عَضُدَيهِ) ؛ و يَفتَحُ اللهُ عليهِ مِنَ الدُعاءِ شيئاً لَمْ يَفتَحْهُ على بَشَرٍ قطّ ؛ فيقولُ: أي رَبِّ جَعَلتَني سيِّدَ وَلَدِ آدمَ ولا فَخر، وأوّلَ مَنْ تُنشَقُ عنهُ الأرضُ يوم القيامة و لا فَخر ؛ حتّى إنَّهُ لَيرِدُ عليَّ الحَوضَ يومَ القيامةِ أكثرَ مما بينَ صَنعاءَ و إيلةَ ؛ ثُمَّ يُقالُ: أُدعُ الصدّيقينَ فَيَشفَعونَ؛ ثُمَّ يُقالُ: أدعُ الأنبياءَ ؛ فَيَجيءُ النبيّ و مَعَهُ العِصابَة ؛ و النبيُّ مَعَهُ الخَمسة و السّتة ؛ و النبيُّ ليس مَعَهُ أحدٌ ؛ ثُمَّ يُقالُ: أدعُ الشّهداءَ ؛ فَيَشفَعونَ لِمَنْ أرادوا ...))[٣٢٣] واتە: (عیسی ﷺدەفەرمویّت: ئیّوە بچن بۆ لای سەروەری نەوەی ئادەم بچن بۆلای محمد ﷺ تا تكاتان بۆ بكات لای خوای گەورە، ئەوان دەچن بۆلای پیّغەمبەر ﷺ و ئەویش دەچیّت بۆ لای جبریل ﷺ. جبریلیش ﷺ دەچیّت بۆ لای خوای گەورە، پاشان جبریل ﷺ پیّغەمبەر ﷺ دەبات، و پیّغەمبەریش ﷺ دەچیّت بە سوجدەدا و ماوەی جومعەیەك لە سوجدەدا دەمیّنیّتەوە پاشان خوای گەورە دەفەرمویّت: ئەی موحەمەد سەرت بەرز بكەرەوە و بلّی تا گویّت لیّ بگیریّت [یان: تا وەلامت ببیستیتەوە] و تكا بكە تا لیّت وەربگیریّت. ئەنجا سەری بەرز دەكاتەوە و تەماشای ڕووی خوای گەورە دەكات و یەكسەر دەچیّتەوە بۆ سوجدە بردن بۆ ماوەی جومعەیەكی تر، ئەنجا خوای گەورە دەفەرمویّت: ئەی موحەمەد سەرت بەرز بكەرەوە و بلّی [ باوەلامت ببیستیت] و تكا بكە تا لیّت وەربگیریّت، پیّغەمبەر ﷺ سەری بەرز دەكاتەوە و دەیەویّت بچیّتەوە بۆ سوجدە و جبریل ﷺ هەر دوو سەر شانی دەگریّت و لەویّدا خوای گەورە دوعای و نزایەكی پیّ دەبەخشیّت تا بیلّیّت كە پیّشتر بەهیچ كەسیّكی نەداوە، پاشان پیّغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویّت: خوای گەورە تۆ منت كردە سەروەری نەوەی ئادەم و بێ هیچ فیزیّك، وە منت كردە یەكەم كەس كەزەویەكەی سەری دووكەرت بیّت و زیندو ببیّتەوە لە ڕۆژی كۆتاییدا و بێ هیچ فیزیّك، وە تۆ شویّن كەوتوانی منت ئەوەندە زۆر كردەوە لە ڕۆژی كۆتاییدا

---

[٣٢٣] أخرجه: أحمد (١/٥. ٤) رقم ١٥٠) وقالمحققه: اساده حسن، و ابن أبي عاصم في (السنة) (٧٥١)، وقال الشيخ أحمد شاكر في تحقيقه لـ(المسند) (١٥/١٦١): إسناده صحيح، و ابن حبان (٦٤٧٦) و قال محققه: إسناده جيد.

کەسانێکی زۆرتر لە ماوەی نێوان دوو شاری صنعاء و ئیلە دێنە سەر حەوزەکەم پاشان دەوترێت: ڕاست گۆکان بانگ بکەن، ئەوان دێن و تکای خۆیان دەکەن، پاشان دەوترێت: پێغەمبەران بانگ بکەن، پێغەمبەری وا هەیە دێت و کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆری لەگەڵدایە، وە پێغەمبەری واهەیە دێت و پێنج یان شەش کەسی لەگەڵدایە، وە پێغەمبەری وا دێت و کەسی لەگەڵدا نی یە. پاشان دەوترێت شەهیدەکان بانگ بکە، ئەوانیش دێن وتکا دەکەن بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان دەیانەوێت. . . . . ).

یەکەم کەسانێك کە شەفاعەت دەکەن دوای پێغەمبەر ﷺ مەلائیکەکانە[٣٢٤] و دواتر پێغەمبەران و دواتر ڕاستگۆکان، ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((فَيَشفَعُ المَلائِكَةُ و النبيّونَ و الصديقّونَ))[٣٢٥] واتە: (مەلائیکەکان و پێغەمبەران و ڕاستگۆکان تکا دەکەن، شەفاعەت کردنی پێغەمبەر ﷺ تەنها بۆ ئەوانەیە کە بە دڵسۆزی شایەتیان بە تاك و تەنیانی خوا هێناوە).

ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... ثُمَّ يَشفعُ الأنبياءُ في كل من كان يَشهدُ أنْ لا إله إلا الله مُخلصاً فَيُخرجونَهُم مِنها...))[٣٢٦] واتە: (. . . دواتر پێغەمبەران شەفاعەت بۆ هەموو ئەوانە دەکەن کە بە دڵسۆزی وتویانە (لا الـه الا الله) و دەریان دەهێنن (واتە: لەئاگر)، پێغەمبەران هەموو شەفاعەت دەکەن و پێغەمبەر ئیبراهیم یەکێکە لە ئەوانە. حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَقولُ إبراهيمَ يومَ القيامة: يا ربّاهُ ؛ فَيَقولُ الرّبُ جلّ و علا: يا لَبيكاهُ، فَيَقولُ إبراهيمُ ؛ يا رَبّ حَرّقْتَ بنيَّ: فَيَقولُ: أخرجوا مِنَ النارِ مَنْ كانَ في قَلبِهِ ذَرّةٌ أو شعيرةٌ مِنْ إيمان))[٣٢٧] واتە: (ئیبراهیم ڕۆژی کۆتایی دەفەرموێت: ئەی خوای گەورە، خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە: بڵێ با ئەوەی پێت خۆشە پێت بدەم، ئیبراهیم دەفەرموێت: خوایە نەوەکەی منت سووتان لە ئاگردا، پێی دەفەرموێت: هەموو ئەوانە

---

[٣٢٤] و يشفعون في الصغائر و لإستزادة الدرجات: أنظر: (كتاب البعث و النشور) (ص: ٥٥).

[٣٢٥] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، وابن أبي عاصم (السنة) وقال محققه: اسناده حسن.

[٣٢٦] أخرجه: الطبري (١١٣/١٦)، وأحمد (المسند)رقم (١١٠٨١) و قال محققه: شعيب الأرنؤط: إسناده حسن.

[٣٢٧] أخرجه: ابن حبان (٧٣٧٨) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**دەرکەن لە ئاگر کە بە قەد دەنکە جۆیەك یان بەقورسایی زەرەیەك باوەڕ لە دڵی دا هەیە ، لەوە دەچێت شەفاعەتی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷷ بۆ ئۆمەتەکەی بێت لە نەوەکانی هەر دوو پێغەمبەر ئیسماعیل ﷷ و ئیسحاق ﷷ.**

# تکا کردنی باوەڕداران

**یەکەم کەس لە باوەڕداران کە تکا دەکات، کۆمەڵی یەکەمە، (واتە: ئەو حەفتا هەزار کەسەیە کە دەچنە ناو بەهەشت بە بێ لێپرسینەوە) و هەموو هەزارێك لە ئەوان تکا بۆ حەفتا هەزار دەکات.**

**عوتبەی کوڕی عبد ئەلسەلەمی ؓ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((إنَّ رَبِّي وَعَدَني أنْ يُدخِلَ مِنْ أمّتي الجَنّة سَبعينَ ألفاً بِغيرِ حسابٍ ثُمَّ (يُشفَعُ) كلَّ ألفٍ لِسَبعينَ ألفاً. . فَكَبَّرَ عُمر، فقال ﷺ : إنَّ السبعينَ ألفاً الأول يُشَفّعِهُم الله في آبائِهِم (و أبنائِهِم) و أمّهاتِهِم و عَشائِرِهِم، و أرجوا أنْ يُجعلَ أمّتي أدنى الحثواتِ الأواخِرِ))[٣٢٨] **واتە: (خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە حەفتا هەزار کەس لە ئۆمەتەکەم بکاتە ناو بەهەشت بێ لێپرسینەوە و دواتر هەموو هەزارێك لەوان (تکا) بۆ حەفتا هەزار کەسی تر دەکەن. . عومەر فەرموی: (الله اکبر) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەفتا هەزاری یەکەم تکا بۆ باوکانیان و نەوەکانیان و دایکانیان و هۆزەکانیان دەکەن، و هیوام وایە کە ئۆمەتەکەم کەمتر بێت لە مشتەکانی دوایدا).**

**ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((. . .فقلتُ: أي ربِّ إنْ لمْ يَكُنْ هؤلاءِ (أي سبعينَ ألفاً مع كل ألف سبعينَ ألفاً) مهاجري أُمّتي؟ قال:

---

(٣٢٨) أخرجه: أحمد (٤/١٨٣) (٢٢١٥٦) وقال محققه: حديث صحيح. و الطبراني في (الكبير) (١٧/٣١٢) و (٢٢/٧٧١)، و الطبراني في(الأوسط) (٤٠٦)، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٠/٤٠٩): رجاله ثقات، و أخرجه الحاكم بإسنادٍ صحيح كما قال العسقلاني في (الإصابة) (٤/٨٩)، و قال في (فتح الباري) (١١/٤١٨): أخرجه الطبراني و سَنَدهُ جيد، و ابن حبان (٧٢٤٧) و قال محققه: حديث صحيح لِغيرِهِ، و صحح إسناده من طريق الطبراني و الدارمي (٣٩٥)، واللفظ له، و أنظر: (مصابيح السنة) (٤٣٠٨).

أذِن أُكَمِّلَهُم لَكَ مِنَ الأعرابِ))[٣٢٩] واتە: (. . . وتم: خوای گەورە ئەی ئەگەر ئەوانە (واتە: حەفتا هەزار کەسە کە لەگەڵ هەموو هەزارێك حەفتا هەزار کەس هەیە گەر ئەوان) لە کۆچبەرەکانی ئوممەتەکەم نەبوون؟ فەرمووی: بۆت تەواو دەکەم لە عەرەبە خێڵەکیەکان).

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە خوای گەورە بەڵێنی بە پێغەمبەری خۆی داوە سەد هەزار کەس لە ئوممەتەکەی بکاتە ناو بەهەشت، ئەنەس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((وَعَدَني رَبِّي عز و جل أنْ يُدخِلَ مِنْ أُمّتي مِائة ألفٍ. .))[٣٣٠] واتە: (خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە سەد هەزار لە ئوممەتەکەم بکاتە ناو بەهەشت)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ وَعَدَني أنْ يُدخِلَ الجنّة مِنْ أُمّتي أربعُمائة ألفٍ. . .))[٣٣١] واتە: ( خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە چوار سەد هەزار کەس لە ئوممەتەکەم بخاتە ناو بەهەشت). بە هەرحاڵ بێت لەڕیوایەتی یەکەم دا تکا کردنی هەر هەزار کەسێك بۆ حەفتا هەزار کەسی تر ڕادەیەکی زۆرترە لە دوو ڕیوایەتەکەی دوایی، کە کۆی هەموو ئەوانەی تکایان بۆ دەکەن (واتە: ئەوانەی حەفتا هەزاری یەکەم تکایان بۆ دەکەن) نزیکەی حەفتا ملیۆن موسوڵمانە، لە ڕیوایەتێکی (صحیح)ی تردا هاتووە کە ژمارەکە زۆر لەو ڕادەیە زیاترە. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((. . . إنَّهُم لأكثَرُ مِنْ سَبعينَ ألفاً، و سَبعينَ ألفاً و سَبعينَ ألفاً))[٣٣٢] واتە: (. . . ئەوان زیاترن لە حەفتا هەزار، و حەفتا هەزار وحەفتا هەزار).

---

[٣٢٩] أخرجه: أحمد (٣٥٩/٢) (١٣٠٠٧) وقال محققه: حديث صحيح، و البزار (٣٥٤٨)، والطبراني (الأوسط) (٨٨٨٤) وقال محققه: اسناده حسن ، و قال العلامة الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٤٧٤/٣): إسناده على شرط مسلم.

[٣٣٠] أخرجه: أحمد (١٩٣/٣)، و قال الهيثمي في (المجمع) (٤٠٤/١٠) رواه أحمد و الطبراني في (في الأوسط) و إسناده حسن.

[٣٣١] أخرجه: أحمد (١٦٥/٣)(٢٦٩٥) وقال محققه: اسناده صحيح، و عبد الرزاق (٢٠٥٥٦). و قال الهيثمي في (المجمع) (٤٠٤/١٠): رواه أحمد و الطبراني في (الأوسط) (٣٤٢٤) و(الصغير) (٣٤٢) و رجالهما رجال صحيح، و قال العسقلاني في (فتح الباري) (٤١٩/١١): سناده جيد، و قال الشيخ شعيب الأرناؤوط في تحقيقه لِكتاب (شرح السنة) للبغوي رقم (٤٣٣٥): إسناده صحيح.

[٣٣٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) ١٨/(٨٥٤)، و البزار (٣٥٥٤)، و ابن حبان (٦٥٨٠) و قال محققه: حديث حسن

لە ڕیوایەتەکەی ئەبوبەکرﷺ دا هاتووە کە ژمارەکە لە ئەوە زۆر زیاترە، ئەبو بەکرﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((أُعطِيتُ سَبعينَ ألفاً (مِنْ أُمّتي) يَدخلونَ الجنّة بِغيرِ حسابٍ ؛ وجوُهَهم كالقَمَر لَيلةِالبَدرِ ؛ و قُلُوبُهُم على قلبِ رَجلٍ واحدٍ؛ فاستَزَدتُ رَبِّي عز وجل ؛ فزادَني معَ كلِّ واحدٍ سبعينَ ألفاً))[٣٣٣] واتە: (حەفتا هەزار کەس لە ئۆمەتەکەم دەچنە ناو بەهەشت بە بێ لێپرسینەوە ڕوویان وەك مانگی چواردە وایە و دڵیان لەسەر دڵی یەك پیاوە و تکام کرد لای خوای گەورە کە ژمارەیان زیاتر بکات خوای گەورەش بۆی زیادکردم، لەگەڵ هەموو یەکێك لەوان حەفتا هەزارکەسی تری بۆ زیاد کردم)، کەواتە ژمارەی ئەوانەی کە حەفتا هەزارەکە تکایان بۆ دەکەن لە ئەم ڕیوایەتەدا دەگاتە (٤٩٠٠٠٠٠٠٠ موسوڵمان). دواتر ڕاستگۆکانی باوەڕداران کە خۆشەویستەکانی خوای گەورەن لە ئەهلی نوێژ و ڕۆژوو و زەکات ئەوانیش تکا دەکەن).

عمرو کوڕی مورەی جەهمی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((جاءَ رجلٌ إلى النبيّ ﷺ فقالَ: يا رسولَ الله، أرأيتَ إنْ شَهِدْتُ أنْ لا إله إلاّ الله ؛ و إنّكَ رسولُ الله ؛و صَلّيتُ الصلوات الخَمس، و أدّيتُ الزكاة ؛ و صُمتُ رمضانَ و قُمتُهُ، فَمِمّن أنا ؟ قال: ((مِنَ الصدّيقينَ و الشُهَداء)) ))[٣٣٤] واتە: (پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر من شایەتی بدەم بە (لا إله إلاّ الله) و(محمد رسولُ الله) و پێنج نوێژەکە ئەنجام بدەم و زەکات بدەم و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرم ئایا من لە ڕیزی چ کەسانێکدام ؟ فەرمووی: تۆ لە ڕیزی ڕاستگۆ و شەهیدەکان). باوەڕدران بە گوێرەی پلە و پایەی خۆیان لای خوای گەورە دەتوانن تکا بکەن، هەندێکیان تکا بۆ کۆمەڵێك موسوڵمان دەکەن بە قەد (ربيعة و مضر) کە هەردووکیان کوڕی عدنان وسەرچاوەی هەموو عەرەبن، ئەبو ئەمامە باهلی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لَيَدخُلَنَ

---

[٣٣٣] أخرجه: أحمد (٦/١)، و أبو يعلى (٣٧٨٣)، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة (١٤٨٤)، و في (صحيح الجامع) (٧٠٥٧).

[٣٣٤] أخرجه: ابن خزيمة (٧٥٢)(٢٣٢٤)، و أحمد (٢٣١/٤) و البزار (٢٥)، و قال الهيثمي في (المجمع) (٤٦/١): إسناده حسن أو صحيح،. و ابن حبان (٣٤٣٨) و قال محققه إسناده صحيح على شرط الشيخين، و قال الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب و الترهيب) (٩٩٣): صحيح.

الجَنّة بِشَفاعةِ رَجُلٍ ليسَ بِنبيّ مثلَ الحييّنِ أو أحدُ الحييّنِ رَبيعَة و مُضَر))[٣٣٥] واتە: (دەچێتە بەهەشت بە تکا کردنی پیاوێك کە پێغەمبەر نی یە وەك ئەو دوو هۆزە یان یەك لە و دوو هۆزە (ربیعة و مضر).

لە فەرموودەیەکی تردا ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَدخُلُ الجَنّة بِشَفاعة رَجُلٍ مِنْ أمّتي أكثرُ مِنْ ربيعَة و مُضَرْ))[٣٣٦] واتە: (بە تکا کردنی تەنها یەکێك لە ئوممەتەکەم کۆمەڵێك زیاتر دەچێتە ناو بەهەشت لە هەر دوو هۆزی (ربیعة و مضر) زیاترە)، لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتووە، حارثی کوڕی ئوقیش ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ مِنْ أُمّتي مَنْ يَدخُلُ الجَنّة بِشَفاعَتِهِ أكثرُ مِنْ مُضَر))[٣٣٧] واتە: (لە ئوممەتەکەمدا کەسی وا هەیە تەنها بە تکای ئەو ژمارەیەکی زۆر زۆرتر لە هۆزی (مضر) دەچێتە ناو بەهەشت).

وە هەندێك لە باوەڕداران توانای تکاکردنی هەیە بۆ یەك هۆز وەك بەنی تمیم، عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەلجەدعاء ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لَيَدخُلَنَّ الجَنّة بِشَفاعةِ رَجُلٍ مِنْ أُمّتي أكثرُ مِنْ بَني تَميم ؛وقالوا: سِواكَ يا رسول الله ؟ قال: سِوايَ))[٣٣٨] واتە: (کۆمەڵێك دەچێتە ناو بەهەشت بە تکا کردنی یەکێك لە ئوممەتەکەم زیاتر لە هۆزی بەنی تەمیم، وتیان: جگە لە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ جگە لە من).

---

[٣٣٥] أخرجه: احمد (٢٢٢٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني في (الكبير) (٧٦٣٨)، والهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٨١/١٠) وقال: رواه احمد والطبراني بأسانيد ورجال احمد وأحد أسانيد الطبراني رجالهم رجالُ الصحيح غير عبدالرحمن بن ميسرة وهو ثقة، وقال المنذري في (الترغيب): رواه احمد باسناد جيد كما في (تهذيب الترغيب)(٣٥٩٤)، وقال الشيخ السفاريني في (اللوامع) (٢/٢١٠): اسناده صحيح، وصّححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٥٣٦٣) و (السلسلة الصحيحة) (٢١٧٨)، و(صحيح الترغيب) (٣٦٤٧).

[٣٣٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٥٨)، وابن سماك من حديث أبي أمامة بِسندٍ حسنٍ، كما قال الحافظ العراقي في تخريج الإحياء (٥١١/٤).

[٣٣٧] أخرجه: ابن ماجة (٤٣٢٣)، والحاكم (٧١/١) صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٩٠).

[٣٣٨] أخرجه: أحمد (٤٧٠/٣)، و الدارمي (٣٢٨/٢)، و الترمذي (٢٤٣٨) و قال: حديث حسن صحيح، و ابن ماجة (٤٣١٦)، و الحاكم (٧٠/١) و صححه و وافقه الذهبي، وابن حبان (٧٣٧٦) و قال محققه: إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٦٨٥)، و في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٨٤)، و في (المشكاة) (٥٦٠١)، و في (السلسلة الصحيحة) (٢١٧٨): و اللفظ لأبن ماجة و ابن حبان.

شەهیدیش تکا بۆ حەفتا کەس دەکات لە خزمەکانی، ئەنەسی کوری مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((الشَّهيدُ يَشفَعُ في سَبعينَ مِنْ أهلِ بيتِهِ))[٣٣٩] واتە: (شەهید تکا بۆ حەفتا کەس دەکات لەئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((. . سَبعينَ إنساناً مِنْ أقاربِهِ))[٣٤٠] واتە: (. . حەفتا کەس لە خزمەکانی)، هەندێك لە موسوڵمانان توانای تکاکردنیان هەیە تەنها بۆ پیاوێك یان دووپیاو یان سێ پیاو، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ الرّجُلَ لَيَشفَعُ في الرّجُل و الرّجلينَ و الثلاثة يومَ القيامَة))[٣٤١] واتە: (پیاویی وا هەیە دەتوانێت تکا بکات بۆ یەك پیاو یان دوو یان سێ پیاو لە ڕۆژی کۆتایدا)، بە شێوەیەکی تر هاتووە: ((إنَّ الرّجُلَ يَشفَعُ للرّجُلَينِ، و الثلاثة و الرّجل))[٣٤٢] واتە: (پیاوی وا هەیە تکا بۆ دوو پیاو یان سێ پیاو یان یەك پیاو دەكات).

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە تکاکردنی باوەڕداران دوای ڕزگار بوونیان لە ئاگر دەبێت و دوای دڵنیابوونیان، ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...حتّى إذا خَلَصَ المؤمنونَ مِنَ النارِ (وأمِنوا) فَوالذي نَفسي بِيَدِهِ ما مِنْ أحدٍ مِنكُم بِأشَدَّ مُناشَدةً في إستيفاءِ الحق [يكون له في الدنيا] الحَقّ مِنَ المؤمنينَ للهِ يومَ القيامة لأخوانِهِم الذينَ (أُدخِلوا) في النّارِ يَقولونَ[٣٤٣]: رَبَّنا كانوا يَصومونَ مَعَنا،

---

[٣٣٩] أخرجه: أبوداود (٢٥٢٢)، و البيهقي (٩/١٦٤)، و ابن حبان (٤٦٦٠)، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٧٤٨).

[٣٤٠] أخرجه: الترمذي (١٦٦٣)، وابن ماجة (٢٢٥٧)و صححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (١٣٥٨)، و في (صحيح ابن ماجة) (٢٢٥٧).

[٣٤١] أخرجه: البزار (٣٤٧٣) والبيهقي، وأبو يعلى (١٠١٤)، وابن أبي شيبة(١/٤٥٤)، وأحمد (١١١٤٨) وقال محققه الأرناؤوط عن طريق البزار: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال المنذري في (الترغيب): رواته رواة الصحيح كما في (تهذيب الترغيب) (٣٥٥٠)، و قال السفاريني في (اللوامع) (٢/٢١٠): إسناده صحيح، و قال الهيثمي: (مجمع الزوائد)(١٠/٣٧١): إسناده حسن لكثرة طرقه، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٤٨).

[٣٤٢] أخرجه: ابن خزيمة في (التوحيد) (ص: ٢٠٥)، و صححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥٠٥).

[٣٤٣] و في رواية: [فيقولون: أي رَبَّنا عبادٌ من عبادِكَ كانوا معنا في الدنيا، يصلّون صَلاتَنا، و يُزكّون زكاتنا، و يصومونَ صيامنا، فأخرجُوهُ، قال: فَيَجِدونَهُم قد أخَذَتْهُم النار على قدر أعمالِهِم، فَمِنهُم من أخَذَتْهُ إلى قدميهِ، و مِنهُم مَن

وَيُصَلّونَ (معنا) و يَحُجّونَ (معنا فادخَلْتَهُم النّار، فيَقولُ: إذهبوا فأخرِجوا مَنْ عَرَفتُم مِنهُم، فيأتونَهُم فَيَعرِفونَهُم بِصوَرِهِم)؛ فَيَحرمُ صورَهُم على النار ؛ فَيَخرجون خلقاً كثيراً (فَمِنهُم مَنْ أخَذَتْهُ النارُ إلى أنصافِ ساقيهِ ؛ و مِنهُم مَنْ أخَذَتْهُ إلى كَعبَيهِ، فَيُخرِجونَهُم) فيَقولُ: رَبّنا ما بَقيَ فيها مِمّن أمَرتَنا بِهِ؛ فَيقولُ: إرجعوا فَمَنْ وَجدتُم في قَلبِهِ مِثقالَ دينارٍ مِنْ خيرٍ (مِنْ إيمانٍ) فأخرِجوُهُ ؛ فَيُخرِجونَ خلقاً كثيراً ثُمّ يقولونَ: رَبّنا لمْ نَذَرَ فيها أحداً مِمّن أمَرتنا، ثُم يقولُ إرجِعُوا فَمَنْ وَجَدتُم في قَلبِهِ مِثقالَ نِصفِ دينارٍ مِنْ خيرٍ فأخرِجوهُ ؛ فَيَخرِجونَ خلقاً كثيراً، ثُمّ يَقولونَ: رَبّنا لَمْ نَذَر فيها مِمّن أمَرْتَنا أحداً، ثُمّ يقولُ: إرجِعوا فَمَنْ وَجَدتُم في قلبِهِ مِثقالَ ذَرّةٍ مِنْ خيرٍ فأخرِجوهُ ؛ فَيَخرِجونَ خلقاً كثيراً، ثُمّ يقولونَ رَبّنا لم نَذَر فيها خيراً...))[٣٤٤] **واتە: (... کاتێك کە باوەرداران ڕزگاریان دەبێت لە ئاگر و دڵنیا دەبن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە هەر کەسێك لە ئێوە چەند تکا دەکات و کۆشش دەکات بۆ بەدەست هێنان و وەرگرتنەوە مافێکی لە دونیا، بڕواداران لە ڕۆژی کۆتاییدا زۆر زیاتر کۆشش دەکەن و دەپاڕێنەوە لە خوای گەورە بۆ براکانیان کە کراونەتە ناو دۆزەخ و دەڵێن: خوای گەورە ئەوان لەگەڵ ئێمەدا ڕۆژوویان دەگرت، و لەگەڵ ئێمەدا نوێژیان دەکرد، و لەگەڵ ئێمەدا حەجیان دەکرد، و ئەوانت کردوەتە ناو ئاگر، خوای گەورە دەفەرموێت: بڕۆن کێ دەناسن بیهێننە دەرەوە لە ئاگر، دەچن وبەشێوەیاندا دەیان ناسنەوە، وچونکە دەم و چاویان حەرام بوو لەسەر ئاگر بیسوتێنێت، دەچن و خەڵکانێکی زۆر بەم شێوەیە دەهێننە دەرەوە لە ئاگر، هەندێکیان ئاگر گەیشتوەتە نیوەی لاقیان، و هەندێکیان گەیشتوەتە ئەژنۆیان و دەریان دەهێنن، دەڵێن: خوای گەورە ئەو کەسانەمان دەرهێنا کە فرمانت پێ کردین، دەفەرموێت: بگەڕێنەوە بۆلایان ئەوەی بەقد یەك دینار**

---

أخَذَتْهُ إلى نصف ساقَيه و يَحُجّونَ حجّنا، و يَغزونَ غزونا لا نراهُم (فيمَ نَجونا اليومَ و هَلَكوا)، فَيقولُ: إذهبوا إلى النار، فَمن وَجدُتم فيها مِنهُم، و منهم من أخذته إلى رُكبَتَيهِ، ومنهم من أخذتْهُ إلى آزرتُهُ، ومنهم من أخذتْهُ إلى عُنقِهِ، و لم تَغشَ الوجوه فيستخرجونهم منها...] أخرجه: الطبري (١١٣/١٦)، و أحمد (المسند) رقم (١١٠٨١) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن. و أخرجه أيضاً أحمد (المسند) (١١١٢٧) و قال محققه: إسناده حسن وأخرجه: ابن خزيمة (ص: ٣٢٥)، والحاكم (٥٨٥/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الشيخ مقبل في (كتاب الشفاعة) (ص: ١٥٩): حديث حسن.

[٣٤٤] أخرجه: أحمد (٩٤/٢)، و البخاري (٤٧٣٩)، و مسلم (٣٠٢)، و النسائي (١١٢/٨)، و ابن ماجة (٦٠)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٥١).

باوەڕ و چاکەلە دڵی دا هەیە بیهێننە دەرەوە لە ئاگر، دەچن و کۆمەڵێکی زۆر تر لە خەڵکان دهێننە دەرەوە لە ئاگر و دەڵێن: کەس نەما لەوانەی فرمانت پێ کردین، دەفەرمویت: بگەڕێنەوە بۆلایان ئەوەی بەقد نیو دینار باوەڕ و چاکەی لە دڵیدا هەیە بیهێننە دەرەوە لە ئاگر، بەمەش کۆمەڵێکی زیاتر لە خەڵکان دێنە دەرەوە لە ئاگر پاشان دەڵێن: کەس نەما لەوانەی فرمانت پێکردین، دەفەرمویت: بگەڕێنەوە بۆلایان ئەوەی بەقەد یەك مسقالە زەڕە باوەڕ و چاکە لە دڵی دایە بیهێننە دەرەوە لە ئاگر، هەروەها خەڵکانێکی زۆرتر دەهێننە دەرەوە لە ئاگر، لە دواییدا دەڵێن: خوای گەورە ئەوەی باوەڕ و چاکەی هەبێت و لە دۆزەخ هێنامانە دەر وتیایدا نەما. . . .).

لەم فەرموودە پیرۆزەدا بۆمان ڕوون بووەوە کە باوەڕداران ئەو کەسانە دەهێننە دەرەوە لە ئاگر کە ئەهلی باوەڕن و دەیان ناسن، نەك بێ باوەر و دووڕووەکان کە لە دونیادا دەیان ناسن، لەبەر ئەوەی خوای گەورە ڕەنگیان دەگۆڕێت و باوەڕدار نایناسێتەوە و ئەوان تا دوایی لە ناو ئاگر دەمێننەوە، هاوەڵی بەڕێز ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((. . . فإذا أرادَ اللهُ أنْ لا يُخرِجَ مِنها أحدٌ، غَيَّرَ وجُوهَهُم (أي من أهل النار) و ألوانُهُم ؛ فَيَمَرُّ الرَّجُلُ مِنْ المؤمنينَ، فيقولُ: يا ربِّ، فَيقولُ: مَنْ أعرَفَ رَجُلاً فَلْيُخرِجْهُ فَيَنظُرُ فلا يَعرِفُ أحداً، فَيُناديهِ الرَّجلَ: يا فُلان أنا فلان؛ فَيقولُ: ما أعرِفُ))[٣٤٥] واتە: (. . . هەر کات خوای گەورە ویستی لەوە بێت کە کەس دەرنەهێنێت لە ئاگر، شێوە و ڕەنگیان دەگۆڕێت (واتە: ئەهلی ئاگر) پیاوێك لە باوەڕداران بە لایاندا تێ دەپەڕیت ودەڵێت: خوای گەورە، خوای گەورەش دەفەرمویت: هەر کەسێك پیاوێك لە دۆزەخدا دەناسێتەوە بابیهێنێتە دەرەوە، بڕوادار تەماشا دەکات و کەس ناناسێت، پیاوێك بانگی لێ دەکات فلاّن من فلاّنم، دەڵێت: نات ناسم)، هەروەها خوای گەورە شێوەی ئازەری (باوکی ئیبراهیم (عليه السلام)) دەگۆڕێت و دەرناهێنرێت لە ئاگر لەبەر ئەوەی کافر و بێ باوەڕ بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە چۆنیەتی هەوڵدانی ئیبراهیم بۆ هێنانە دەرەوەی باوکی لە ئاگر، ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يلقَى إبراهيمُ أباهُ آزرَ يومَ القيامةِ، و على وَجهِ آزرَ قَترَةٌ و غَبرَةٌ ؛ فَيَقولُ لَهُ

---

(٣٤٥) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٩٤٤١)، الحاكم (٥٠٧/٢) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الذهبي (٥٥٩/٤): ما احتبى بابي الزعراء.

إبراهيم((... يا أَبَتِ أيُّ ابنٍ كُنتَ لَكَ ؟ فَيَقولُ: خيرُ ابنٍ))[٣٤٦] فَيقولُ لَهُ إبراهيم: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ أنْ لا تَعصيني ؛ فَيَقولُ أبوهُ: فَاليومَ لا أعصيكَ ((...فَيَقولُ: خُذْ بِأَزرَتِي فَيأخُذُ بِأَزرَتِهِ))[٣٤٧] في رواية ((لَيأخُذَنَ رَجُلٌ بِيدِ أبيهِ يومَ القيامةِ ((فَلتَقطَعَنَّهُ النار)) يُريدُأنْ يُدخِلَهُ الجَنَّة ؛ قال ؛ فَيُنادى إنَّ الجَنّة لا يَدخُلُها مُشرِكٌ (ألا) إنَّ اللهَ قَدْ حرَّمَ الجَنّة على كلِّ مُشرِك))[٣٤٨] فَيَقولُ إبراهيم: يا رَبِّ إنَّكَ وَعدتَني أنِ لا تُخزِني يومَ يُبعَثونَ؛ فأيَ خزيٍ أخزى مِنْ أبي الأبعدِ ؛ فَيقولُ اللهُ تعالى: إنّي حرَّمتُ الجَنّة على الكافرينَ((...فَيَمسخُ اللهُ أباهُ ضبعاً...))[٣٤٩] ((. . في صورةٍ قَبيحةٍ و رِيحٍ منتِنةٍ...))[٣٥٠] ثُمَّ يقولُ يا إبراهيم: أنظُر تَحتَ رِجلِكْ ؛ فَيَنظُرُ فإذا هوَ بِذَبحٍ مُتلطخٍ (فَيَترُكُهُ) فَيُؤخَذُ بِقوائِمِهِ))))[٣٥١] و في رواية: ((فَيهوى في النار، فيأخُذُ بِأنفِهِ ؛ فَيَقولُ اللهُ: يا عَبدي أبوكَ هوى ؟ فَيقولُ، لا و عِزّتكَ))[٣٥٢] **واته:**

**(ئیبراهیم ئازەری باوکی دەبینێتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا و دەم و چاوی ئازەر گرژو تاریك و ڕەش و خۆڵاوی یە، ئیبراهیم پێی دەفەرموێت:. . . باوکە من چۆن کوڕێك بووم بۆت؟ ئەویش دەڵێت: باشترین کوڕ بوویت، ئیبراهیم پێی دەفەرموێت: ئەی پێم نەوتیت سەرپێچیم نەکەیت؟ باوکی دەڵێت: ئەمڕۆ من سەرپێچیت ناکەم)، (. . . دەفەرموێت: پۆشاکەکەم بگرە و پۆشاکەکەی دەگرێت، لە ڕیوایەتێکدا: پیاوێك لە ڕۆژی کۆتایی دا دەستی باوکی دەگرێت و دەیەوێت بیکاتە ناو بەهەشت بەڵام ئاگر لە یەکیان دوور دەخاتەوە و**

---

[٣٤٦] أخرجه: البخاري (٣٣٥٠)، و الحاكم (٤/٥٨٩) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، ووافقهما محقق (المستدرك) (٨٧٨٨).

[٣٤٧] أخرجه: البخاري (٣٣٥٠)، الحاكم: (٤/٥٨٩) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، ووافقهما محقق (المستدرك) (٨٧٨٨).

[٣٤٨] أخرجه: الحاكم: (٤/٥٨٧) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٢٥٢) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري ؛ عن أبي سعيد الخدري مرفوعاً.

[٣٤٩] أخرجه: الحاكم (٤/٥٨٩) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

[٣٥٠] أخرجه: الحاكم (٤/٥٨٧)، و ابن حبان (٢٥٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

[٣٥١] أخرجه: البخاري (٣٣٥٠) والذيخ: ذكر الضبع.

[٣٥٢] أخرجه: الحاكم (٤/٥٨٩) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، و في رواية: (فَيهوى في النار فيقولُ: أبوك، فيَقولُ لا أعرِفُكَ) رواه البزار و رجاله ثقات –كما قال الهيثمي في (المجمع) (١/١١٨).

بانگ کارێك هاوار دەکات ئەوانە هاوتایان بۆ خوا بڕیارداوە ناچنە بەهەشت، خوای گەورە بەهەشتی حەرام کردووە لەسەر ئەوانەی هاوتایان بۆ بڕیارداوە، ئیبراهیم دەفەرموێت: خوای گەورە بەڵێنت پێ داوم کە سەرشۆڕم نەکەیت ڕۆژی زیندووبوونەوە، لەوە سەرشۆڕتر چی یە کە توشم هاتووە بەهۆی باوکە ئەولاتر چووەکەمەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر بێ باوەڕان. . . خوای گەورە باوکی دەکات بە کەمتیارێکی توکن، لە شێوەیەکی قێزەون و بۆنێکی بۆگەندا، دواتر دەفەرموێت: ئەی ئیبراهیم تەماشای ژێر پێت بکە تەماشا دەکات نێرە کەمتیارێکی توکنی گەوزاوە لە پیسی و بۆگەنی خۆیدایە و ئیبراهیم لێ دوور دەکەوێتەوە، و پاشان بە هەر چوار پەلی هەڵدەگیرێت و هەڵدەدرێتە ناو ئاگر و ئیبراهیمش لە بۆگەنی یەکەیدا لوتی خۆی دەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەندەی من باوکت بوو کەوتە خوار، دەفەرموێت: نەخێر ئەو نە بوو سوێند بەگەورەیی تۆ) .

## هاتنە دەرەوەی یەکخواپەرستان لە ئاگر بە سۆز و میهرەبانی خوای گەورە

هەر کەسێك پێشتر وتبێتی: (لا الـه الا الله)خـوای گـەورە دەیهێنێتـە دەرەوە لـە ئـاگر، ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷛ دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ کـە فەرموویـەتی: ((...فأقول (أي: رسول الله ﷺ): يا رَبِّ ائذَنْ لي فيمَنْ قال: لا إلهَ إلاّ الله ؛ قال: لَيسَ ذاك إليكَ و لكِن و عِزّتي و كِبريائي ((و جلالي)) و عَظَمَتي ؛ لأخرِجَنَّ مِنها مَنْ قال: لا إلهَ إلاّ الله))[٣٥٣] واتە: (. . . دەڵێم: (واتە: پێغەمبەر ﷺ): خوای گەورە ڕێگەم بدە تکا بکەم بۆ ئەوانەی کە وشەی (لا اله الا الله)، خوای گەورە فەرمووی: ئەمە بۆ تۆ نی یە بەڵام سوێند بە شکۆمەندی و بەرزی و گەوریی و دەسەڵاتداری خۆم ئەو کەسە لە ئاگر دەهێنمەدەر کە وتوویەتی (لا اله الا الله) لەسەر زمانی بووە)، ئەو کۆمەڵە خەڵکانە دەگرێتەوە کە هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە ئەوانە خوای گەورە دەریان دەهێنێت لە ئاگر، ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...فإذا فَرَغَ اللهُ مِنَ القَضاءِ بينَ

---

[٣٥٣] أخرجه: البخاري (٧٥١٠)، و مسلم (٣٢٦).

العِباد ؛ و أرادَ أنْ يُخرِجَ مِنَ النّارِ مَنْ كانَ لا يُشرِكُ بِالله شيئاً مِمّن أرادَ اللهُ أنْ يَرحَمُهُ مِمّنْ يَقولُ لا إله إلا الله فَيَعرِفُونَهُم بِأثرِ السّجودِ و تأكلُ النّارُ مِنْ ابن آدمَ إلاّ أثَرَ السّجودِ، حرّمَ اللهُ على النّار أنْ تأكلَ أثَرَ السّجودِ ؛ فَيَخرُجونَ مِنَ النّار قَدْ امتُحِشوا...))[٣٥٤] **واتە: (...دوای ئەوەی خوای گەورە بەندەکانی جیا دەکاتەوە و دەیەوێت هەموو ئەو کەسانە دەرکات لە ئاگر کە هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەکروە و لەوانەی کە خوای گەورە ویستی لەسەرە سۆز و میهرەبانی خۆی ببەخشێت پێیان ئەوانەی کەوتویانە (لا إله إلا الله) و دەیان هێنمەدەر ودەیان ناسنەوە بە شوێنی سوجدە و کڕنووش بردنیان کە ئاگری دۆزەخ هەموو لاشەی ئەوەی ئادەم دەسوتێنێت جگە لەو ئەندام و شوێنانەیان کە کوڕنووشیان پێ بردوە بۆ خوا ئەم شوێنە چونکە خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئاگر شوێنی کڕنووش بردن بسوتێنێت، هەموو دێنە دەرەوە لە ئاگر و هەموو پێست شوێنەکانی تریان سوتاوە و ئێسکەکانیان بەدەرەوەیە. . . ).**

**دواتر خوای گەورە موسوڵمانەکان دەباتە بەهەشت دوای هێنانە دەرەوەیان لە ئاگر**

**ئیبن عەباس ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((ما يزالُ اللهُ يَشفَعُ و يُدخِلُ الجَنّة، حتّى يَقولُ: مَنْ كانَ مِنَ المسلمينَ فَلْيَدخُل الجَنّة))[٣٥٥] **واتە: (خوای گەورە بەردەوام تکاکردن وەردەگرێت و خەڵکان دەکاتە ناو بەهەشت، تا دەفەرموێت: هەر کەسێك لە موسوڵمانەکانە با بچێتە ناو بەهەشت).**

**خوای گەورە موسوڵمانەکان دەردەهێنێت لە ئاگر دوای ئەوەی بێ باوەڕەکان گاڵتە جاڕیان پێ دەکەن، ئەبو موسای ئەشعەری و جابری کوڕی عەبدولا ﵄ دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((إذا أجتمعَ أهلُ النّارِ في النّارِ، و مَنْ شاءَ الله مَعَهُم مِنْ أهلِ القِبلةِ، قال الكُفّارُ للمُسلمينَ ((ألَم تكونوا مسلمينَ ؟ قالوا بلى ؛ فَيَقولونَ: أ لَيسَ كُنتُم تَزعمُونَ في الدنيا أنّكُم أولياءُ ...))[٣٥٦] ((ما أغنى عنكُم أنّكُم كُنتُم تَعبدونَ اللهَ ولا تُشرِكونَ بِهِ

---

[٣٥٤] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣) (٧٤٣٨)، مسلم (٢٩٩).

[٣٥٥] أخرجه: الطبراني (١٣/١٤)، والحاكم (٧٠/١) و صححه و وافقه الذهبي، والنسائي (الكبرى) (١٢٢٧١)، وهناد (الزهد) (١٩٠) وقال محققه: اسناده ضعيف.

[٣٥٦] أخرجه: ابن حبان (٧٤٣٢) و قال محققه: حديث صحيح.

شيئاً ...)) [٣٥٧] ما أغنى عَنكُم إسلامُكُم ((و قَد صَيّرتُم مَعنا في النار...))؛ فيقولونَ: كانَ لَنا ذنوبٌ فأُخِذنا بِها، فَيَسمعُ اللهُ عز وجل ما قالوا ((فَيقولُ الجبّار: فَبِعزّتي لأعتِقنَّهُم مِنَ النارِ...)) [٣٥٨] فيأمُرُ بإخراجِ مَنْ كانَ في النّار مِنْ أهلِ القِبلَةِ (أي المسلمين)؛ فَيَخرجونَ فإذا رأى ذلكَ الكُفّارَ (مِنْ أهلِ النارِ) قالوا: يا لَيتَنا كُنّا مسلمين؛ فَنُخرجُ كما أخرَجوا ثُمّ قرأ رسولَ الله ﷺ: ﴿ رُبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴾ (الحجر: ٢))) [٣٥٩] **واتە: (کاتێك ئەهلی دۆزەخ هەموو کۆدەکرێتەوە لە ناو ئاگردا، لەگەڵ ئەوانەی خوا ویستی لێیەتی لەئەهلی قیبلە، لەوێدا بێ باوەڕەکان بە موسوڵمانەکان دەڵێن: ئایا ئێوە موسوڵمان نەبوون؟ دەڵێن: بەڵێ، پێیان دەڵێن: ئێوە لە دونیادا خۆتان بە چاکەکار حساب نەدەکرد ئەوەش هیچ سودێکی پێ نەگەیاندن..؟) (ئێوە خودا تان دەپەرست و هاوەڵتان بۆ پەیدا نەدەکرد...) (ئێوە موسوڵمان بوونتان هیچ سودێکی پێ نەگەیاندن ئەوەتا ئێوە ئێستا لەگەڵ ئێمە لە ئاگر دان. . . )، (دەڵێن: ئێمە هەندێك تاوانمان هەبوو لەسەری سزا دراین، خوای گەورە ئاگای لە ئەم گفت و گۆیانە دەبێت و دەفەرموێت: بە گەورەیی خۆم دەریان دێنم لە ئاگر، و فرمان دەکات بە دەرهێنانی ئەهلی قیبلە لە ناو ئاگر (واتە: باوەڕداران)، وە هەموویان دێنە دەرەوە، لەو کاتەدا بێ باوەڕان (واتە: ئەهلی ئاگر)ئەمە دەبینن و دەڵێن: خۆزگە ئێمەش پێشتر موسوڵمان دەبوین و ئێستا دەردەکراین لە ئاگر وەك ئەوان، ئا لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:** ﴿ رُبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴾ (الحجر: ٢)).

**خوای گەورە سێ کۆمەڵ موسوڵمان دەهێنێتە دەرەوە لە ئاگر لە ئۆمەتی پێغەمبەر ﷺ، و بە سۆز و میهرەبانی خۆی دەیانکاتە ناو بەهەشت، ئەم بڕە لە ئۆمەتی پێغەمبەرن ﷺ خوای گەورە بەڵێنی بەخۆشەویستی خۆی محمد ﷺ داوە کە دەریان هێنێت لە ئاگر، ئەبو**

---

[٣٥٧] أخرجه: الدارمي (٢٧/١)، و صححه الشيخ الألباني في (ظلال الجنة) (٤٠٧/٢).

[٣٥٨] أخرجه: أحمد (المسند) (١٢٤٦٩) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده جيد، و أنظر: (ظلال الجنة)، (٤٠٧/٢).

[٣٥٩] أخرجه: أحمد (١٢٤٦٩) و قال محققه شعيب الأرناؤوط: إسناده جيد، و الدارمي (٢٧/١)، و النسائي (السنن الكبرى) (١١٢٧١) — و (التفسير) (٢٩١) و قال محققه: حديث صحيح بشواهده، ابن جرير (٣/١٤)، ابن أبي عاصم (السنة) (٤٠٥/٢-٤٠٧)، ابن حبان (٧٤٣٢) و قال محققه الأرناؤوط: حديث صحيح، و الحاكم (٢٤٢/٢) و صححه و وافقه الذهبي، و صحح إسناده: الحافظ العراقي، من طريق النسائي: انظر: (الأحياء) (٥٢٩/٤)، و صححه الشيخ الألباني في (ظلال الجنة) (٤٠٧/٢) رقم (٨٤٣).

ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((وَعَدَني رَبّي أنْ يُدخِلَ الجَنّةَ مِنْ أمّتي سبعينَ ألفاً لا حِسابَ عَليهِم... و ثلاثُ حثياتٍ مِنْ حثياتِ رَبِّي عز وجل))[٣٦٠] واتە: (خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم حەفتا هەزار لە ئومەتەکەم بکاتە ناو بەهەشت بە بێ لێپرسینەوە... و سێ مشت لە مشتەکانی خوای گەورە).

(حثية) بە مانای مشت (واتە: پڕ لەپی دەست) دێت و ئەم مشتانە هەندێك لە ئۆمەتی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە و لەوانەیە خوای گەورە ژمارەکە زۆر لەوە زیاتر بکات لە ڕۆژی کۆتایی دا، عوتبەی کوڕی عبد ئەلسەلەمی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... وأرجُوا أنْ يَجعَلَ أمّتي أدنى الحثواتِ الأواخِر))[٣٦١] واتە: (... هیوام وایە ئۆمەتەکەم لە مشتە دواییەکان بێت)، و لە ڕیوایەتێکی تردا: ((... و أرجوا أنْ يَجعَلَني اللهُ في أحدى الحثياتِ الأواخِر...))[٣٦٢] واتە: (... هیوادارم خوای گەورە بۆم بکاتە مشتەکانی کۆتایی...). لەبەر ئەمە بوو ئەبو بەکری صدیق ﷺ داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد داوا لە خوای گەورە بکات تا ئەو ژمارەیە زیاتر بکات، عومری کوڕی خەطاب ﷺ لەوێدا فەرمووی: خوای گەورە توانای هەیە هەموو بوونەوەرەکان بە یەك مشت بخاتە ناو بەهەشت، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... قال رسولُ اللهِ ﷺ): ((إنَّ اللهَ وَعَدَني أنْ يُدخِلَ الجَنّةَ مِنْ أُمّتي أربعَ مِئةِ ألفٍ)) قال (أبوبكر): زِدنا يا رسولَ الله ؛ قال: ((و هكذا)) و جَمَعَ كَفّهُ (مَرّتين) فقالَ عمر: حسبُكَ يا أبا بكرٍ، فقال أبو بكر: دعني و ما عليكَ أنْ يُدخِلَنا اللهُ الجَنّةَ كُلّنا: فقال عمر: إنْ شاءَ اللهُ أدْخَلَ خَلقَهُ الجَنّةَ بِكَفٍّ واحدةٍ (و في رواية ((إنَّ اللهَ قادرٌ أنْ يُدخِلَ النّاسَ بِحُفنةٍ

---

[٣٦٠] أخرجه: أحمد (٥/٢٦٨)، و الترمذي (٢٤٣٧) و قال: حديث حسن غريب، و ابن ماجة (٤٢٨٦)، و قال ابن كثير في (تفسير القرآن العظيم) (١/٥٥٨): أخرجه ابن أبي عاصم في (السنة) و الطبراني بإسنادٍ جيد، و قد صححه العلامة الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٨٤)، و في (صحيح ابن ماجة) (٣٤٥٩)، و في (السلسلة الصحيحة) (٢١٧٩)، و في (صحيح الجامع) (٧١١١).

[٣٦١] أخرجه: أحمد (٤/١٨٣)، و ابن حبان (٧٢٤٧) و قال محققه: حديث صحيح لغيره.

[٣٦٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧/٣١٢) و رواه الحاكم بإسنادٍ صحيح، كما قال الحافظ في (الإصابة) (٤/٨٩).

واحدةٍ..)))[٣٦٣] فقال رسول الله ﷺ: صَدقَ عمر))[٣٦٤] واته: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە چوار سەد هەزار کەس لە ئۆمەتەکەم بباتە بەهەشت، ئەبو بەکر ﷺ فەرمووی: ژمارەکەمان بۆ زیاتر کە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئابەم شێوەیە (دوو جار هەردوو لەپی دەستی خستە پاڵ یەك) عومەرﷺ فەرمووی: لێرەدا ڕاوەستە ئەبو بەکر، ئەبو بەکر فەرمووی: وازبێنە و لێم دوور کەوە ئەی حەز ناکەیت خوای گەورە هەمووومان بباتە بەهەشت، عومەر فەرمووی: ئەگەر خوا ویستی بێت (ان شاء الله) ئەوا بەیەك مشت هەمووومان دەکاتە ناو بەهەشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عمر ڕاست دەکات).

دواتر ئەوانەی یادی خوایان کردووە و لە خوا ترساون، خوای گەورە دەریان دێنێت لە ئاگر، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: (([يقولُ اللهُ تعالى: أخرجوا مِنَ النّارِ مَنْ قالَ لا إلهَ إلاّ اللهُ] [من شهد أن لا إله الا الله يوماً واحداً مخلصاً ومات على ذلك]))[٣٦٥] و في رواية ((. . مَنْ ذَكَرَني يوماً أو خافَني في مقامٍ...))[٣٦٦] واتە: (([خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەس وتبێتی (لااله الا الله) دووری بخەنەوە لە ئاگر]، [هەر کەسێك ڕۆژێك شایەتی (لااله الا الله)ی بە دڵسۆزی دابێت و لەسەر ئەو کارە مردبێت])), لە ڕیوایەتێکی لاوازدا: . وە ئەو کەسەش کە ڕۆژێك یادی منی کردبێت یاخود لە من ترسا بێت بیهێننەدەر لە ئاگر)).

خوای گەورە کەسێك دەردێنێت لە ئاگر بە سۆز و میهرەبانی خۆی لەبەر ئەوەی ئەو کەسە گومانی باشی هەبووە بەرامبەر خوای گەورە، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە

---

[٣٦٣] أخرجه: أحمد (١٩٣/٣) رقم (١٣٠٠٧) و قال محققه ألأرناؤوط: حديث صحيح إسناده حسن، والطبراني (الأوسط) (٣٤٠٠) وقال محققه: اسناده صحيح، و قال الهيثمي في (المجمع) (٤٠٤/١٠): رواه أحمد و الطبراني في (الأوسط) بإسنادٍ حسن.

[٣٦٤] أخرجه: أحمد (١٦٥/٣)، رقم (١٢٦٩٥) و قال محققه ألأرناؤوط: إسناده صحيح، عبدالرزاق (٢٠٥٥٦)، البزار (٣٥٤٥)، البغوي في (شرح السنة) (٤٣٣٥) و قال محققه: إسناده صحيح.

[٣٦٥] أخرجه: الحاكم (٧٠/١) صححه و وافقه الذهبي، و البيهقي (الشعب) (٧٤٠)، و الترمذي (٢٥٩٣)، وأحمد (١٢٨٢٤) و الزيادة له، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٣٩).

[٣٦٦] أخرجه: الترمذي (٢٥٩٤) و قال: حديث حسن غريب، و ابن خزيمة (١٩٢)، و الحاكم (٧٠/١) و صححه و وافقه الذهبي، وضعفه الشيخ الألباني في (ظلال الجنة) (٨٥٨)، و (ضعيف الترغيب) (١٩٦٥).

لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَخرُجُ مِنَ النّار أربَعةٌ فَيُعرَضونَ على الله "و في رواية" ((يَخرُجُ رجُلان مِن النّار ؛ فَيُعرَضانِ على الله، ثُمَّ يُؤمَرُ بهما إلى النّار فيَلْتفِتُ أحَدُهما ؛ فيَقولُ: يا رَبِّ: ما كانَ هذا رجائي ؛ قال: و ما كانَ رجاؤُكَ ؟ قال: كانَ رَجائي إذ أخرجتَني مِنها أنْ لا تُعيدني فيها ؛ فيُنجيَهُ اللهُ ))[٣٦٧] فيرحَمُهُ . . . فيُدخِلَهُ الجنّة))[٣٦٨] واتە: (چوار کەس دێنە دەرەوە لە ئاگر و دەبرێنە بەردەم خوای گەورە، لە ڕیوایەتێکدا: دوو پیاو دێنە دەرەوە لە ئاگر و دەچنە بەردەم خوای گەورە، و دواتر فرمانیان پێ دەکرێت کە بڕۆنەوە ناو ئاگر، بەڵام یەکێکیان ئاوڕ دەداتەوە و دەڵێت: خوای گەورە ئەمە هیوای من نەبوو بە تۆ دەفەرموێت: ئەی هیوای تۆ چۆن بوو؟ دەڵێت: هیوام وابوو کە تۆ منت دەرهێنا لە ئاگر من نەگەڕێنیتەوە ناوی جارێکی تر، خوای گەورەش ڕزگاری دەکات و بەسۆز و میهرەبانی خۆی دەیخاتە بەهەشت).

دواتر خوای گەورە دوو کەس دێنێتە دەرەوە لە ئاگر یەکەمیان لە فرۆشتندا دڵ نەرم بووە و دووەمیان لە خوا ترساوە و هەر دووکیان دەکاتە ناو بەهەشت، ئەبو بوکری صدیق ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((. . يَقولُ اللهُ عز وجل: أنا أرحمُ الراحمين: ادخِلوا جَنّتي مَنْ كانَ لا يُشرِكُ بي شيئاً ؛ فيَدخلونَ الجنّة، ثُمَّ يَقولُ اللهُ تبارك و تعالى: انظرُوا في النّار هلْ فيها مِنْ أحدٍ عَمِلَ خيراً قط ؟ فيَجِدونَ في النّار رجُلاً؛ فيُقال لَهُ: هلْ عِملتَ خيراً قط ؟ فيقولُ: لا غيرَ أنّي كُنتُ أسامِحُ النّاس في البيعِ: فيقولُ اللهُ: اسمِحوا لِعَبدي كاسماحِهِ إلى عَبدي ؛ ثُمَّ يُخرجُ مِنَ النّار آخر ؛ فيُقال له: هلْ عَمِلتَ خيراً قط؟ فيَقولُ: لا ؛ وفي رواية [ لم يعمل خيراً قط الا التوحيد] غيرَ أنّي كنتُ أُمِرتُ وَلَدي إذا متُّ فاحرِقوني بِالنّار ثُمّ اطحِنُوني حتّى إذا كنتُ مثلَ الكُحلِ ؛ إذهبوا بي إلى البَحرِ فَذُرّوني في الرّيح، فقال الله: لِمَ فَعَلتَ ذلكَ ؟ قالَ: مِنْ مخافَتِكَ ؛ [فغفر له بها ولم يعمل خيرً قط الا توحيد] فيقولُ انظُر إلى مُلكِ أعظمِ مَلِكٍ فإنَّ لكَ مثلَهُ و عَشرة أمثالِهِ...))[٣٦٩] واتە:

---

[٣٦٧] أخرجه: ابن حبان (٦٣٢) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣٦٨] أخرجه: مسلم (١٩٢) في(كتاب الإيمان).

[٣٦٩] أخرجه: أحمد (٤/١) (١٥) وقال محققه: اسناده حسن، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٧٤/١٠): رواه أحمد و أبو يعلى (٥٦) بنحوه و البزار (٧٦)و رجالهم ثقات، وأخرجه ابن أبي عاصم في (السنة) (٧٥١)، و قال الشيخ أحمد

(...خوای گەورە دەفەرموێت: من (ارحم الراحمین)م با ئەوانە بچنە ناو بەهەشت کە هاوەڵیان بۆ پەیدا نەکردووم، و دەچنە بەهەشت، خوای گەورە دەفەرموێت: تەماشای ناو ئاگر بکەن ئایا کەسی تێدایە کاری چاکەی کردبێت، پیاوێك بەدی دەکەن، پێی دەوترێت: ئایا کاری چاکەت کردووە، دەڵێت: من تەنها دڵ نەرم بووم و چاوپۆشیم لە خەڵکان دەکرد لە فرۆشتندا، خوای گەورە دەفەرموێت: چاوپۆشی لەو بەندەیەم بکەن وەك چۆن ئەو چاوپۆشی لە بەندەکانم دەکرد، دواتر یەکێکی تر دێتە دەرەوە لە ئاگر، پێی دەوترێت: ئایا کاری چاکەت کردووە، دەڵێت: من تەنها فرمانم بە کوڕەکەم کردووە کە دوای ئەوەی مردم لە ئاگردا بمسوتێنن و پاشماوەکەی لاشەکەم بهاڕن تاوەکو کلی لێ دێت پاشان بمبەن بۆ سەر دەریا و بمدەن بەدەم باوە (واتە: تۆزەکەم بپژێنن بە ناو بادا، خوای گەورە دەفەرموێت: بۆ ئەوەت کرد؟ دەڵێت: لە ترسی تۆ، خوای گەورە دەفەرموێت: تەماشای سامانی گەورەترین پاشا بکە ئەوە هی تۆیە لەگەڵ دە ئەوەندەدا. . .) لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لیُصیبَن أقواماً سفع من النار عقوبة بذنوب اصابوها ثم لیُدُ خلنَّهم الله الجنة بفضل رحمته))[٣٧٠] واتە: (کۆمەڵە کەسانێك تووشی سوتان دەبن بە ئاگر لە سزای تاوانەکانیان کە ئەنجامیان داوە پاشان خوای گەورە بەمیهرەبانی و بەزەیی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە).

دواتر خوای گەورە مشتێك لە ئەهلی ئاگر دەردێنێت کە هیچ کارێکی چاکەیان نەکردووە، و دەیاتباتە بەهەشت، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((. . فَیقولُ اللهُ عز و جل: شَفَّعَتِ الملائِکة و شَفَّعَ النبیونَ و ((و شَفَّعَ المؤمنون)) و لَمْ یبقَ إلاّ أرحمُ الراحمینَ فَیَقبِضُ قَبضةً مِنَ النّارِ بها القوم لَمْ یَعملوا خیراً قط قد عادوا حمماً. . .))[٣٧١] واتە: (. . خوای گەورە دەفەرموێت: مەلائیکەکان تکایان

---

شاکر في تحقیقه لمسند الإمام أحمد (١/١٦٦): إسناده صحیح، و أخرجه ابن حبان (٦٤٧٦) و قال محققه: إسناده جید، وقال الشیخ الألباني في (الصحیحة) (٣٠٤٨): اسناده صحیح.

[٣٧٠] اخرجه: البخاري (٧٤٥٠)، ابن ابي عاصم (السنة) (٨٧١) وقال محققه: صحیح، وابن خزیمة (توحید) (٦١٢)، وابو یعلی (٣٠١٣).

[٣٧١] أخرجه: البخاري (٤٧٣٩)، و مسلم (٣٠٢) في (کتاب الإیمان).

کرد و پێغەمبەران تکایان کرد و باوەڕداران تکایان کرد، تەنها (ارحم الراحمين) ماوە ئەنجا بە مشتی خۆی مشتێك لە ئەهلی ئاگر دەردەهێنێت کە هیچ کارێکی چاکەیان نەکردووە، بەم شێوەیە شەفاعەتی شەفاعەتکاران و سۆز و میهرەبانی خوای گەورە هەموو باوەڕدارە تاوانبارەکان دەگرێتەوە، و دێنە دەرەوە لە ئاگر و بێ باوەڕان خۆزگە دەخوازن کە ئەوانیش موسوڵمان بوونایە، و سەریان بەرز دەکەنەوە و هیوا بەوە دەخوازن بەلام نەخێر هەرگیز وا نابێت).

ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... لا تزالُ الشفاعة بِالناسِ وهم يَخرجُونَ مِنَ النّار ؛ حتّى إنَّ إبليس الأباليس لَيَتطاول لها رجاءَ أنْ تُصِيبَهُ...))[٣٧٢] واتە: (تکا کردن بەردەوامە بۆ خەڵکان تا دێنە دەرەوە لە ئاگر، هەتا ابلیس کە (شەیتانی شیتانەکانە) چاوەڕوانی ئەو تکاکردنەیە تا بەرکەوێت...). بەلام ئەم فرموودەیە لاوازە و تەنها لەبەر زانیاری هێناومە.

## چۆنیەتی هێنانە دەرەوەی باوەڕداران لە دۆزەخ

خوای گەورە ئەوکاتەی کە ویستی موسوڵمانەکان بێنێتە دەرەوەی ئاگر، فەرمان بە مەلائیکەکان دەکات کە هەموو ئەو کەسانە بهێننە دەرەوە کە شایەتی یەکخواپەرستیان دابێت، مەلائیکەکان دێن بۆ لایان و دەیان ناسنەوە بە شوێنی کڕنووش بردن یان، و بە کۆمەڵ بەرەو ڕووباری بەر دەرگای بەهەشت دەبرێن، کە پێی دەوترێت ڕووباری ژیان، وەك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...حتّى إذا فَرَغَ الله مِنَ القضاءِ بينَ عِبادِهِ ؛ و أرادَ أنْ يُخرِجَ مِنَ النّار مَنْ أرادَ مِمّن كان يشهدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله ؛ أمر الله الملائكة أن يُخرِجوهُم، فيعرفونَهُم بِعلامةِ آثارِ السجود...فَيَخرِجونَهُم قد

---

[٣٧٢] أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٠٥١٣)، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٠/٣٨٠) فيه كثير بن يحيى وهو ضعيف، واخرجه: الاجرى (الشريعة) (٨٢٩) وقال محققه رجاله ثقات، و هناد (الزهد) (١٨٦) وقال محققه: اسناده صحيح من قول الحارث بن سويد.

امتحشوا((...قد اسودّوا...))[٣٧٣]))[٣٧٤] واتە: (... کاتێك کە خوای گەورە خەڵکان جیا دەکاتەوە وە دەیەوێت ئەوانە دەرکات لە ئاگر کە خۆی ویستی لێیەتی، ئەویش ئەوانەن کە شایەتی یان داوە بە (لااله الا الله) لە خوای گەورە فەرمان بە مەلائیکەکان دەکات دەریان کەن، ئەوانیش بە نیشانەی شوێنی کڕنووش بردنیان دەیان ناسنەوە و... مەلائیکەکان دەریان دێنن هەموو بڕژاون پارچە گۆشت بە ئێسکانیانەوە ماوە و هەموو ڕەش هەڵگەڕاون...).

ئەو کەسانە سوتاون بە پێی کردەوەکانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((...مِنهُم مَنْ تأخذُهُ النّارُ إلى كعبيهِ، و مِنهم مَنْ تأخُذه النّارُ إلى ركبَتِهِ و مِنهُم مَنْ تأخُذُهُ النّارُ إلى حجزَتِهِ ... و مِنهُم مَنْ تأخذُهُ النّارُ إلى ترقوتِهِ))[٣٧٥] واتە: (.. هەیانە ئاگر تا قولەپێی گەیشتوە و سوستاوە، وەهەیانە ئاگر تا سەر ئەژنۆی گەیشتوە و سوتاوە، وەهەیانە ئاگر تا پشتێنەی گەیشتوە وە سوتاوە. وەهەیانە ئاگر تا قورقوڕاگەی گەیشتوە وسوتاوە).

دواهەمین کۆمەڵە خەڵکانە دوای هێنانە دەرەوەیان لە ئاگر مەلائیکەکان دەیانخەنە بەردەم بەهەشت، وەك لەم فەرموودە پیرۆزانە داهاتووە: ((.. فَيَلقيهم في نهرٍ في أفواه الجَنّة))[٣٧٦] واتە: (.. فڕیان دەدەنە ڕووبارێك لە بەردەم کانیاوەکانی بەهەشتدا)، لەڕیوایەتێکدا: ((... نهرٍ في أدنى الجَنّة))[٣٧٧] واتە: (ڕووبارێك لە کۆتایی بەهەشت)، ئەم ڕووبارە لەبەر دەرگاکانی بەهەشت دایە ، وەك لە ئەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە: ((... و يُطرَحونَ على أبوابِ الجَنّة ...))[٣٧٨] واتە: (... دەبرێنە بەر دەرگاکانی بەهەشت...)، ئەو ڕووبارە ڕووباری ژیانە، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە: ((... في أفواه الجَنّة يُقال له نهرُ الحياة))[٣٧٩] واتە: (... لە بەر دەم دەرگاکانی بەهەشتدا ڕووبارێکە پێی دەوترێت

---

[٣٧٣] أخرجه: أحمد (٢/٢٧٥)، والبخاري (٢٢، ٨٠٧)، ومسلم (١٨٢، ١٨٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٩٥٩)، (ظلال الجنة): (٨٢).

[٣٧٤] أخرجه: أحمد (٢/٢٧٥)، و البخاري (٧٤٣٧)، مسلم (١٨٢).

[٣٧٥] أخرجه: مسلم (٢/٥٣٦) في (كتاب الجَنّة).

[٣٧٦] أخرجه: البخاري (٤٧٣٩).

[٣٧٧] أخرجه: ابن حبان (٧٤٣٣): و قال محققه إسناده قويّ.

[٣٧٨] أخرجه: أحمد (٣/٣٩١)، و الترمذي (٢٥٩٧) و قال حسن صحيح، وصححه الألباني في (الصحيحة) (٢٤٥١).

[٣٧٩] أخرجه: البخاري (٤٧٣٩) و أنظر: (ظلال الجنة) (٢/٤٠٧).

ڕووباری ژیان)، ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...في نهرٍ يُقالُ له الحَيَوان...))[٣٨٠] واتە: (ڕووبارێکە ناو دەبرێت بە ژیان)، لە ڕیوایەتێکدا: ((... فيُرَشُّ عليهم أهلُ الجَنّة الماءَ ...))[٣٨١]، ((...ماءَ الحياة...))[٣٨٢] واتە: (... ئەهلی بەهەشت ئاویان بەسەردا دەڕژن. . . ) کەناوی (. . . ئاوی ژیان. . . ) ((قيل: يارسول الله. ما ماء الحياة؟ قال: ((غسل أهل الجنة))[٣٨٣] واتە: (ووترا: ئەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) ئاوی ژیان چی یە ؟ فەرمووی ئەو ئاویە کە بەهەشتیەکان خۆیانی پێ دەشۆن). .

دواتر خوای گەورە لاشەیان بۆ دروست دەکاتەوە، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە: (((... ويَذهَبَ حُراقَهُ...))[٣٨٤] ... فَيَنبِتونَ (في حافَتيهِ) كما تُنبِتُ الحَبّة في حَميلِ (غثاءِ) السَّيلِ (قد) رأيتموُها إلى جانبِ الصّخرةِ أو جانبِ الشّجَرة(... ألَمْ ترُوها كيفَ تَخرُجُ صفراً مُلتَوية...))[٣٨٥] ، فما كانَ إلى الشّمسِ مِنها كانَ أخضَر في رواية و ما كانَ إلى الظّلِ كانَ أبيضَ...))[٣٨٦] واتە: (. . . [سوتاویەکانیان نامێنێت] و جەستەیان بۆ دروست دەبێتەوە لە قەراخی هەر دوو لای ڕووبارەکەدا، وەك چۆن دەنکە دانەوێڵەیەك لە شوێنی پاش ماوەی لافاودا [نابینن ئەو دەنکە جۆ دروست دەبنەوە هەموو سەر تۆپەکانیان زەرد ولول دەبێت] بینیوتانە چۆن لە پەنابەردێکدا یاخود لە پەنا درەختێکدا سەر دێنێنە دەرەوە، ئەوەی لەبەر ڕۆژ بێت سەوز دەبێت، ئەوەی لەبەر سێبەر ببێت سپی دەبێت. . . ).

دواهەمین کۆمەڵە کەسان کە دێنە دەرەوە لە ئاگر ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دەری هێناون بە سۆز و میهرەبانی خۆی، بە بێ ئەوەی هیچ کارێکیان کردبێت، ئەوانە لە نێوان

---

[٣٨٠] أخرجه: ابن حبان (٧٤٣٣) و قال محققه: إسناده قويّ.

[٣٨١] أخرجه: الترمذي (٢٥٩٧)، و صححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٤٥١).

[٣٨٢] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣).

[٣٨٣] أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٥٨٥/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الشيخ المقبل (الشفاعة) (ص: ١٥٩) حديث حسن

[٣٨٤] أخرجه: مسلم (٩٩/١).

[٣٨٥] أخرجه: مسلم (٩٥/١) (١٨٤) (باب إثبات الشفاعة).

[٣٨٦] أخرجه: البخاري (٤٢٠/١٣) رقم (٧٤٣٩، ٤٩١٩، ٤٥٨١).

هەردوو چاویان دەنوسرێت (ئەمانە ڕزگارکراونی خوای گەورەن). ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((.... و يَكتُبَ بينَ أعيُنِهِم هؤلاء عُتقاءُ اللهِ فَيُذهبُ بِهِم فَيُدخِلُهُم الجَنّة ؛ فَيقولُ لَهُم أهلُ الجنّة: هؤلاء الجَهَنَميّون ؛ فَيقولُ الجَبّارُ: بلْ هؤلاءِ عُتقاءُ الجَبّارِ))[٣٨٧] واتە: (. . . وە لەناو چەوانیان دەنوسرێت ئەمانە ڕزگارکراوانی خوای گەورەن، دەبرێن و دەکرێنە ناو بەهەشت، ئەهلی بەهەشت پێیان دەڵێن: ئەوانە دۆزەخی یەکانن، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانە ڕزگارکراوی خوای بەدەستەلاتن).

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە بۆچی ئەوانە ناو دەبرێن بە دۆزەخی یەکان، ئەوەش لەبەر ڕەشاییەك کەلە دەم و چاویاندایە و داوا لە خوای گەورە دەکەن، ئەو ڕەشایی و ناوەیان لەسەر لاببات، ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((. . قال: فَيُسَمّونَ في الجَنّة الجَهَنّمِيّن مِنْ أجل سوادٍ في وُجوهِهِم ؛ فَيقولون: رَبّنا اذهبْ عنّا هذا الإسم، قال: فيأمُرُهُم فَيَغتَسِلونَ في نَهرٍ في الجَنّة ؛ فَيَذهبُ ذلك مِنهُم...))[٣٨٨] واتە: (. . فەرمووی: ئەوان لە بەهەشت ناو دەبرێن بە دۆزەخی یەکان لەبەر ڕەشاییەك لە دەم وچاویاندا ، و دەڵێن: خوای گەورە ئەو ناوەمان لەسەر لابە، فەرمووی: خوای گەورە فرمانیان پێ دەکات و ئەوان خۆیان دەشۆرن لە ڕووبارێکی ناو بەهەشت، ئیتر ئەو ناوە ڕەشیەیان لەسەر لادەبرێت. . . ).

لە ڕیوایەتی دووەم دا پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە ئەو کۆمەڵەی دوایی کە خوای گەورە ڕزگاریی کردوون، لە ئاوی ژیان دێنەدەرەوە وسپی دەبنەوە وەك مرواری (لؤلؤە) و مۆرێك وەك ئەنگوستیلە دەکرێتە ملیان و ئەهلی بەهەشتبەوە دەیان ناسنەوە و، خوای گەورە لێیان ڕازی دەبێت، ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە

---

[٣٨٧] أخرجه: الدارمي (٢٧/١)، و صححه الشيخ الألباني في (ظلال الجنّة في تخريج السنة) (٤٠٧/٢)، وأخرجه أيضاً: أحمد: (المسند) رقم (١٢٤٩٦) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده جيد، و النسائي (الكبرى) (٧٦٩٠)، و البيهقي (الدلائل) (٤٧٩/٥)، و (شعب الإيمان) (١٤٨٩).

[٣٨٨] أخرجه: ابن حبان (٧٤٣٢) و قال محققه: حديث صحيح.

فەرموویەتی: ((... فَيَخرجونَ مثلَ اللؤلُؤةِ ؛ فَيَجعل في رِقابِهِمُ الخواتيمُ...))[٣٨٩] واتە: (...دێنە دەرەوە وەك مرواری و ئەنگوستیلە دەکرێتە یاخود مۆر دەدرێت لە گەردنیان...).

لە ڕیوایەتێکدا: ((... في أعناقِهِم الخواتيمُ ؛ يَعرِفُهُم أهلُ الجَنّة ؛ فَيقولُ أهلُ الجَنّة: هؤلاء عُتقاءُ اللهِ الذينَ ادخَلَهُم اللهُ الجَنّة بِغيرِ عملٍ عَمَلوهُ ؛ و لاخيرَ قَدَّموهُ ؛ ثُمَّ يَقولُ: أدخِلُوا الجَنّة ؛ فما رأيتمُوهُ فَهو لَكُم ((لو ضافَ أحدَهُم أهلَ الدُنيا لأطعَمَهُم و سَقاهُم و فَرَشَهُم، و زَوَّجَهُم لا ينقصُ ذلكَ مِمّا عِندَهُ ...))[٣٩٠] فَيَقولونَ: رَبّنا أعطَيتَنا ما لَمْ تُعطِ أحداً مِنَ العالمينَ ؛ فَيقولُ: لَكُمْ عِندي أفضلُ مِنْ هذا ؛ فَيقولونَ: يا رَبّنا و أي شيءٍ أفضلُ مِنْ هذا ؟ فَيقولُ تعالى: رِضائي فلا أسخَطَ عليكُم بَعدَهُ أبداً))[٣٩١] واتە: (. . . مۆر لە ملیان دا هەیە و ئەهلی بەهەشت بەوە دەیان ناسنەوەو ئەهلی بەهەشت دەڵێن: ئەوانە ڕزگارکراوانی خوای گەورەن کە کردونیەتە بەهەشت بە بێ ئەوەی کردارێکی چاکە و خێریان ئەنجام دابێت، پاشان بەوان دەفەرموێت: بچنە ناو بەهەشت ئەوەی بینیتان بۆ ئێوەیە [ گەر یەکێك لە وانە هەموو خەڵکانی دونیا ببێتە میوانی دەتوانێت خواردن و خواردنەوە و جێگەی نوستن و خێزانیان بۆ دابین بکات. . . ]، دەڵێن خوای گەورە ئەوەی بە ئێمەت بەخشیوە بە کەسیتر نەبەخشیوە، دەفەرموێت: ئێوە لای من لەوە باشترتان هەیە، دەڵێن: خوای گەورە چ شتێك لە ئەمە باشترە ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ڕازی بوونی خۆمتان پێ دەبەخشم و هەتا هەتایە لێتان زویر نابم)، لەوانەیە ئەو کەسانەی کە ڕزگار دەبن لە ئاگر و دێنە درەوەی ئاگر خەڵکی(اعراف)ین کە خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا کە بانگ لە ئەهلی ئاگر و ئەهلی بەهەشت دەکەن، و چاویان لەوەیە بچنە ناو بەهەشت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ . . . وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴾ (الأعراف: ٤٦).

---

[٣٨٩] أخرجه: البخاري (٤٩١٩).

[٣٩٠] أخرجه: أحمد (٤٥٤/١)، وعبد الرزاق (٤٠٩/١١)، و أبو يعلى (٤٩٧٩)، و ابن حبان (٧٤٣٢) و قال محققه: إسناده قوي رجاله ثقات ؛ عن ابن مسعود، و أخرجه أيضا: اللالكائي: (شرح إعتقاد أهل السنة و الجماعة) رقم: (٢٠٧٠)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٠٥٤).

[٣٩١] أخرجه: البخاري (٤٧٣٩).

حوزەیفە ﷺ دەفەرمویێت: ((أصحاب الأعراف: قومٌ تجاوزت بهم حسناتهم عن النار و قصرت بهم سيئاتهم عن الجنة))[٣٩٢]. واتە: (هاوەڵانی ئەعراف کەسانێکن: چاکەکانیان ڕزگاری کردوون لە دۆزەخ و گوناهەکانیان دوای خستوون لە چوونە ناو بەهەشت).

بەڵام لە دواییدا خوای گەورە بە سۆز و ڕەحمەتی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە، ئیمامی موجاهید لە عەبدوڵای کوڕی حاریس ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((أصحاب الأعراف: ينتهى بهم الى نهر يُقال له الحياة، حافتاه قصبُ الذهب قال: اراه مكلل باللؤلؤ فيغسلون منه إغتسالة فيبدو في نحورهم شامة بيضاء قال: ثم يعودون فيغتسلون، فكلما اغتسلوا ازدادتْ بياضاً فيقال لهم: تمنوا ما شئتم. قال فيتمنون ما شاؤا، فيقال لهم: لكم ما تمنيتم وسبعون ضعفة قال فهم مساكين أهل الجنة))[٣٩٣]. واتە: (هاوەڵانی ئەعراف دەبرێن بۆ ڕووبارێك کە ناوی (الحياة) (واتە: ڕووباری ژیان) هەر دوولای ڕووبارەکە ئاڵتونە و ڕازاوەیە بە مرواری لەوێدا خۆیانی تیا دەشۆن و خاڵ و نیشانەیەکی سپی بە گەردنیانەوە دەردەکەوێت، پاشان دەگەڕێنەوە وخۆیانی تیادەشۆنەوە و لە دوای هەموو شۆردنێکیان زیاتر سپی دەبنەوە پاشان پێیان دەوترێت: ئاوات بخوازن و ئەوەی ویستتان لێیەتی داوای بکەن؟ ئەوانیش ئاوات و داوای خۆیان پێشکەش دەکەن وپێیان دەوترێت: ئەوەی داواتان کرد ئەوەندە و حەفتا ئەوەندەی تر بۆ ئێوە. (ئەوانەش پێ دەچێت هەژارو کەم دەستەکانی بەهەشت بن (والله أعلم) واتە: لە پلە نزمەکانی بەهەشتبن نەك ئەوانە لە نزمترین پلەی بەهەشتدان).

---

[٣٩٢] أخرجه: الطبري (١٣٧/٨)، و هناد (الزهد) (٢٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٣٩٣] أخرجه: هناد (الزهد) (١٩٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

# دواهەمین کەس کە دەردەهێنرێت لە ئاگر و دەکرێتە ناو بەهەشت

باسی دوا پیاو کراوە لە چەند فەرموودەیەکی پیرۆزدا بە چەند شێوەیەکی جیاواز کە یەکتر تەواو دەکەن، دوای کۆکردنەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی تایبەتن بەم باسە لە هەردوو (صحیح)ەکەدا و چوار (السنن)کەی تر و(مسند)ی احمد و (صحیح)ی ابن حبان و (ومستدرك) حاکم و ئەوانی تر فەرموودەکەمان بەتەواوی دەست دەکەوێت بەم شێوەیە دەبێت:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... ثُمَّ يَفرَغُ اللهُ مِنَ القَضاءِ بينَ العِباد ؛ و يَبقى رَجُلٌ (...على شَفَتِها...)[٣٩٤] بين الجنة والنار، و هو آخر اهل النار دخولا الجنة و (آخر أهل الجنة خروجا من النار)[٣٩٥] مقبل بوجهه قبل النار، فيقول: يا رب أصرف وجهي عن النار (فإنه) قد قشبني ريحها، و أحرقني ذكاءها فيدع الله ما شاء أن يدعوه، ثم يقول الله تبارك و تعالى: هل عسيت (إن فعلت ذلك أن تسأل غيره؟ فيقول: لا و عزتك) (لا أسألك غيره فيعطي الله من) (عهود و مواثيق) فيصرف الله وجهه عن النار))[٣٩٦] و في رواية: ((. . يَخرُجُ مِنَ النّارِ حبواً (زَحفاً) ))[٣٩٧] واتە: (...دوای ئەوەی خوای گەورە چارەنوسی بەندەکان یەکلا دەکاتەوە و پیاوێك دەمێنێت (. . . لە لێواری دۆزەخ دا. . . ) نێوان بەهەشت و دۆزەخ، ئەویش دوا کەسە لە ئەهلی ئاگر کە دەچێتە بەهەشت و (دوا کەسی ئەهلی بەهەشتە کە دەربهێنرێت لە ئاگر)، ڕووی کراوەتە ئاگر، دەڵێت: خوای گەورە ڕووم وەرگێڕە لە ئاگر بۆگەنەکەی ژەهراوی کردووم وتین و بڵێسەکەی منی سوتاندوە، ئەو کەسە ئەوەند داوا دەکات پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[٣٩٤] أخرجه: أحمد (٣/٢٦)، و ابو يعلى (١٢٥٥) ، و إبن حبان (٧٣٧٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣٩٥] أخرجه: مسلم (١٨٦)، و إبن حبان (٧٤٧٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما

[٣٩٦] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣) (٧٤٣٧) (٧٤٣٩)، و مسلم (٢٩٩) (٣٠٢).

[٣٩٧] أخرجه: مسلم (١٨٦)، و إبن حبان (٧٤٧٥).

پێدەچێت ئەوەت بدەمێ تۆ داوای شتی تر بکەیت؟ دەڵێت: نا سوێند بە شکۆمەندیت داوای هیچی ترت لێ ناکەم، ئەنجا پەیمان و بەڵێنێکی زۆر دەدات بە خوای گەورە، پاشان خوا ڕووی وەردەگێڕێت لە ئاگر و [بەگاگۆڵکی و لەسەر سنگ خشاندن دێتە دەرەوە)]، و ئەم پیاوە تەنها تاوانە بچوکەکانی دەکرێتە بەر چاو، ئەبو ذەر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((... أنِّي لأعْلَمُ آخِرَ أهلِ الجَنّة دخولاً الجَنّة و آخِرَ أهلِ النّارِ خروجاً مِنها ؛ رَجُلٌ يؤتى بِهِ يومَ القيامةِ ؛ فَيُقالُ: اعرِضوا عليهِ (... سَلوُهُ عنْ...)[٣٩٨] صِغارِ ذنوبِهِ ؛ وارفَعوا عَنهُ كِبارُها ؛ فَيُعرضُ عليهِ صِغارُ ذُنُوبِهِ ؛ فَيُقالُ: عَمِلتَ يومَ كذا و كذا و كذا ؛ و عَمِلتَ يوم كذا و كذا و كذا، فيقولُ: نَعَم (... وهوَ مُقِرٌّ...) لا يَستطيعَ أنْ يُنكِرْ ؛ وهو مُشفِقٌ مِنْ كبارِ ذنوبِهِ أنْ تَعَرَضَ عَليهِ ؛ فَيُقالُ لَهُ: فإنَّ لَكَ مكانَ كلِّ سيئةٍ حَسَنةٍ ؛ فَيقولُ: يا ربِّ لَقَدْ عَمِلتُ أشياءَ (... إنَّ لي ذنوباً...) لا أراها هَهُنا ؛ فَلَقد رأيتَ رسول الله ضَحِكَ حتّى بَدَتْ نواجِذهُ))[٣٩٩] واتە: (... من دەزانم کێ دواهەمین ئەهلی بەهەشتە کە دەچێتە ناو بەهەشت و دواهەمین ئەهلی ئاگرەکە دێتە دەرەوە لە ئاگر، (لە موسوڵمانەکان) پیاوێکە دەیهێنن لە ڕۆژی کۆتایی دا، و دەوترێت: نیشانی بدەن و (... پرسیاری لێ بکەن تەنها...) سەبارەت بە تاوانە بچوکەکانی، و تاوانە گەورەکانی لێ وون بکەن لەسەری لابەن، تاوانە بچوکەکانی نیشان دەدەن، پێی دەوترێت: لە فلان ڕۆژدا تۆ ئەوە و ئەوە و ئەوەت ئەنجام داوە وە لە فلان ڕۆژیشدا ئەوە و ئەوە و ئەوەت ئەنجام داوە، دەڵێت: بەڵێ (... ئەو دان بە تاوانەکانیدا دەنێت...) و ناتوانێت خۆی لێ بێ بەری بکات، وترسی ئەوەی هەیە تاوانە گەورەکانی نیشان بدرێت، و پێ ی دەوترێت: تۆ لە جێی هەموو خراپەیەك کە ئەنجامت داوە چاکەیەکت بۆ نوسراوە، دەڵێت: خوای گەورەچەند کردارێکم کردووە، (... لەگەڵ چەند تاوانێکدا...) نایبینم لێرەدا، ئالەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنە گرتی تا کاکیلەکانی دەرکەوتن)، ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إني لأعلم آخر رجل من أمتي يجوز الصراط، رجل يتلوى على الصراط كالغلام حين يضربه أبوه، تزل يده مرة، فتصيبها

---

[٣٩٨] في رواية الترمذي (٢٥٩٦).

[٣٩٩] أخرجه: أحمد (٥/١٥٧/١٧٠)، و مسلم (١٩٠) (٣١٥)، و الترمذي (٢٥٩٦) و قال: حسنٌ صحيح.

النار، و تزيل رجله مرة، فتصيبها النار، قال: فيقول له الملائكة: ارأيت إن بعثك الله من مقامك هذا فمشيت سويا أتخبرنا بكل عمل عملته ؟ قال: فيقول: أي و عزته لا أكتمكم من عملي شيئا، قال فيقول في نفسه: إن اخبرتهم بما عملت ردوني إلى مكاني قال فيقول: لا وعزته ما أذنبت ذنبا قط قال فيقولون له: لنا عليك بينة فيلتفت يميناو شمالا هل يرى من الآدميين ممن كان يشهد في الدنيا أحدا، فلا يرى أحدا، فيقول: هاتوا بينتكم فيختم على فيه، و تنطق يداه و رجلاه و فخذه بعمله فيقول: أي و عزتك لقد عملتها فإن عندي العظائم الموبقات، قال فيقول الله عز و جل: إذهب فقد غفرتها لك))[٤٠٠] **واتە: (من ئەو کەسە دەزانم کە دواهەمین کەسە لە ئومەتی من کە دەپەڕێتەوە لەسەر پردی (الصراط)، پیاوێکە خۆی پێچ دەدات لە ڕۆیشتنیدا لەسەر پردەکە وەك کوڕێك کە باوکی ئازاری بدات، لەسەر پردەکە جارێك دەستی هەڵدەخلیسکێت و شۆڕ دەبێتەوە و ئاگری بەر دەکەوێت، و جارێکی تر قاچی هەڵدەخلیسکێت و شۆڕ دەبێتەوە و ئاگری بەر دەکەوێت. مەلائیکەکان پێی دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە تۆ لەسەر هەر دوو قاچت ڕابوەستێنێت و بە ئاسایی بەسەر پردەکەدا گوزەر بکەیت ئایا هەموو ئەو کارانەی ئەنجامت داوە بۆمان باسی دەکەیت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ سوێند بەشکۆمەندی خوا هەمووتان بۆ باس دەکەم و هیچتان لێ نا شارمەوە. ئەنجا ئەو کەسە لە دڵی خۆیدا دەڵێت: گەر من هەموو تاوانەکانم بۆ ئەوان باس بکەم ئەوان من دەگێڕنەوە بۆ جێگەکەی یەکەم جار. ئەنجا دەڵێت: نا سوێند بە شکۆمەندی خوا من هیچ تاوانێکم ئەنجام نەداوە. مەلائیکەکان دەفەموون: ئێمە بەڵگەمان هەیە لەسەر تۆ. ئەو کەسەش بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕدەداتەوە تا ببینێت ئایا هیچ لەو شاهیدانەی کەلە دونیا بوون لەوێن تا شاهیدی لەسەربەن، بەڵام هیچ کەسێك لەوێ نابینێت ئەنجا دەڵێت: ئادەی بەڵگەکانتان چیە؟ لەوێدا مۆر دەنرێت بەسەر دەمیدا و دەست و هەر دوو قاچ و ڕانەکانی شایەتی لێ دەدەن و باسی تاونەکانی دەکەن. پاشان مۆرەکە لەسەر دەمی لا دەبرێت و دەڵێت: بەڵێ خوایە سوێند بە شکۆمەندی تۆ ئەوانە و**

(٤٠٠)اخرجه: إبي أبي شيبة بإسناد حسن: كما قال البوصيري في (إتحاف الخيرة المهرة) (١٠٠٦٨)، وانظر: (المطالب العالية) (٤٥٣٧).

چەندەها تاوانی گەورەتر لەوانەم ئەنجامداوە. ئەنجا خوای گەورە دەفەرموێت: بڕۆ لە هەموو تاوانەکانت خۆش بووم).

خوای گەورە فرمان بەو پیاوە دەکات بڕوات بەسەر پردی صراط دا، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە: ((رجلٌ فَهو يمشي على الصراط ...))[401] واتە: (پیاوێك بەسەر پردی صراط دا دەڕوات. . . )، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردوینەتەوە چۆنیەتی تێپەڕبوونی ئەو پیاوە بەسەر پردی صراط دا و چوونە ناو بەهەشت، هەموو ڕیوایەتەکانی ئەم باسە لەسەرجەم سەرچاوەکاندا بەم جۆرە دەبێت.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَحبوا على وَجهِهِ و يَديهِ و رِجلَيهِ؛ تَجُرّ يَدٌ و تُعَلّقُ يدٌ، وتَجُرُّ رِجلٌ و تُعَلِّقُ رِجلٌ (فهوَ يَمشي على الصراط مرّةً، و يكبوا مرّةً ؛ و تَسفَعُهُ النّار مرّةً...)[402] و تُصيبُ جوانِبُهُ النّار فلا يَزالُ كذلك حتّى يَخلُصَ ؛ فإذا خَلُصَ وَقفَ عَلَيها (... إلتَفتَ إليها...)[403] فقال (تبارك الّذي نَجاني مِنْكَ)[404] و الحَمدُ للهِ الذي أعطاني ما لَمْ يُعطِ أحداً (مِنَ الأولين و الآخرينَ)[405] إذْ أنجاني مِنها بَعدَ إذْ رأيتُها (فَتَرفعُ لَهُ شَجرَةٌ (ذاتُ ظلٍ ؛ فَيَقولُ أيّ ربِّ قَدِّمني إلى هذه الشّجرة لأكونَ في ظِلّها)[406] فيقولُ اللهُ تبارَكَ و تعالى: يا ابنَ آدمَ لَعّلي إنْ أعطيتُكَها (أنْ تسألَني غَيرَها)[407] فَيقولُ: لا (و عِزّتِكَ)[408] يا ربِّ ؛ و يُعاهِدهُ أنْ لا يسألَهُ غَيرَها ؛ و رَبّهُ يُعذِرُهُ لأنّهُ يَرى ما لا صَبرَ لَهُ عَليهِ ؛ فَيُدنيهِ مِنها ؛ فَيَستظِلُ بِظِلِها ؛ ثُمّ تُرفَعُ لَهُ شجرةٌ أخرى ((ذاتُ ظلٍ و ثَمرٍ))[409] هيَ أحسنُ مِنَ الأولى ؛ فَيقولُ:

---

[401] في رواية: مسلم: (١٨٧).

[402] في رواية: مسلم (١٨٨) في رواية ابن مسعود (ﷺ): ((. . . ثم يكون آخرهم رجلاً يتلبط على بطنه يقول: يارب لم ابطأبي؟ ويقول: لم أبطي بك وانما أبطابك عملك)). اخرجه: هناد (الزهد) (٣٢٢) وقال محققه: اسناده صحيح و رجاله ثقات. . .

[403] في رواية: مسلم (١٨٨).

[404] في رواية: مسلم (١٨٨).

[405] في رواية: مسلم (١٨٨).

[406] في رواية: مسلم (٣١١).

[407] في رواية: مسلم (٣١١).

[408] في رواية: مسلم (٣١١).

[409] في رواية: مسلم (٣١١).

يا رَبِّ ((قدّمني إلى هذه الشجرة استَظِلُ بِظِلِها و آكلُ مِنْ ثَمَرِها))[٤١٠] لا أسألُكَ غيرَها ؛ فيقولُ: يا ابنَ آدمَ ألَمْ تُعاهِدني إنَّكَ لا تسألني غيرها، قالَ: بلى يا رَبِّ هذه لا أسألُكَ غيرَها ؛ فيقولُ: لعل أنْ ادنيتُكَ مِنها أنْ تسألني غيرها، فيُعاهِدهُ أنْ لا يسألُهُ غيرَها، و رَبُّهُ يُعذِرهُ لأنَّهُ يرى ما لا صبرَ عليهِ ((فَيُقَدِّمَهُ اللهُ إليها))[٤١١] فَيَستَظِلُ بِظِلِها؛ ثُمَّ تُرفَعُ لَهُ شَجرَةٌ ((أخرى ذاتُ ظلٍ و ثَمَرٍ و ماءٍ))[٤١٢] عِندَ بابِ الجنّة هي أحسنُ مِنَ الأوليَين؛ فيقولُ: أي رَبِّي قَدّمني مِن هذه الشجرة لأستَظِلَّ بِظِلِها و اشرَبَ مِنْ مائِها ((وآكلَ مِنْ ثَمَرِها))[٤١٣] لا أسألُكَ غيرَها ؛ فيقولُ اللهُ جلَّ ذِكرَهُ: يا إبنَ آدمَ ألَمْ تُعاهِدني أنْ لا تسألني غيرَها ؟ ((فَيَقولُ))[٤١٤]: بَلى يا رَبِّ هذه ((و عِزّتِكَ))[٤١٥] لا أسألُكَ غيرَها ؛ و رَبُّهُ يُعذِرهُ لأنَّهُ يَرى ما لا صبرَ عليهِ ((فَيُقَدِّمُهُ اللهُ إليها فَتَبرُزُ لَهُ الجنّة))[٤١٦] فإذا أقبَلَ بِهِ على الجنة رأى بَهجَتَها[٤١٧]((سَكَتَ ما شاءَ اللهُ أنْ يَسكُتَ ثُمَّ يَقولُ: يا رَبِّ قَدّمني إلى بابِ الجنّة))[٤١٨] فَينطَلِقُ بِهِ إلى غديرٍ عندَ بابِ الجنّة، فَيَغتَسِلُ، فَيَعودُ إليهِ ريحُ أهلِ الجنّة و ألوانهم ((فإذا بَلغَ بابَ الجنّة انفَهَقَتْ لَهُ))[٤١٩] ((فَيَرى أهل الجنّة و ما فيها))[٤٢٠] ((مِنْ النَضرَةِ و السرور مِنْ خُلَلِ البابِ))[٤٢١] ويَسمَعُ [ أصوات أهل الجنة] و كَلامَهُم ((فَيَسكُتُ ما شاءَ اللهُ أنْ يَسكُتَ))[٤٢٢] ثُمَّ يَقولُ: يا رَبِّ أدخلني الجنّة فَيقولُ اللهُ لَهُ: ((أتسألُ الجنّة و قَدْ

---

[٤١٠] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١١] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٢] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٣] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٤] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٥] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٦] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤١٧] أخرجه: أحمد (٣٧١٤)، و (مسلم) (٣١٠-٣١١)، و أنظر: (صحيح الجامع) (٤) .

[٤١٨] في رواية: البخاري (٦٥٧٣)، و مسلم (٢٩٩).

[٤١٩] في رواية: مسلم (٢٩٩).

[٤٢٠] في رواية: مسلم (٣١١).

[٤٢١] في رواية: مسلم (٢٩٩).

[٤٢٢] في رواية: مسلم (٢٩٩).

بُجَيْتُكَ مِنَ النَّارِ))(٤٢٣) ويحَكَ يا ابن آدَمَ ما أغدرك، أَلَيسَ قدْ أعطَيتَني العهودَ أنْ لا (تسألني) غيرَ الذي أُعطيتَ؟ فَيقولُ: ((رَبِّ إجعَلْ بيني و بينَها حِجاباً حتّى لا أسمَعَ حَسيسَها))(٤٢٤) ((أيْ رَبِّ لا تجعَلني أشقَى خَلقِكَ، فلا يَزالُ يَدعوا اللهَ ؛ حتّى يَضحَكَ اللهُ منهُ ؛ فإذا ضَحِكَ اللهُ مِنهُ قال: أدخلِ الجنّة))(٤٢٥) ((قال: فَيَذهبُ فَيَدخُلُ الجنّة فَيَجِدَ النّاسَ قَدْ أخذوا المنازلَ))(٤٢٦) فَيُخَيَّل إليهِ أنَّها ملآى ثُمَّ ((يَرجع))(٤٢٧) (( في رواية:. . . يخرجُ))(٤٢٨) فَيقولُ: ((يا رَبِّ)) قد وَجَدتُها ملآى ((فَيقولُ اللهُ لَهُ)): إذهَب ((فأرجع))(٤٢٩) فأدخل الجنّة، فيأتِها فَيُخَيّل إليهِ إنّها ملآى فَيرجعُ إليهِ فَيقولُ يا رَبِّ ((قَدْ))(٤٣٠) وَجَدتُها ملآى](٤٣١) ((كَيفَ و قَدْ أنزَلَ النّاسُ منازِلَهُم و أخذوا أخذاتِهم، فَيُقالُ لهُ: أتَرضى أنْ يَكونَ لَكَ مِثلَ مُلكِ مَلِكٍ مِنْ مُلوكِ الدُّنيا ؟ فَيقولُ: رَضيتُ رَبِّ))(٤٣٢) فَيَدخل الجنّة ؛ و يرى أو يُرفَعُ لَهُ منزل أمامَ ذلِكَ كأنَّ ما هو فيهِ بالنِسبةِ إليهِ حُلمٌ؛ فَيقولُ: رَبِّ أعطِيَني ذِلَكَ المنزل ؛ فيقولُ: لَعَلّكَ أنْ أُعطيتَهُ تسألُ غيرَهُ ؟ فَيَقولُ: لا و عِزّتُكَ لا أسألُ غَيرَهُ، و أيّ منزل ((يكونُ)) أحسنُ مِنهُ ؛ فَيعطاهُ فينزِلُهُ ؛ ويَرى أمامَ ذلِكَ منزلاً ((آخر)) كأنَّ ما هوَ فيهِ بِالنِسبة إليهِ حُلمٌ ((فَيقولُ)): رَبِّ أعطيني ذِلِكَ المنزل ؛ فَيقولُ اللهُ تبارَكَ و تعالى لَهُ: لَعَلّكَ إنْ أُعطيتَهُ تَسألُ غَيرَهُ؟ فيقولُ: لا و عِزّتُكَ ((لا أسألُكَ غَيرَهُ)) و أيّ منزل ((يكونُ)) أحسنُ مِنهُ فَيُعطاهُ فَيُنزِلُهُ ؛ ثُمَّ يَسكُتُ ؛ فيَقولُ الله جل ذِكرَهُ: ما لَكَ لا تسألْ ؟ فَيقولُ: رَبِّ لَقَدْ

---

(٤٢٣) في رواية: الحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

(٤٢٤) في رواية: الحاكم (٢/٣٧٦) وصححه ووافقه الذهبي، ، و الطبراني (٩٧٦٣) وصححه الشيخ الألباني في (المختصر العلو) (٦٩).

(٤٢٥) أخرجه: البخاري (٦٥٧٣)، و مسلم (٢٩٩).

(٤٢٦) في رواية: مسلم (٣٠٩).

(٤٢٧) في رواية: مسلم (٣٠٨).

(٤٢٨) في رواية: ابن حبان (٧٤٧٥).

(٤٢٩) في رواية: ابن حبان (٧٤٧٥).

(٤٣٠) في رواية: ابن حبان.

(٤٣١) أخرجه: مسلم: (٣٠٨)، و ابن حبان (٧٤٧٥): إسناده صحيح على شرطهما، و صححه الشيخ الألباني في: (صحيح ابن ماجة) (٣٥٠١)، و في (صحيح الجامع) (٢٤٨٩).

(٤٣٢) في رواية: مسلم (٣١٢).

سألتُكَ حتّى إستَحيَيتُكَ ((و أقسَمتُ لَكَ حتّى إستَحيَيتُكَ)) فيقولُ اللهُ تعالى لَهُ ((... أتَذكرُ الزّمانَ الذي كنتَ فيهِ في الدّنيا ؟ فيَقولُ: نعم))[٤٣٣]. ((... فيُقالُ لَهُ: أ ترضى أنِ يكونَ لَكَ ((مِنَ الجَنّة مِثلَ ما كانَ لِمَلِكٍ)) مِنْ ملوك الدُنيا ؟ فيقولُ: رَضيتُ رَبِّ))[٤٣٤] ((فيُقالُ لهُ تَمَنّ))[٤٣٥] ((فيسألُ رَبَّهُ فيَتَمَنى حتّى إنَّ الله لَيُذَكِرُهُ، فيقولُ: تَمَنّ كذا و كذا(وكذا) حتّى إذا أنقطَعَتْ بِهِ الأماني))[٤٣٦] ((فيَقولُ: يا رَبِّ؛ تَنافَسَ أهلُ الدُنيا في دُنياهُم و تضايَقوا فيها فأنا أسألُكَ مِثلَها))[٤٣٧] ((فيَقولُ ((اللهُ تعالى)): يا ابن آدَمَ ما يُصريني مِنكَ))[٤٣٨] ((ألا تَرضى إنْ أُعطيكَ مِثلَ الدُنيا مُنذُ خَلَقْتُها إلى يوم أفنَيتُهاو عشرة أضعافِهِ))[٤٣٩] [فان لك مثل الدنيا و عشرة امثها]((وَلَكَ ما اشتَهَتْ نَفسُك و لَذّتْ عينُكَ))[٤٤٠] فيقولُ ((أتَستهزيءُ مِنّي و أنتَ رَبُّ العالمينَ؟))[٤٤١] فَيَضحَكُ الرَبُّ عز وجل مِنْ قولِهِ ((. . أتَسخَرُ بي و أنتَ الملِكُ (أتَضحَكُ بي و أنت الملِك ))[٤٤٢] ((قال [٤٤٣]: فرأيتُ ابن مسعودٍ إذا بَلَغَ هذا المكان مِنَ هذا الحديث ضحِكَ.. فقالَ: إنّي سَمِعتُ رسولَ الله ﷺ يُحَدّث هذا الحديث مِراراً، كُلّما بَلَغَ هذا المكان مِنْ هذا الحديث ضَحِكَ حتّى تَبدوا أضراسَهُ))[٤٤٤] فَيقولُ الرَبُّ عز و جل ((لا أستَهزِءُ مِنكَ و لكنّي على

---

[٤٣٣] في رواية: أحمد (١/٣٧٨)، مسلم (١٨٦) و (٣٠٨)، ابن حبان (٧٤٢٧) و قال محققه: إسناده صحيح.

[٤٣٤] في رواية: الحميدي (٧٦١)، و مسلم (١٨٩)، و الترمذي (٣١٩٨) و قال حديث حسن صحيح، و ، و ابن حبان (٧٤٢٦): إسناده صحيح على شرط مسلم، عن المغيرة بن شعبة مرفوعاً، و أنظر: (صحيح سنن الترمذي) (٢٥٥١).

[٤٣٥] في رواية: مسلم (١٨٩).

[٤٣٦] في رواية: البخاري (٦٥٧٣)، مسلم (١٨٢) و (٣٠٢).

[٤٣٧] أخرجه: أحمد (١/٣٧٨)، مسلم (١٨٦)، ابن حبان (٧٤٢٧) و قال محققه: إسناده صحيح.

[٤٣٨] في رواية: مسلم (١٨٨).

[٤٣٩] في رواية: الطبراني (٩٧٦٣).

[٤٤٠] في رواية: مسلم.

[٤٤١] في رواية: مسلم (١٨٨).

[٤٤٢] في رواية: مسلم (١٨٦) و (١٨٧).

[٤٤٣] أي مسروق بن الأجدع الراوي عن ابن مسعود (رضي الله عنه).

[٤٤٤] في رواية: الطبراني (٩٧٦٣).

ما أشاءُ قادِرٌ))(٤٤٥) [فيقول: رضيتُ ربِّ] فيقول: سَلْ ؛ فيقولُ: ألحِقني بالنّاسِ ؛ فيَقولُ: إلحق بالنّاسِ ؛ قال فينطَلِقُ يُرَجِّلُ في الجنّة حتّى إذا دنا مِنَ النّاسِ رُفِعَ لَهُ قصرٌ مِنْ دُرةٍ فيَخِرُّ ساجداً ؛ فيُقالُ لَهُ : إرفَع رأسَكَ ما لك ؟ فيَقولُ: رأيتُ رَبّي أو تراءَتْ لي رَبّي، فيُقالُ: إنّما هو منزل مِنْ منازِلِكَ ؛ قال ثُمَّ ((يلقى)) فيها رَجُلاً فيَتَهيأ للسجودِ لَهُ فيُقال لَهُ: مهْ ((ما لَكَ)) فيقولُ: رايتُ إنّكَ ملكٌ مِنَ الملائِكة ؛ فيَقولُ: إنّما أنا خازنٌ مِنْ خُزّانِكَ و عبدٌ مِنْ عَبيدِكَ تحتَ يَديَّ ألف قَهرمانٍ (أي: خازن أو وكيل) على ((مثلِ)) ما أنا عَليهِ: قال: فيَنطَلِقُ أمامهُ حتّى يفتَحُ لَهُ بابَ القَصرِ ((. . ثُمَّ يَدخل بَيتَهُ و يَدخلُ عَليهِ زَوجَتاهُ مِنَ الحُورِ العين فيقولان: الحمدُ لله الذي أحياكَ لَنا و أحيانا لَكَ ؛ فيَقولُ: ما أُعطيَ أحدٌ مِثلَ ما أُعطيت))(٤٤٦)، قال: وهو (أي قَصرُهُ)مِنْ دُرّةٍ مُجَوّفةٍ سَقائِفُها و أبوابُها و أغلاقُها و مفاتيحُها مِنها تَستَقبِلهُ جَوهرةٌ خضراء مُبطَنَةٌ بحمراءَ فيها سَبعونَ باباً ؛ كل بابٍ يُفضي إلى جوهرةٍ غيرِ لونِ الأخرى في كلِّ جوهرةٍ سرُرٌ و أزواجٌ و وصائفٌ ((فيَدخُلُ فإذا هو))(٤٤٧) بحوراء عيناءَ عليها سَبعونَ حُلةً يَرى مُخَ ساقِها من وراء حُلَلِها ؛ كَبَدُها مرآتُهُ، و كبِدُهُ مِرآتُها؛ إذا أعرَضَ إعراضةً إزدادتْ في عينِهِ سبعينَ ضِعفاً عمّا كانَتْ قبلَ ذلكَ ؛و إذا أعرضَت عنهُ إعراضةً إزدادَ في عينِها سبعينَ ضِعفاً عمّا كانتْ قبلَ ذلِكَ فيَقولُ لَها: و الله لَقَدْ إزدَدْتِ في عيني سبعينَ ضِعفاً ؛ و تَقولُ لَهُ: و أنتَ و اللهِ لَقَدْ إزدَدْتَ في عيني سبعينَ ضِعفاً ؛ فيُقالُ لَهُ أشرِف، قال: فيَشرِفُ ؛ فيُقالُ لَهُ: مُلكُكَ مسيرةُ مِائة عامٍ يَنفُذُهُ بَصرُكَ. قال: فقال لَهُ عمر: ألا تَسمعُ ما يُحدِّثُنا ابنُ أم عبدٍ يا كعبُ عن أدنى أهلُ الجنّة منزلاً فَكيفَ أعلاهُم ؟ قال: يا أمير المؤمنين (ما لا عينٌ رأتْ و لا أُذنٌ سَمِعَتْ ؛ إنَّ الله عز وجل جَعَل داراً فَجَعَلَ فيها ما شاءَ مِنَ الأزواجِ و الثّمراتِ و الأشرِبة، ثُمَّ أطبَقَها، ثُمَّ لَمْ يَرَها أحدٌ مِنْ خَلقِهِ ؛ لا جبريلُ و لا غيرَهُ مِنَ

---

(٤٤٥) في رواية: مسلم (١٨٧).

(٤٤٦) في رواية: مسلم (٣١١) (كتاب الإيمان) باب أدنى أهل الجنّة منزلة، و أحمد (٢٧/٣) رقم (١١٢١٦) عن أبي سعيد الخدري مرفوعاً، وقال محققه شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٤٤٧) في رواية: [فيَدخل عليه زوجتاه مِن الحور العين ؛ فيقولون: الحمد لله الذي أحياكَ لناو أحيانا لَكَ ؛ فيَقولُ: ما أعطي أحدٌ مثل ما أعطيتُ] أخرجه أحمد (٢٧/٣)، و صححه الشيخ الألباني في: (صحيح الجامع) (١٥٥٧).

الملائِكة ثُمّ قرأ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾))[٤٤٨] واتـه: [ئـەو کەسە لەسەر هەر دوو قاچ و هەر دوو دەست و دەم وچاوی بەشێوەی گالگۆلکی دەڕوات (واتە: وەك منداڵێك کەپێ نەگرتبێت) دەستێکی ڕادەکێشێت و دەستێکی هەڵدە واسترێت، وەقاچێکی ڕادەکێشێت و قاچێکی هەڵدەواسرێت (واتـە: جار جار دەستی یان قاچی درکەکانی پردی صراطی تێدەگیرێت تا ئەو لە دەست ئەو دڕکە ڕزگار دەکات دەستەکەی تری پێوە دەبێت وە هەروەها) ئەو کەسە جارێك دەڕوات و جارێك دەکەوێت و جارێکی تر ئاگری بەر دەکەوێت] و هەر دوو لای ئاگر پێ ی دەگات، ئا بەم شێوە یە دەبێت تا دەیبڕێت و ڕزگاری دەبێت، کە ڕزگاری بوو دەوەستێت و [ ئاوڕ دەداتـەوە بۆ پردەکە لە دوایەوە] و دەڵێت: [گەورەی و پیرۆزی بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کردم لە تۆ] وە سوپاسی بۆ خوا ئەوەی داویەتی بەمن بەهیچ کەسێك تری نەداوە [ لەیەکەمینەکان و کۆتاییەکانی دروست کراوانی] کەمنی ڕزگار کرد لە ئاگر دوای ئەوەی خۆم هەموویم بینی بە چاو، ئەنجا لەو لاترەوە درەختێکی [ نیشان دەدرێت کەسێبەری هەیە لەوێدا دەڵێت: خوایە نزیکم کەرەوە لەو درەختە تابچمە ژێر سێبەرەکەی ] خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد پێدەچێت گەر ئەوەت پێ ی بدەم [تۆ داوای شتی ترم لێ بکەی]؟ ئەویش دەڵێت: نا. [سوێند بە شکۆمەندنی تۆ] خوایە داوای ترم نیە، لەوێدا بەڵێن دەدات [ بەخوای گەورە کە داوای هیچی تری لێ نەکات ] وەخوای گەورەش پاساوی قبوڵ دەکات چونکە ئەوکەسە شتی وادە بینێت کە ناتوانێت ئارام بگرێت و داوای نەکات، پاشان خوای گەورە نزیکی دەکاتەوە لەو درەختە دەچێتە ژێر سێبەرەکەیەوە، پاشان دەختێکی تری نیشان دەدرێت [کە سێبەر و

---

(٤٤٨) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٩٧٦٣)، و الحاكم (٢/٣٧٦) و صححه و وافقه الذهبي، و الحاكم (٤/٥٩٠) و صححه، و قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٠/٣٤٣) رواه الطبراني من طرق أحدها رجاله رجال صحيح، و أحمد في (كتاب السنة) (١٢٠٣) و قال محققه: إسناده حسنَ، و قال المنذري في (الترغيب): رواه ابن أبي الدُنيا و الطبراني و الحاكم و أحد طرق الطبراني صحيح (كما في تهذيب الترغيب) (٣٤٩٤)، و قال العلامة ابن القيم الجوزية في كتابه (حادي الأرواح): حديث كبيرٌ حسن، كما في (صحيح حادي الأرواح) التي تُسمى (روح و ريحان) (ص: ٢٨٢)، و صححه العلامة الشيخ الألباني في (مختصر شرح العقيدة الطحاوية) ص (٢٦٤)، و في (مختصر العلو) (٦٩) ص (١١٠) و(صحيح الترغيب) (٣٧٠٤)، و صححه الشيخ شعيب الأرناؤوط في (شرح العقيدة الطحاوية) (٢/٦٠٦)، عن ابن مسعود مرفوعاً.

بەروبوومی هەیە] وە لە درەختەکەی یەکەم جار زۆر چاکترە، لەوێدا دەڵێت: ئەی خوایە [پێشم بخە و بم بەرە لای ئەو درەختە تا بچمە ژێر سێبەرەکەیەوە و لە بەروبومەکەی بخۆم] ئیتر من هیچ داوایەکی ترم نی یە، خوای گەورەر دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد ئەی تۆ بەڵێنت نەدا بە من کە داوای هیچی ترم لێ نەکەی ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی خوایە گیان تەنها من ئەمەت لێ داوا دەکەم هیچی تر داوا ناکەم، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد پێی دەچێت ئەگەر ئەوەت بدەمێ تۆ داوای شتی ترم لێ بکەیت ؟ ئەویش لەوێدا: بەڵێن دەدات بەخوا کە هیچی تری لێ داوا نەکات، وە خوای گەورەش پاساوی قبوڵ دەکات، چونکە ئەو شتی وا دەبینێت کە ناتوتنێت ئارام بگرێت و داوای نەکات، ئەنجا خوای گەورە دەیباتە پێش لەو داری و دەچێتە سێبەرەکەی و لەبەروبوموکەی دەخوات. پاشان درەختێکی تری [نیشان دەدرێت سێبەر و بەروبوومی هەیە و ئاویشی لەژێر دایە] لە نزیک دەرگای بەهەشت و زۆر چاکترە لە هەر دوو درەختەکەی پێشوو تر، لە وێدا دیسان دەڵێت: ئەی خوایە نزیکم کەرەوە لەو درەختە تابچمە ژێر سێبەرەکەی و لەو ئاوە بخۆمەوە و [لەبەروبومەکەی بخۆم] ئیتر من هیچ داوایەکی ترم نی یە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد تۆ بەڵێنت نەدا بە من کە داوای هیچی ترم لێ نەکەیت؟ [ ئەویش دەڵێت ]: بەڵێ ئەی خوایە هەر ئەمەت لێ داوا دەکەم [ سوێند بە شکۆمەندیت] داوای هیچی ترت لێ ناکەم، خوای گەورەش ئەو پاساوەی لێ قبوڵ دەکات، چونکە ئەو کەسە شتی وادە بینێت کە ناتوانێت ئارام بگرێت و داوای نەکات. [ ئەنجا خوای گەورە پێشی دەخات، و دەچێتە لای درەختەکە و بەهەشتی لێوە دیار دەبێت ] و ڕوو دەکاتە بەهەشت و جوانیەکانی دەبینێت، [ پاشان تاماوەیەك خوا ویستی لێ بێت بێدەنگ دەبێت ئەنجا دەڵێت: خوایە نزیکم بکەرەوە لە دەرگای بەهەشت] ئەو کەسە دەبرێتە چەم و ڕووبارێك لای دەرگای بەهەشت، لەو ئاوە خۆی دەشوات و ڕەنگ و بۆنی بەهەشتی بۆ دێت (واتە: شێوەی وەك بەهەشتیەکانی لێ دێت) [ کە دەچێتە بەردەم دەرگای بەهەشت بۆن و جوانی و خۆشی و شنە بای بەهەشتی بە ڕوودا دێت] [ هەموو خەڵکانی بەهەشت و ئەوەی تیایەتی ] [ لە خۆشی و ڕووناکی لە بۆ شایەکی دەرگای بەهەشتەوە دەبینێت] [وگوێ لە دەنگی خەڵکی ناو بەهەشتە] و قسەکانیان دەبیستێت [ ئەنجا هەتا ماوەیەك کە خوا ویستی لێ بێت بێدەنگ دەبێت] پاشان دەڵێت: ئەی خوایە بمبەرە ناو بەهەشت، خوای

گەورەش دەفەرموێت: [ داوای بەهەشت دەکەیت لە کاتێکدا ڕزگارم کردیت لە ئاگر] ئای ئادەمیزاد چەند بەڵێن شکێنیت، ئەی تۆ چەندها بەڵێنت نەدا بە من جگە لەوەی پێمداویت داوای هیچی تر نەکەیت؟ ئەویش دەڵێت [ خوایە بەر بەستێك دروست بکە لە نێوان من و بەهەشتدا تا دەنگەکانی بەنزمیش نەبیستم] [ ئەی خوای من مەمکە بە بێبەش ترینی دروست کراوەکانی خۆت، ئەنجا بەردەوام داوا دەکات و دەپاڕێتەوە لە خوا، تا خوای گەورە بەو پێدەکەنێت و دەفەموێت: بڕۆرە ناو بەهەشت][ ئەنجا دەڕوات و دەچێتە ناو بەهەشت و دەبینێت خەڵکان هەموو تەلار و کۆشکەکانیان وەرگرتوە][ لەوێدا وا دێتە بەر چاوی کە پڕبوە و جێگەی ئەوی تیانەماوە، پاشان [دەگەڕێتەوە] و [دەچێتە دەرەوە]و دەڵێت: خوای گەورە چووم تەماشام کرد تەواو پڕ بووە ! [ خوای گەورە دەفەرموێت] بڕۆ [و بگەڕێەوە] ناو بەهەشت. دیسان دەگەڕێتەوە ناو بەهەشت وا دێتە خەیاڵی کە تەواو پڕبووە، دووبارە دەگەڕێتەوە و دەڵێت: [خوایە بینیم تەواو پڕ بووە] [خەڵکان چوونە جێگاکانی خۆیان و بەشەکانی خۆیان وەرگرتووە] خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا ڕازی دەبێت بە ئەندازەی موڵك و سامانی پاشایەك لە پاشاکانی دونیات بدرێتێ؟ دەڵێت: بەڵێ ڕازی دەبم، ئەنجا دەچێت ناو بەهەشت تەلارێکی لەبەردەمدا نیشان دەدرێت لە ئاستی ئەودا وەك ئاوات و خەیاڵە ئەو کەسە دەڵێت: خوایە ئەو جێگە و تەلارەم پێ ببەخشە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەت بدرێتێ پێ دەچێت داوای جێگە و تەلارێکی تر بکەیت؟ ئەویش دەڵێت: نا سوێند بە شکۆمەندیت داوای هیچی ترت لێی ناکەم ئایا دەبێت هیچ جێگە و تەلارێك لەو باشتر هەبێت، ئەنجا ئەو جێگەیەی پێ دەبەخشرێت و دەویەوێت بڕواتە ناوی دەبینێت لە پێش ئەودا [ تەلارێکی تر دەبینێت] لە ئاستی تەلاری یەکەم جاردا وەك ئاوات و خەیاڵە (واتە: زۆر گەورەتر و جوان تر وخۆش ترە لە تەلارەکەی یەکەم جار) (ئەنجا دەڵێت): خوایە ئەو جێگە و تەلارەم پێ ببەخشە خوای گەورە دەفەرموێت: پێ دەچێت گەر ئەوەت بدرێتێ داوای جێگە و تەلارێکی تر بکەیت؟ ئەویش دەڵێت: ناسوێند بە شکۆمەندیت [داوای هیچی ترت لێ ناکەم] دەبێت هیچ جێگەیەکی تر هەبێت لەوە باشتر بێت، ئەنجا ئەو جێگەیەی پێ دەبەخشرێت و دەیەوێت بڕوات، پاشان بێدەنگ دەبێت خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوە چیە بۆ داواناکەیت؟ ئەویش دەڵێت: خوای گەورە ئەوەند داوام لێ کردیت تا شەرمت لێ دەکەم [ وە ئەوەند سوێندم بۆ خواردیت تا شەرمت لێ دەکەم] خوای

گەورە دەفەرموێت: [ ئایا لە یادتە ئەوکاتەی کەلە دونیا بوویت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ] [ئینجا پێی دەوترێت: ئایا ڕازی دەبیت] [ لەبەهەشتدا بەوێنەی پاشایەك مۆڵكت هەبێت؟] لە پاشاكانی دونیا. ئەویش دەڵێت: خوایە من ڕازیم [ پێی دەوترێت: ئاوات بخوازە و داوابكە] [ ئەنجا ئاوات دەخوازێت و داوا لە خوا دەكات، وە خوای گەورە بەبیر دەهێنێتەوە و دەفەرموێت: ئاواتەكانت داوابكە و دوای ئەوە و ئەوە و ئەوە بكە ئەویش داوا دەكات تا ئاوات و داواكانی تەواو دەبێت] [ئەنجا دەڵێت: خوای گەورە هەموو خەڵكان پێشبڕكێیان لەگەڵ یەكدا دەكرد بۆ بەدەست هێنانی دونیا، منیش بەوێنەی دونیات لێ داوا دەكەم] [ خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد چی كۆتایی بە ئاوات و داوا كاریەكانت دێنێ؟] [ئایا ڕازی نابیت بەوێنەی دونیا سامانت بدەمێ كە تیایدا بووە لەو ڕۆژەی دروستم كردووە تا ئەو ڕۆژەی لە ناوم بردووە] [ئەوە بەوێنەی دونیا و دە ئەوەندی سامانی دونیا بۆ تۆ] [تیایدایە بۆ تۆ ئەوەی حەز و ئارەزووی بكەیت و چاوت پێی خۆش بێت]ئەویش دەڵێت: [ئایا گاڵتەم پێی دەكەیت تۆ پاشا و خوای هەموو جیهانەكانی ] [خوای گەورە پێ دەكەنێت لە وتەی بەندەكەی كە دەڵێت: خۆ تۆ پاشایت گاڵتەم پێ دەكەیت] [ابن مسعود ﷺ دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ هەموو جارێك ئەم باسەی بۆ دەگێراینەوە كە دەگەیشتە ئێرە پێ دەكەنی تا دانەكانی دەردەكەوتن]خوای گەورە دەفەرموێت: [ گاڵتەت پێ ناكەم من بە توانام ئەوەی ویستم لێ بێت جێبەجێی دەكەم] [ئەویش دەڵێت: من ڕازی بووم خوای گەورە]. ئەنجا خوای گەورە دەفەموێت: داوابكە ؟ ئەویش دەڵێت: بمگەیەنە بە خەڵكان، خوای گەورە دەفەرموێت: بڕۆ بگە بەخەڵكان. ئەو كەسە دەڕوات بەڕاكردن بە ناو بەهەشتدا، تا نزیك دەبێتەوە لە خەڵكی و لەوێدا كۆشك و تەلارێكی مرواری بەر چاودەكەوێت و دەچێت بەسوجدەدا. پێی دەوترێت: چیتە سەر بەرزبكەرەوە؟ دەڵێت: خوای گەورە خۆی نیشان دام یان خوای گەورەم بینی. پێی دەوترێت: ئەوە تەنها یەكێكە لە كۆشكەكانی تۆ، ئەنجا بە پیاوێك دەگات و دەیەوێت سوجدە ببات پێی دەوترێت: نەكەیت ئەوە چیتە؟ دەڵێت وا دەزانم تۆ فریشتەیەكی لە فریشتەكان، ئەو دەڵێت: من تەنها كاربەدەستێكم لە كار بەدەستەكانی تۆ وە خزمەت كارێكم لە خزمەت كارەكانی تۆ هەزار خزمەتكاری وەك خۆمم لە ژێر دەستدایە. ئەنجا ئەو خزمەتكارە پێشی دەكەوێت و دەرگای كۆشكەكەی بۆ دەكاتەوە [ پاشان دەچێتە ناو كۆشكەكەی و دوو حۆری لە خێزانەكانی دێن

بۆ لای و پێی دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی زیندوو کردەوە بۆ ئێمە ئێمەشی بۆ تۆ زیندوو کردەوە بۆ تۆ: ئەوەی دراوە بە تۆ بەکەسی تر نەدراوە] و کۆشکی ئەو کەسە یەک پارچە مروارییە دەرگاکان و کلیلەکان و پەنجەرەکان و سەقفەکەکانی هەر هەموو لە خۆیەتی سەرەتا دەچێتە ژوورێکەوە دەرەوەی یاقوتی سەوزە و ناوەکەی یاقوتی سورە حەفتا دەرگای تێدایە، هەر دەرگایەك لەو دەرگایانە دەچێت بۆ هەر ژوورێك یاقوتە کە ڕەنگی جیاوازە لەوانی تر وە هەموو یەکێك لەو ژوورانە خێزان و خزمەکار و پێداویستی تایبەتی خۆی تێدایە، ئەنجا دەچێتە یەکێك لەو ژوورانە و حورییێك دەبینێت کە حەفتا جۆر پۆشاکی جوانی لەبەردایە، و مۆخی ناوئێسقانی قاچیان لە دوای ئەو هەموو پۆشاکەوە دیارە، وە ئەو کەسە هەر ئاوڕ بەلایەکدا بداتەوە حەفتا ئەوەندەی تر لە جاران جوان تر دەبێت لەپێش چاوی حۆریەکە بۆیە دەڵێت: سوێند بەخوا تۆش حەفتا ئەوەندی تر لەپێش چاوی من جوان بوویت. ئەنجا پێی دەوترێت: بچۆ سەر تا تەماشای موڵکەکەت بکەیت، ئەویش دەچێتە سەر و تەماشای دەکات و پێی دەوترێت: موڵکەکەت ماوەی سەد ساڵ پیادە ڕەویە و چاوت هەمووی دەبینێت. ئیمامی عومەر ﷺ گوێ لەم فەرموودەیە گرتبوو بە کەعبی کوڕی مالیکی وت: کەعب گوێت لێیە (ابن مسعود) ﷺ کە لە پێغەمبەرە ﷺ دەیگێڕێتەوە و چۆن باسی کەمترین بەشی یەکێك لە ئەهلی بەهەشت دەکات، ئەی بەشی و جێگەی بەرزترینی ئەهلی بەهەشت دەبێت چۆن بێت؟ عەبدوڵای کوڕی مەسعودیش ﷺ فەرمووی: سەرکردەی بڕواداران لەبەهەشتدا ئەوەندەیان هەیە کە چاو نەیبینیوە وە گوێش نەیبیستووە، چونکە خوای گەورە جێگە و شوێنێکی دیاری کردووە و ئەوەی خۆی ویستویەتی لە بەروبوم و خواردنەوە و خێزان ئامادەی کردووە و پاشان داپۆشیوە و هیچ یەکێك لە دروست کراوەکانی نەجبریل و نەهیچ فریشتەیەکی تر نەیان بینیوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ (السجدة: ١٧) واتە: (هیچ نەفسێك نازانێت چیان بۆ شاردراوەتەوە لە خۆشی و شادی لە پاداشتی کردەوەکانی خۆیاندا).

دوای ئەوەی یەکخواپەرستان دێنە دەرەوە لە ئاگر، بەهەشت هێشتا پڕنابێتەوە تا خوا ئارەزووی لێ بێت تێیدا دەمێننەوە، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((يَبقى مِنَ الجَنَّة ما شاءَ اللهُ أنْ يَبقى فيُنشيءُ اللهُ لها خلقاً ما

يَشاءُ))[٤٤٩] ((حتّى يَملَؤُها...))[٤٥٠] واتە: (بەهەشت دەمێنێت تا خوای گەورە ویستی لەسەر بێت و دروست کراوانی بۆ ئامادە دەکات تا (پڕی بکەنەوە)، هەروەها ئاگر پڕ نابێتەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((...فأمّا النّارُ فلا تَمتَليءُ حتّى يَضَعَ اللهُ جل و علا قَدَمَهُ فيها، فيقولُ قطْ قطْ فَهُناكَ تَمتَليءُ و يَنزَوي بَعضُها إلى بَعضٍ ؛ و لا يَظلِمُ اللهُ أحداً...))[٤٥١] واتە: (... ئاگر پڕنابێت تا خوای گەورە پێی پیا دادەنێت و دەفەرموێت (قطْ قطْ) ئا لەو کاتەدا پڕ دەبێت وخوای گەورە ستەم لە کەس ناکات...).

دوای هاتنە دەرەوەی یەکخواپەرستان لە ئاگر بە سۆز و میهرەبانی خوای گەورە دەرگا لەسەر ئەهلی ئاگر دادەخرێت و کەسی تر نایەتە دەرەوە لێ ی، ئیبن مسعود ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: (... فَعِندَ ذلِكَ ((أي: عند خروج المؤحدينَ مِنَ النّارِ)) يقولونَ: ((أي: أهلَ النّارِ)): رَبّنا أخرِجنا مِنها فإن عُدنا فإنّا ظالِمونَ ؛ فَيقولُ عندَ ذلِكَ: إخسَئوا فيها و لاتُكَلِّمونَ فإذا قال ذلِكَ، أطبَقَتْ عليهِمْ جَهَنّم فلا يَخرُجُ بعدَ ذلِكَ أحدٌ أبداً)[٤٥٢] واتە: (... لەو کاتەدا (واتە: دوای هاتنە دەرەوەی یەکخواپەرستان لە ئاگر) دەڵێن: (واتە: ئەهلی ئاگر) خوای گەورە دەرمان بکە لە ئاگر و بمانگێڕەوە دونیا گەر چووینەوە سەر خراپە و تاوانەکانمان ئەوە بەڕاستی ئێمە ستەمکارین، لەو کاتەدا دەفەرموێت: دەنگتان لێ نەیەت و قسەم لەگەڵ مەکەن خوای گەوەرە کە ئەمەی فەرموو، دەرگایان لەسەر دادەخرێت و کەس لێ ی نایەتە دەرەوە).

دواتر مردن دەهێنرێت و سەر دەبڕێت لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دا، ئەبی سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إذا أدخلَ اللهُ تعالى أهلَ الجَنّةِ الجَنّةَ، و أهلَ النّارِ النّارَ، أوتِيَ بِالموتِ مُلبِباً (في صورةِ كبشٍ أملحِ) (حتّى يُوَقَفَ) على السورِ الذي بينَ أهلِ الجَنّةِ و أهلِ النّارِ، ثُمَّ يُقالُ: يا أهلَ الجَنّةِ (فَيَطّلِعونَ خائِفينَ و جِلينَ أنْ يُخرَجوا مِنْ مكانِهِم الذي هم فيهِ، ثُمَّ يُقالُ: يا أهلَ النّارِ، فَيَطّلِعونَ مُستبشِرينَ

---

[٤٤٩] أخرجه: أحمد (٣/٢٧٠)، و مسلم (٢٨٤٨).

[٤٥٠] أخرجه: أحمد (٣/١٥٢)، و صححه الشيخ الألباني في: (السلسلة الصحيحة) (٢٥٤٠).

[٤٥١] أخرجه: البخاري (٤٨٥٠)، و مسلم (٢٨٤٦).

[٤٥٢] أخرجه: الطبراني (التفسير) (١٩٤٤١)، و الحاكم (٢/٥٠٧) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي.

فَرحينَ أن يُخرَجوا مِنْ مَكانِهِم الذي هم فيهِ) يرجونَ الشفاعةَ (فَيُقالُ: هلْ تَعرِفونَ هذا: فَيَقولونَ (نعم) قدْ عَرِفناهُ هو الموتُ الذي وُكِلَ بِنا (و كُلُّهُم قدْ رآهُ)) قال: فَيُؤمَرُ بِهِ (فَيُضجَعُ فَيُذبَحُ (كما تُذبَحُ الشاة) ذبحاً على السورِ)ثُمَّ يُقالُ لِلفريقينَ كِلاهُما: (يا أهلَ الجَنَّةِ خلودٌ فلا موت، و يا أهلَ النّارِ خلودٌ فلا موت)))[٤٥٣]. **واتە: (کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە ناو بەهەشت، و دۆزەخیەکان دەچنە ناو ئاگر، مردن دەهێنرێت بە ڕاکێشان (بە شێوەی بەرانێکی بەخۆ) ڕادەوەستێت لە شورای نێوان بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان، دەوترێت: ئەی بەهەشتیەکان (ئەوانیش لە ترسی دەرکردن لە شوێنی خۆیان تەماشا دەکەن)، و دەوترێت: ئەی دۆزەخیەکان (ئەوانیش بە هیوای هێنانە دەرەوەیان لە شوێنی خۆیان تەماشا دەکەن و خۆزگە بە تکا کردن دەخوازن)، دەوترێت: ئەزانن ئەمە چی یە؟ دەڵێن: بەڵێ ئەزانین ئەوە مردنە کە بەئێمە سپێردرابوو و لای هەمووان دەبینرێت، فەرمووی: فرمانی پێ دەکرێت پاڵ بخرێت و ئەنجا سەردەبڕێت وەك هەر سەربڕاوێك لەسەر شوراکە ی نێوان بەهەشت و دۆزەخ و بە هەردوو کۆمەڵەکە دەوترێت: (ئەی بەهەشتیەکان مانەوەیە و مردن نەما، و ئەی دۆزەخیەکان مانەوەیە و مردن نەما).لە ڕیوایەتێکدا:** ((فيأمَنُ هؤلاء، و يَنقَطِعُ رَجاءُ هؤلاء (فَيَزدادُ أهلُ الجَنّة فرحاً إلى فَرحِهِم ، ويَزدادُ أهلُ النّارِ حُزناً إلى حُزنِهِم) (ثُمَّ قرأ رسولُ الله ﷺ: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (مريم: ٣٩) و أشارَ بِيَدِهِ إلى الدُّنيا)))[٤٥٤]. **واتە: (ئیتر بەهەشتیەکان دڵنیا دەبن و دۆزەخیەکان بێ هیوا دەبن (بەهەشتیەکان زیاتر دڵخۆش دەبن و ئەهلی ئاگر زیاتر دڵ**

---

[٤٥٣] أخرجه: أحمد في (المسند) (٩/٣)، و البخاري في (الصحيح) (٤٧٣٠)، و مسلم في: (الصحيح) (٢٨٤٩)، و الترمذي في (الجامع الصحيح) (٢٦٩٥، ٣١٥٦) قال: حديث حسن صحيح، و ابن ماجة في (السنن) (٤٣٢٧)، و صححه الشيخ الألباني في: (صحيح سنن الترمذي) (٢٠٧٢، ٢٥٢٣)، و في: (صحيح سنن ابن ماجة (٣٤٩٣)، و في (مختصر شرح العقيدة الطحاوية) رقم (٥٧٦).

[٤٥٤] أخرجه: أحمد (٩/٣)، و(البخاري) (٤٧٣٠)، ومسلم (٢٨٤٩، ٢٠٥٠) أبو يعلى في (المسند) (٢٨٩٨)، و البزار في (المسند) (٣٥٥٧)، والطبراني في (الأوسط) (١٦٢٧)، و قال المنذري في: (الترغيب) (٥٥٧٩) رواه الطبراني في (الأوسط)بأسانيد صحيحة، و قال الهيثمي في: (المجمع) (٣٩٥/١٠) رواه أبو يعلى و الطبراني في الأوسط و البزار و رجالُهم رجالُ الصحيح غير نافع بن خالد وهو ثقة، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٧٧٣-٣٧٧٥)

نیگەران دەبن)، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (مريم: ٣٩) و بەدەستی نیشانەی بە دونیا دا).

## مانەوە لە دۆزەخدا بەهەتا هەتایی

ئیمامی طەحاوی (رحمه الله) دەفەرموێت: " القول بفناء النار لا تثبُتُ عن أحدٍ من الصحابة، وأنَّ ماصَّح عنهم عباراتٌ لاتُدل على فناء النار، ومن قال بذلك فقوله ضعيفٌ مرجوح مخالف للأدلة القطعية من الكتاب والسنة الدالة على بقاء النار أبد[الأبدين ودهر الداهرين ] وبقاء أهلها فيها كما قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ (المائدة: ٣٧) والصحيح إنه لايبقى في النار إلاّ من حبسه القرآن وهم الكفار واما من دخلها من الموحدين فانه لابد مِن خروجهِ منها برحمة ارحم الراحمين ثم بشفاعة الشافعين "[٤٥٥]. واتە: (لەهیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەهاتووە کە دۆزەخ تەواو دەبێت و کۆتایی پێدێت، بەڵکو چەند وتەیەکی ڕاستیان لێ گێڕاوەتەوە کە پەیوەندی بە لەناوچوونی دۆزەخەوە نیە، وەهەر کەسێك وابڵێت ئەوە وتەکەی لاوازە و جێگیر نیە و پێچەوانەی بەڵگە یەکلا کەرەوەکانی قورئان و فەرموودەیە کەدوو پاتی دەکەنەوە دۆزەخ و هەندێك نیشتەجێیانی هەتاهەتایە و هەردەم دەمێنێتەوە تیایدا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ واتە: (دەیانەوێت لە ئاگری دۆزەخ بێنەدەر و هەرگیز لێی نایەنەدەر و سزایەکی بەردەوامیان دەبێت لە ناویدا).

لە ڕاستیدا لەناو دۆزەخدا تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە قورئان بەندی کردوون تیایدا بەهەتاهەتایی ئەویش تەنها بێ باوەڕەکانە. بەڵام ئەوانەی یەکخوا پەرست بوون و کەوتوونەتە ناوی، ئەوانە بە دڵنیاییەوە دێنەدەر بە بەزەیی خوای گەورە و پاشان تکای تکاکاران).

[٤٥٥] انظر: (شرح العقيدة الطحاوية)(ص: ٦٢١-٦٢٢)، و (شرح السنة) للبربهاري(٢٤، ٢٥).

(حافظ أحمد الحكمي (رحمه الله)) دەفـەرمویێت: " وعصاة الموحدين يسكنون الطبقة العليا من النار على تفاوتهم في مقدار ماتأخذهُ منهم وجاء في ذلك آثار أن هذه الطبقة تفني بعدهم (والله اعلم)، وعلى ذلك حمل جمهور المفسرين الأستثناء المذكور في قوله تعالى ﴿...إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ هَٰذِهِۦ. . ﴾ (هود: ١٠٧) وما أحسن ماقاله ابن القيم رحمه الله في (الوابل الصيب): " لما كان الناس ثلاث طبقات: طيبٌ لايشوبه خُبث، وخبيثٌ لاطيّب فيه، وآخرون فيهم خُبثٌ وطيب، كانت دورهم ثلاثة: دار طيب المحض ، ودار الخبيث المحض وهاتان داران لاتفنيان، ودارٌ لمن معهُ خُبثٌ وطيب، وهي الدار التي تفني وهي دار العصاة فانه لايبقى في جهنم من عصاة الموحدين احدٌ ، فانّهم إذا عُذِّبوا بقدر جزائِهم أخرجوا مِن النّار فادخلوا الجنة ولا يبقى إلاّ دار الطيّب المحض ودار الخبيث المحض"[٤٥٦]. **واتـە: (سەر پێچی کارە یەکخوا پەرستەکانی نیشتەجێی بەشی سەروی دۆزەخ دەکرێن هەر چەندە جیاوازیش بن لەسزاو سوتاندا. وەلە هەندێك گێڕانەوەدا هاتووە کە ئەو بەشە لەدوای دەرچوونی ئەوان نامێنێت و لە ناو دەچێت** (والله أعلم).

**وە زۆرینەی زانایانی تەفسیریش فەرموویانە:** (الا ما شاء ربك) **واتە: (هەموو لە دۆزەخ دەمێننەوە تەنها ئەوانەی کە خوا خۆی دەیەوێت دەریان بکات لە دۆزەخ) مەبەستی لەیەکخوا پەرستانە. وەلێرەش دا چەند جوانە وتەکەی** (ابن القيم) **لە کتێبی** (الوابل الصيب)**دا: فەرموویەتی: (خەڵکان سێ پلەن: هەیان پاکە و چڵکی پێ وەنیە، وەهەیانە چڵکنە و پاکی تێدا نیە، وەهەیانە چڵکی و پاکی لە خۆگرتووە لەبەر ئەوەش جێگاکانیان سیانە: جێگەی پاکەکان بەتەنهایە وەجێگەی پیسەکان بەتەنهایە، ئەو دوو جێگەیەش هەردەمێننەوە هەرگیز نافەوتێن، وەجێگەی سێیەمان بۆ ئەوانەی پاکی و پیسیان هەیە، ئەو جێگەیەش دەفەوتێت و نامێنێت ئەوەش جێگەی سەرپێچکارانە یەکخواپەرستەکانە کە هیچیان لە دۆزەخدا نامێننەوە لە دوای تەواو بوونی سزاکەیان و دەچنە بەهەشت و تەنها جێگەی تەواو پاکەکان و جێگە تەواو پیسەکان دەمێنێتەوە).**

---

[٤٥٦] أنظر: (معارج القبول) للحكمي(١٩٦/٢)، و(عقيدة أهل السنة والجماعة) للعثيمين (ص: ٢٦)، و(شرح لمعة الأعتقاد) (ص: ٨٤) للعثيمين، و(شعب الأيمان) للحليمي (ص: ٩٠)، و(الوابل الصيب) لأبن قيم الجوزية (ص: ٢٥)، و(لوامع الأنوار البهية) للسفاريني (٢٣٢/٢)، وينظر حول الموضوع: (الرد على من قال بفناء الجنة و النار) لأبن تيمية (ص: ٥)، و(رفع الأستار لأبطال أدلة القائلين بفناء النار) للصنعاني(ص: ٢٠)، و (توفيق الفريقين على خلود أهل الدارين) للعلامة مرعي الحنبلي(ص: ٧)، و(الأعتبار ببقاء الجنة والنار)للسبكي، و(شرح السنة) للبربهاري (ص: ٧٧).

# ترسان لەئاگری دۆزەخ

پێویستە موسوڵمان لەخوای گەورە بترسێت و ترسی هەبێت لەسزاکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ ... ﴾ (الزمر: ١٦)واتە: (ئەو سزاییە خوای گەورە بەندەکانی پێ دەترسێنێت).

وە هەر کەسێك خوای گەورە زیاتر بناسێت وە زانیاری زیاتر بێت لەخوای گەورە دەترسێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْۗ ... ﴾ (الفاطر: ٢٨) واتە: (لە بەندەکانی خوای زیاتر زاناکان دەترسن لە خوای گەورە)، لەبەر ئەوەشە فریشتەکانی خوا سەلامی خوایان لێ بێت زیاتر لە خوا دەترس وە بەتایبەت جبریل و میکائیل سەلامی خوایان لێ بێت). جابر ﷺ گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((مررت بجبريل ليلة أُسري بي بالملأ الاعلى وهو كالحلس البالي من خشية الله عزوجل))[٤٥٧] واتە: (بەلای جبریل دا تێپەڕیم بینیم لەکاتی شەوڕەویەکەمدا لە نێوان کۆمەڵی هەرە بەرزەکاندا بینیم جبریل وەکو پۆشاکێکی کۆنی لەبەرکراو بوو لەترسی خوای گەورە و میهرەبان).

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ((أن رسول الله ﷺ قال لجبريل ﷺ: ((مالي لم أر ميكائيل ضاحكاً قط؟ قال: ماضحك ميكائيل منذ خلقت النار))[٤٥٨]. واتە: (پێغەمبەر ﷺ بەجبریلی فەرموو: بۆچی نابینم میکائیل قەت پێبکەنێت، ئەویش فەرمووی: لەوکاتەی خوای گەورە دۆزەخی دروست کردووە میکائیل پێنەکەنیوە. وەخوای گەورە وەسفی فریشتە بەڕێزەکانی خۆی کردووە و فەرموویەتی: ﴿... وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴾ (الانبياء: ٢٨) واتە: (فریشتەکان زۆر زۆر دەترسن لە خوای گەورە)، وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ

---

[٤٥٧] أخرجه: البزار (٣١٦/٢)، وابن سعد (١١١/١)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٤٦)، و رواه الطبراني (الأوسط) ورجاله رجال الصحيح، وقال الحافظ في (الكافي الشاف) (١١٢/٣) إسناده قوي، وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٢٢٨٩).

[٤٥٨] أخرجه: أحمد (٢٢٤/٣)، وابن أبي الدنيا (صفة النار)(٢١٩)، وفي (الرقة والبكاء) (٤٠٨)، وجود أسناده الحافظ العراقي (الأحياء)(٢٦٣/٤)، وحسنه الشيخ الألباني في(السلسلة الصحيحة)(٢٥١١).

وەسفی ترسی خۆی کردووە لەخوای گەورە، وەکو ئیبنو عەباس گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((شيبتني هود والواقعة والمرسلات وعمَّ يتساءلون واذا الشمس كورت))[٤٥٩] واتە: (ئەو شەش سورەتە دیاریکراوە پیریان کردم). پێغەمبەرﷺ موسوڵمانانی زۆرباش ئاگادار کردەوەتەوە لەئاگری دۆزەخ).

نەعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەفەرموێت: ((سمعت رسول الله ﷺ يخطب يقول ((أنذرتكم النارثلاثاً))[٤٦٠] واتە: (گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو وتاری دەدا و دەیفەرموو: ئاگادارتان دەکەمەوە لەئاگر (ئەوەی سێ جار دووبارەکردەوە)، نەعمان دەفەرموێت: گەر لەجێگەی من دابوایە لەکوفە ئەوە خەڵکانی ناو بازار گوێیان لێ دەبوو ئەوەند دەنگی بەرزکردەوە، تاوەکو ئەوکراسەی کەلەسەر شانی بوو کەوتە خوارەوە بۆ (لای قاچی)وە، وە پێغەمبەرﷺ ئاگاداری موسوڵمانانی کردۆتەوە کە تادەتوانن خۆیان ڕزگارکەن لەئاگر.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مارأيتُ مثل النار نام هاربها، ولا مثل الجنة نام طالبها))[٤٦١]. واتە: (نەم بینیوە وەك دۆزەخ ڕاکردووەکەی خەوتبێت، وە نەم بینیوە وەك بەهەشت داواکارەکەی خەوتبێت)). وە پێغەمبەری خوا ﷺ خزمانی خۆیی و موسوڵمانانی ئاگادار کردۆتەوە لەئاگر وەلەپێش هەموویانەوە فاطیمەی کچی پاشان ئامۆزاکەی، پاشان هۆزە نزیکەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ((دعا رسول الله ﷺ قريشاً، فاجتمعوا، فعمَّ وخصّ فقال: ((يا بني كعب بن لؤي انقذوا أنفسكم من النار، يابني مرّة بن كعب انقذوا أنفسكم من النار، يابني عبد شمس انقذوا أنفسكم من النار يا بني عبد مناف انقذوا أنفسكم من النار، يا بني هاشم انقذوا أنفسكم من النار، يا فاطمة

---

[٤٥٩] أخرجه: الترمذي (٣٢٩٧)، و أبو نعيم (الحلية) (٣٥٠/٤)، والحاكم (٣٤٤/٢)وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٩٥٥)، و(صحيح الترمذي) (٢٦٢٧)، و(صحيح الجامع) (٣٧٢٣).

[٤٦٠] أخرجه: أحمد (٢٦٨/٤)، والدارمي(٢٨١٢)، وابن أبي شيبة (٣٤١٢٥)، والحاكم (٢٨٧/١)وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٦٤٤)، وقال محققه: إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٦٥٩).

[٤٦١] أخرجه: الترمذي (٢٦٠١)، وأبو نعيم (الحلية)(١٧٨/٨)، والطبراني (الأوسط) (١٦٦٠)، و القضاعي (مسند الشهاب) (٦٧/٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٩٥١)و(صحيح الترمذي) (٢٠٩٧).

أنقذي نفسك من النار، فأني لا أملكُ لكم من الله شيئاً غير أن لكم رحماً سأبُلّها ببلالِها)) [٤٦٢]. واتە: (ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ قورەیشی بانگ کرد و کۆی کردنەوە و ناوی هەندێکیانی بەتایبەت هێناو پاشان بەگشتی ناوی هەموویانی هێناو فەرمووی: ((ئەی کوڕانی بەنی کەعب خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی کوڕانی بەنی مورەی کوڕی کەعب ئێوەش خۆتان ڕزگار بکەن لەئاگر، ئەی کوڕانی عەبد شەمس خۆتان ڕزگار بکەن لەئاگر، ئەی کوڕانی عەبدمەناف خۆتان ڕزگاربکەن لەئاگر، ئەی کوڕانی بەنی هاشم خۆتان ڕزگارکەن لە ئاگر، ئەی فاتیمە خۆت ڕزگاربکە لەئاگر چونکە من هیچ دەسەڵاتێکم نیە و هیچم پێ ناکرێت بۆتان لای خوای گەورە، تەنها ئەو پەیوەندیە خزمایەتیە هەیە لەنێوانماندا و پێویستە لەسەرم بەماف خۆی بگەیەنم و جێ بەجێ کردنی پێویستە لەسەرم بۆ ئێوە).

عامری کوڕی قەیس ﷺ دەفەرموێت: ((مارأيت مثل الجنة نام طالبها، ولا رايتُ مثل النار هاربها، وقال: وكان إذا جاء الليل، قال: أذهب حرُّ النار النوم، فما ينام حتى يصبح، فإذا جاء النهار، قال أذهب حرُّ النار النومَ، فما ينام حتى يمسى، فإذا جاء الليل، قال: من خاف أدلج، بعد يحمد القوم السرى" [٤٦٣]. واتە: (نەم بینیوە وەك بەهەشت داواکارەکەی خەوتبێت، ، وە نەم بینیوە وەك دۆزەخ ڕاکردوەکەی خەوتبێت، وەکاتێك شەو دەهات دەیوت، گەرمی دۆزەخ خەوی نەهێشتوم ! پاشان نەدەخەوت تا بەیانی دەکردەوە، وەکاتێکیش نیوەڕۆ دەهات دەیوت: گەرمی دۆزەخ خەوی نەهێشتوم ! پاشان نە دەخەوت تا ئێوارە و شەویش دیسان دەهات دەیوت: هەر کەسێك بترسێت زوو دەکەوێتە ڕێ و لەدوایشدا خەڵکان چاکیەتی زوو کەوتنە ڕێیان بۆ دەردەکەوێت).

---

[٤٦٢] أخرجه: البخاري (٢٠٦)، و مسلم (٢٠٤، ٥٠٠)، والترمذي (٣١٨٥)، والنسائي (٢٤٩/٦)، وأحمد (٣٣٣/٢)، و الدارمي (٢٦٣٢)، و أبو يعلى(٦٣٢٧).

[٤٦٣] أخرجه: هناد (الزهد) (٨٠٥) وقال محققه: اسناده حسن.

# خۆ پاراستن لە دۆزەخ

پێویستە لەسەر موسوڵمان کەخۆی بپارێزێت و خۆی دوربخاتەوە لەئاگری دۆزەخ وە ئەمەش بەئەنجام دانی کاری چاکە و بیروباوەڕی ڕاست و دوور کەوتنەوە لەکوفرو هاوبەش دانان بۆ خوا و ئەنجام نەدانی گوناه و تاوان، وەکو پێغەمبەرﷺدەفەرموێت: ((فاتقوا النار ولو بشق تمرة))[٤٦٤] واتە: (خۆتان بپارێزن لە دۆزەخ گەر بەلەتە خورمایەکیش بێت)، وە لەو کردەوە چاکانەی کە دەبێتە هۆی ڕزگاری کردنی خاوەنەکانی لە دۆزەخ ئەمانەی لای خوارەوەن:

**١- ڕۆژوو:**

جابر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((قال الله تعالى: الصيام جُنّة يستجِنُّ بها العبد من النار))[٤٦٥] واتە: (خوای گەورە فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانێکە بەندەی موسوڵمان بەو قەڵغانە خۆی لەئاگر دەپارێزێت)، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((من صام يوماً في سبيل الله تعالى باعد الله وجهه عن النار سبعين خريفاً))[٤٦٦]. واتە: (هەرکەسێك تەنها یەك ڕۆژ لەبەر خوا بە ڕۆژوو بێت خوای گەورە حەفتا ساڵ ڕووی لەئاگر دوو دەخاتەوە).

**٢- ترسان لەخوای گەورە:**

خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾ (الرحمن: ٤٦) واتە: (ئەوانە لە خوا دەترسن دوو بەهەشتیان هەیە)، ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لايلِجُ النار رجلٌ بكى من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع ولايجتمع غبارٌ في سبيل الله ودخان نار جهنم في [منخري مسلم أبداً]))[٤٦٧]. واتە:

---

[٤٦٤] أخرجه: البخاري (١٤١٧)، ومسلم (١٠١٦).

[٤٦٥] أخرجه: أحمد (٣٩٦/٣)، والبيهقي (الشعب) (٥٣٧٠)، وقال المنذري في (الترغيب) (١٤٣٣)إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع)(٤٣٠٨)و(صحيح الترغيب) (٩٧٠)

[٤٦٦] أخرجه: البخاري (٢٨٤٠)، ومسلم (١١٥٣)، والترمذي (١٩٢٣)، والنسائي (١٧٣/٤).

[٤٦٧] أخرجه: أحمد (١٢/٦) النسائي (١٢/٦)، والترمذي (١٦٣٣)وصحح اسناده الشيخ الألباني في (المشكاة) (٣٨٢٨) وصحيح الترمذي (١٣٣٣)، و(صحيح النسائي)(٢٩١١، ٢٩١٦).

(ناچێتە دۆزەخەوە پیاوێك گریا بێت لەترسی خوا تا شیر نەگەڕێتەوە ناو گوان، وە تۆزی ڕێگەی خوا و دوو کەڵی ئاگری دۆزەخ هەرگیز لە لووتی موسوڵمانێکدا کۆنابێتەوە)، لە ڕیوایەتێکی تردا (أبا عبس ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من إغبَّرتْ قدماهُ في سبيل الله فهو حرامٌ على النار))[٤٦٨]. واتە: (هەر کەسێك هەر دوو قاچی لە پێناوی خوادا تۆزاوی بوو بێت ئەو کەسە حەرام کراوە لە سەر دۆزەخ کە بیسوتێنیت).

**٣- خۆشەویستی خوای گەورە:**

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثٌ من كُنَّ فيه حُرمَ على النار، وحرمت النار عليه: أيمان بالله، وحُب الله، وأن يُلقى في النار فيُحرق احبُ أليه من أن يرجع في الكفر))[٤٦٩]. واتە: (سێ شت هەن لە هەرکەسێك دا هەبێت.ئەو کەسە حەرام کراوە لەسەر دۆزەخ وە دۆزەخیش حەرام کراوە لەسەر ئەو، باوەڕبوون بەخوا وە خۆشەویستی خوا، وەپێی خۆش بێت فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە و بسوتێت نەك بگەڕێتەوە بۆ سەر کوفر).

**٤-گونجاندن لەگەڵ خەڵکدا و خۆبەکەم زانین و نەرم و نیانی:**

ئیبن مەسعود ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ألا أخبركم بمن تحرم عليه النار؟ قالوا بلى يا رسول الله ﷺ قال: ((على كل هيّن ليّن قريب[من الناس] سهل))[٤٧٠]. واتە: (ئایا پێتان ڕاگەیەنم کێ ئاگری لەسەر حەرام دەکرێت؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: حەرام دەکرێت لەسەر هەموو کەسێکی خۆبەکەم زان و نەرم ونیان و ئاسان کار و نزیك لەخەڵکی).

**٥- بەجێ هێنانی نوێژ و زەکات دان وبەجێ گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی:**

ئەبو ئەیوب ﷺ دەفەرموێت: ((پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: کردەوەیەکم نیشان بدە نزیکم بکاتەوە لەبەهەشت و دوورم بخاتەوە لە ئاگری دۆزەخ ؟ پێغەمبەر ﷺ

---

[٤٦٨] أخرجه: الترمذي(١٦٨٩، ١٦٩٨)، والنسائي (٣١١٦)، وصححه الشيخ الألباني(صحيح النسائي) (٢٩١٩).

[٤٥٤] أخرجه: أحمد (١٢١٢٢)وقال محققه الشيخ الأرناؤوط أسناده حسن، وأخرجه أبو يعلى (٣٧٢٧).

[٤٦٩] أخرجه: أحمد (١٢١٢٢)وقال محققه الشيخ الأرناؤوط أسناده حسن، وأخرجه أبو يعلى (٣٧٢٧).

[٤٧٠] أخرجه: أحمد (٣٩٣٨)، والترمذي (٢٤٨٨)، والطبراني (الكبير) (١٠٥٦٣)، وابن حبان (٤٦٩)وقال محققه: حديث صحيح بشواهده، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٩٣٥-٩٣٨)، و(صحيح سنن الترمذي) (٢٠٢٢)و(صحيح الجامع) (٢٦٠٩).

فەرمووی: ((تعبدُ الله و لاتشرك به شيئاً، وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة، وتصل ذا رحمك)) واتە: (خوای گەورە بپەرستە و هاوبەشی بۆ بڕیارمەدە، وە نوێژەکانت ئەنجام بدە و زەکاتیش ببەخشە و چاکە لەگەڵ خزمەکانیشت بکە)، پاشان پیاوەکە ڕۆیشت و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إن تمسك بما أُمر به دخل الجنة))[٤٧١] واتە: ((گەر پابەند بێت بەو کارانەی فەرمانی پێ کرادەچێتە بەهەشت)).

**٦- ئازاد کردنی باوەڕدار:**

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من أعتق رقبة مؤمنة، اعتق الله بكل عضو منها عضواً منه من النار))[٤٧٢]. واتە: (هەرکەسێك گەردنی باوەڕدارێك ئازاد بکات خوای گەورە لەجیّی هەرئەندامێکی کەسە ئازادکراوە کە ئەندامێکی لاشەی کەسە ئازادکارەکە ئازاد دەکات لە ئاگری دۆزەخدا).

**٧- پاراستنی داوێن و زمان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من يتكفلُ لي ما بين لحييه ومابين رجليه أتكفل له بالجَنّة))[٤٧٣] واتە: ((هەرکەسێك زەمانەتم بداتێ کە نێوان هەردوو لای ڕیشی(واتە: زمان) و نێوان هەردوو قاچی(عەورەت) بپارێزێت ئەوا من زەمانەتی چوونە ناو بەهەشتی بۆ دەکەم)).

**٨- ئەنجام دان و پارێزگاری کردنی چوار ڕکات نوێژی پێش نیوەڕۆ دوای نیوەڕۆ:**

ئوم وحەبییە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من حافظ على أربع ركعات قبل الظهر، وأربع بعدها حرّمه الله تعالى على النار))[٤٧٤] واتە: (هەرکەسێك

---

[٤٧١] أخرجه: أحمد (٤٨١/٥)، والبخاري (٥٩٨٣)، ومسلم (١٤٥١٣)، والنسائي (٢٣٤/١)، واللفظ لمسلم.

[٤٧٢] أخرجه: أحمد (٤٢٠/٢)، والبخاري (٢٥١٧)،، ومسلم (١٥٠٩)، والترمذي (١٥٤١)، والبيهقي (الكبرى) (٢٣١/١٠)، وابن حبان (٤٣٠٨).

[٤٧٣] أخرجه: الترمذي (٢٤٠٨)، والحاكم (٣٥٧/٤)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٥٧٠٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٦٣)واللفظ له.

[٤٧٤] أخرجه: أحمد (٣٢٥/٦)، وأبو داود (١٢٦٩)، والنسائي (٢٦٥/٣)، والترمذي (٤٢٧)، وصحح اسناده أحمد شاكر في تحقيقه على (سنن الترمذي)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (١٧١٢)، و (صحيح الترمذي)(٣١٥-٣٥٢)، و(صحيح الترغيب) (٥٨٣)، و(صحيح الجامع) (٦١٩٥)، و(صحيح أبي داود) (١١٣٠)، و(المشكاة)(١١٦٧).

پارێزگاری بکات لە ئەنجامدانی چوار ڕکات نوێژی پێش نیوەڕۆ و وە چوار ڕکاتی نوێژی دوای نیوەڕۆ خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات).

**٩- نوێژکردن بەجەماعەت:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((من صلّى لله أربعين يوماً في جماعة يُدركُ التكبيرة الأولى كُتبت له براءتان: براءةمن النار، وبراءة من النفاق))[٤٧٥]. واتە: (هەرکەسێك چل ڕۆژ نوێژ بەجەماعەت بکات، بۆ خوا و فریای (اللەأكبر)ی یەکەم جار بکەوێت ئەو کەسە دوو ڕزگار بوونی بۆ دەنوسرێت ڕزگار بوونێك لە ئاگر و ڕزگار بوونێك لەنیفاق و دوو ڕوویی).

**١٠- بەرگری کردن لە کەسایەتی و ڕێزی موسوڵمان:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من ذب عن عرض أخيه بالغيبة كان حقاً على الله أن يعتقه من النار))[٤٧٦] واتە: (هەرکەسێك بەرگری لە کەسایەتی برایەکی موسوڵمانی بکات لە پاشملە ئەو کەسە خوا بە پێویستی داناوە لەسەر خۆی کە ئازادی بکات لە ئاگری دۆزەخ). لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((من ردَّ عن عرض أخيه ردّ الله عن وجهه النار يوم القيامة))[٤٧٧]. واتە: (هەرکەسێك بەرگری لە کەسایەتی برایەکی موسوڵمانی خۆی بکات خوای گەورەش ئاگری دۆزەخ لە ڕووی دوور دەخاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا).

**١١- پەروەردەکردنی کچان:**

عوقبەی کوڕی عامر ﷺ گێراویەتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من كن له ثلاث بنات فصبر عليهن كُنَّ له ستراً من النار))[٤٧٨]. واتە: (هەرکەسێك سێ کچی هەبێت و ئارام بگرێت لەپەروەردەکردنیان ئەو کارەی دەبێتە پەردەیەك و دەیپارێزێت لە ئاگر).

---

[٤٧٥] أخرجه: الترمذي (٢٤١)، وابن عدى (الكامل) (١١٦/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٠)، وفي (السلسلة الصحيحة) (١٩٧٩-٢٦٥٤).

[٤٧٦] أخرجه: أحمد (٤٦١/٨)، وحسن اسناده الحافظان المنذري (الترغيب) (٤٨٣)، والهيثمي في (المجمع)(٩٥/٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٦٢٤٠)، و (غاية المرام) (٤٢١).

[٤٧٧] أخرجه: الترمذي (١٩٣١)، وابن أبي الدنيا(الصمت)(١٢٤٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٥٧٥)و(غاية المرام) (٤٣١).

[٤٧٨] أخرجه أحمد (١٥٤/٤)والبخاري (الأدب المفرد) (٧٦)، وابن ماجة (٣٦٦٩)، والطبراني(٣٠٠/١٧)، والحاكم (٥٧/٤) والروياني (٢٢٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٥٦)، و(السلسلة الصحيحة) (٢٩٤).

**١٢- پاسەوانی کردن و نەڕاونین بۆ حەڕامکراوەکان لەترسی خوا:**

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((ثلاثة لاترى أعيُنهم النار يوم القيامة: عين بكى من خشية الله، وعين حرست في سبيل الله، وعين غضت عن محارم الله))[٤٧٩]. واتە: (سیان هەن چاویان ئاگر نابینێت واتە: (نایان سوتێنێت لە ڕۆژی کۆتاییدا: چاوێك لەترسی خوا گریا بێت، وە چاوێك شەونخونی کرد بێت لە پێناوی خوادا، وە چاوێك نوقابێت لە ڕوانین و تەماشاکردنی حەرامکراوەکان لە ترسی خوا). ئەی موسوڵمانی خۆشەویست خۆت بپارێزە لە تەماشاکردنی نامەحرەم چونکە هەر چەند لای خۆت بچوك بێت ئەو تاوانە لای خوا گەورەیە، وە ئەمەش شکاندنی فەرمانی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ لَكُمْ . .﴾ (النور: ٣٠) واتە: (بەبڕواداران بڵێ چاویان بەرامبەر حەرام بنوقێنن). بیلالی کوڕی سەعد (رحمه الله) فەرموویەتی: "لاتنظر الى صغر المعصية ولكن انظر الى من عصيت"[٤٨٠]. واتە: (تەماشای بچوکی گوناهەکەت مەکە بەڵام تەماشا کە بەرامبەر کێ ئەو تاوانەت ئەنجام داوە).

**١٣-یادکردنی خودا:**

عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((. . . ما من شيءٍ انجى من عذاب الله من ذكر الله))[٤٨١]. واتە: (هیچ شتێك نیە کاراتر بێت بۆ ڕزگارکردنی بەندە لە سزای خوا وەك یادکردنی خوا (واتە: زکر)). وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خذوا جنتكم من النار قولوا: سبحان الله والحمد لله ولااله إلا الله والله أكبر فانهن يأتين يوم القيامة مجنَّباتٍ ومُعقَّبات وهُنَّ الباقياتُ الصالحات))[٤٨٢]. واتە: (قەڵغان وەرگرن لە ئاگری دۆزەخ و بڵێن:

---

[٤٧٩] أخرجه: ابن عساكر (تاريخ دمشق) (٢٩٧/٣)، والحاكم (٨٣/٢)وصححه ووافقه الذهبي، وابن أبي شيبة (١٥٨/٧)، وأحمد (١٣٤/٤)، وابن ابي عاصم (الجهاد)(٨٦/٢)، والطبراني (الكبير)(١٠٣/١٩)، والبيهقي (١٤٩/٩) وحسن أسناده الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٦٧٣)وفي(صحيح الترغيب) (١٢١٧).

[٤٨٠] أخرجه: ابن مبارك في (الزهد) برقم (٦٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٤٨١] أخرجه: البيهقي (الشعب) (٥٢٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب)(١٤٩٥).

[٤٨٢] أخرجه: النسائي (عمل اليوم والليلة)(٨٤٨)، والطبراني (الصغير)(١٤٥/١)، والحاكم (٥٤١/١)، والبيهقي (الشعب)(٦٠٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع)(٣٢١٤)، (صحيح الترغيب)(١٥٦٧).

(سبحان الله والحمد الله و لا إله الا الله والله أكبر) ئەوانە لە قیامەتدا دێن و هەر چوار لای بەندە دەگرن و دەیپارێزن، و هەر ئەوەشی دەمێنێتەوە وە لەکارە چاکەکانە).

# هەندێك لەو تاوانانە کەخاوەنەکەی پێی دەچێتە دۆزەخ

**١- چروکی ونا پاکی و فێلکردن و خیانەت کردن:**

عیاض ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أهل النار خمسة: الضعيف الذي لايؤبه له وفي رواية- [لازبرلهٔ] الذين هم فيكم تبعٌ لايبغون اهلاً ولامالاً[٤٨٣] ورجل لايصبح ولايمسى الاوهو يخادعك عن أهلك ومالك، ورجل لايخفى عليه شئ الا خانهٔ وان دق وفي رواية: [والخائن الذي لايخفى له طمعٌ وان دق إلا خانه ] وذكر الكذب، والبُخل [والشنظير الفحاش (أي: السيء الخلق)]))[٤٨٤]. واتە: (دۆزەخیەکان پێنج کەسن: یەکەمیان: لاوازێکی بێ توانای بێ نرخی شوێن کەوتووی ئەم ئەو وە بێ ژن و ماڵ (واتە: بەدوای خراپە وێڵن خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە ژن هێنان و ئیش و کاری حەلاڵ). دوومیان: پیاوێکە بەیانی و ئێوارە لە فێڵدایە لە ژن و ماڵی ئەم وئەو. سێهەمیان: پیاوێکی ناپاك و چاوبرسیە هەر کارێکی پێ بسپرێت خیانەت و ناپاکی تیا دەکات ئەگەر بچووکیش بێت. چوارەمیان: کەسێکی زۆر درۆزن و چروکە. پێنجەمیان: کەسێکی خوو خراپ و ڕەوشت نزمە).

**٢- خۆبەزل زانین و زۆرداری:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...... أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ (الزمر: ٦٠)

واتە: (دۆزەخ شوێن و جێگەی خۆبەزل زانەکانە). ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر))[٤٨٥].

واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی بەئەندازەی سەنگی گەردێك خۆبەزل زانی لەدڵیدا

---

[٤٨٣] أي: هو الذي لاعقل له ينهاهٔ عن الأقدام فيما لاينبغي لانه ليس له همةٌ في طلب الدنيا ولا الآخرة، وانما همّهُ شهوة بطنه وفرجهِ كيف اتفق له .

[٤٨٤] أخرجه: أحمد (٤/٢٦٦)، ومسلم (٢٨٦٥)؛ والطبراني (الكبير) (١٧/٩٩٢)، وابن حبان (٧٤٨٢)، وقال محققه إسناده على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الجامع)(٢٦٣٧).

[٤٨٥] أخرجه: مسلم (٩١)، والترمذي (١٩٩٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٦٢٤).

فەرموویـەتی: ((اختصمت الجنة والنار فقال النار أوثرتُ بالمتكبرين والمتجبّرين. . .))[٤٨٦]. واتـه: (بەهەشت و دۆزەخ بێـت)، وە ئـەبو هـورەیرە ﷺ گێراویەتیـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ بووە دەمەقاڵێیان دۆزەخ وتی: هەرچی پشت شکێن و زۆردار و خۆبەزل زانەکانە بەشی منن و دێنە ناو من). وە لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((يُحشر المتكبرون يوم القيامة أمثال الـذّر في صور الرجال يغشاهم الـذُل من كل مكـان، يساقون إلى سجن في جهنم يسمى بُولَس تَعلُوهم نار الأنيار. . .))[٤٨٧]. واتـه: (خۆبـەزل زانـەکان لـە ڕۆژی قیامـەت دا لـە وێنـەی مێـروو لـە بچوکەکاندان، لەشێوەی پیـاودا کۆدەکرێنـەوە، زەلیلی و ڕسواییان توش دەبێت لەهەموو جێگەیەکەوە ڕاپێچ دەکرێن بۆ بەندیخانەیەك لـە دۆزەخدا کەپێی دەوترێت((بولس)) ئاگری هەموو ئاگرەکانیان لە ژوورسەرەوە دەبێت).

**٣- بێ باوەڕی و هاوتا بۆ خوابڕیاردان و باوەڕنەبوون بەزیندوبونەوە:**

خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (الرعد: ٥) واتە: (گەر سەرت بسوڕمێنێت لە ڕاستیدا وتەی بێ باوەڕان جێی سەرسوڕمانە کە دەڵێن: گەر ئێمە ببینە خۆڵ ئایا ئێمە جارێکی تر سەر لە نوێ دروست دەکرێینەوە، ئەوانە لەڕاستیدا بێ باوەڕن بە خوای خۆیان، ئەوانە کۆت و زنجیر دەکرێتە گەردنیان و ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن و بەهەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە).

ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من مات يشرك بالله شيئا دخل النار))[٤٨٨]. واتە: (هەرکەسێك بمرێت و هەرشتێکی کرد بێتـە هاوبەشی خوا دەچێتە ناو دۆزەخەوە).

---

[٤٨٦] أخرجه: أحمد (٢/٢٧٦)، والبخاري (٤٨٥٠)، ومسلم (٢٨٢٦)، وعبد الرزاق(٢٠٨٩٤)، و البغوي (٤٤٢٢)، وابن حبان (٧٤٤٧) وقال محققه حديث صحيح.

[٤٨٧] أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٥٥٧)، والترمذي (٢٤٩٢)، والبزار (٣٤٢٩)، وحسن إسناده الحافظ العراقي في (الأحياء) (٣/٣٢٩)، وحسنه أيضاً الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٢٥) و(المشكاة) (٥١٢١)، و صحيح الأدب المفرد) (٤٣٤).

[٤٨٨] أخر جه: البخاري (١٢٣٨).

**٤- دووڕوویی:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ (النساء: ١٣٨). واتە: (مژدە بدە بە دوو ڕووەکان کەسزایەکی پڕ ئازاریان بۆ ئامادەکراوە).

وەهەروەها دەفەرموێت﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴾ (النساء: ١٤٥). واتە: (دوو ڕووەکان لە جێی هەرە خوارووی دۆزەخن و هیچ پشتیوانێکیان نی یە).

**٥- رووپامایی( الرياء):**

ڕیاباز چونکە کارەکەی بۆ خوا نەبووە لێ وەرناگیرێت، بەوەش دۆزەخی بۆ مسۆگەر دەبێت. وەکو لەم فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا هاتووە دەربارەی ئەو سێ کەسەی پرسیاریان لێ دەکرێت پێش هەموو خەڵکان دەکرێنە دۆزەخەوە.

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أول الناس يقضى يوم القيامة [عليه] رجلٌ جمع القرآن ورجلٌ قتل في سبيل الله ورجلٌ كثير المال. . . ياأبا هريرة اولئك الثلاثة أول خلق الله تُسعربهم النار يوم القيامة))[٤٨٩]. واتە: (یەکەم کەس لەخەڵکان کەدادگایی دەکرێت لەقیامەتدا پیاوێکە هەموو قورئانی لەبەر بووە، وە پیاوێکە لە پێناوی خوادا کوژراوە وە پیاوێکی پارە زۆربووە. . . لەکۆتایی فەرموودەکەدا: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەوانە یەکەم دروست کراوی خوان کە دۆزەخیان بێ گەرم دەکرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**٦- کۆمەڵ و تاقمە گومڕاکان:**

موعاویە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ألا إنّ من قبلكم من أهل الكتاب إفترقوا على اثنين وسبعين ملة في رواية [ فرقة ]وان هذه الامة ستفترق على ثلاث وسبعين ثنتان وسبعون في النار، و واحدة في الجنة وهي الجماعة [قالوا: ومن هي يارسول الله؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي])) [٤٩٠] واتە: (ئاگاداربن خاوەن کتێبەکانی پێش ئێوە

---

[٤٨٩] أخرجه: مسلم (١٩٠٥)، والترمذي (٢٣٨٢)، النسائي (٢٣/٦)، وابن حبان (٤٠٨) وقال محققه اسناده صحيح، والحاكم (١٦٨/١)، وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٢٠).

[٤٩٠] أخرجه: أبو داود (٤٥٩٧)، والدارمي (٢٤٠/٢)، وأحمد (١٠٢/٤)، والترمذي (٢٦٤١)، والحاكم (١٦٨/١) وصححه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في(السلسلة الصحيحة) (٢٤٠)، و(صحيح الترمذي) (٢١٢٩).

(واتە: جوولەکەو گاور) بوونە حەفتا و دوو تاقم و ڕێبازی جیا، وە ئەم ئومەتەش دەبێتە حەفتا و سێ تاقم و ڕێبازی جیا، حەفتاو دوویان لە دۆزەخدان، وەتەنها یەکێکیان لەبەهەشتدایە ئەویش (الجماعة)یە. وتیان: ئەویەکەیان کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەوەیانە کە لەسەر ئاین و ڕێبازی من و هاوەڵانمە).

عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: ((الجماعة الكتاب والسنة وإن كنت وحدك)). واتە: (ووشەی (الجماعة) بریتیە لە شوێن کەوتنی قورئان و سوننەت گەر بەتەنهاش بیت). لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((الجماعة أهل الحق وإن كنت وحدك))[٤٩١]. واتە: (ووشەی (الجماعة) بریتیە لە شوێن کەوتنی ڕاستی و حەق گەر خۆت بەتەنهاش بیت).

پێغەمبەر ﷺ لە چەند فەرموودەیەکدا باسی یەکێك لەو کۆمەڵە گومڕایانەمان بۆ دەکات وەك (خوارج) و دەفەرموێت: (سەگەکانی دۆزەخ) فەرموودەکەش ئەبو ئومامە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((كلاب النار شرُّ قتلى تحت اديم السماء))[٤٩٢] واتە: (ئەوانە سەگەکانی دۆزەخن و خراپترین کوژراون لە ژێر ئاسماندا). وە لەڕیوایەتێکی تردادەفەرموێت: ((الخوارج كلاب النار))[٤٩٣] (خەواریجەکان سەگەکانی دۆزەخن)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((كلاب أهل النار))[٤٩٤]. واتە: (سەگەکانی دۆزەخ). ئەبو ئومامەش ﷺ دەفەرموێت: ((كنا نسمي اصحاب الاهواء كلاب النار))[٤٩٥]. واتە: (ئێمە بەو کەسانەی کە شوێن کەوتووی ئارەزووەکانی خۆیان بوون پێمان دەوتن: سەگەکانی دۆزەخ).

سەعیدی کوڕی جیمان (رحمه الله) دەڵێت: ((كانت الخوارج يدعونني حتى كدت أن أدخل معهم فرأت اخت ابي بلال في النوم أن أبا بلالٍ كلبٌ أهلبٌ اسودٌ عيناه تذر فان قالت

---

[٤٩١] أخرجه: الخطيب البغدادي انظر (صحيح الفقيه والمتفقه) رقم (٧٨٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٤٩٢] أخرجه: الترمذي (٣٠٠٠) وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(٢٣٩٨)حسن صحيح.

[٤٩٣] خرجه: ابن أبي شيبة (٣٠٧/١٥)، والطبراني (الكبير)(٨٠٤١)، وفي الصغير (١١٧/٢)، وابن ماجة (١٧٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(١٤٣)، و (المشكاة) (٣٥٥٤).

[٤٩٤] أخرجه: أحمد (٢٥٣/٥)، وعبد الرزاق (١٨٦٦٣)، والحميدي (٩٠٨)، والطبراني (الكبير)(٨٠٣٣ -٨٠٣٦)، وابن ماجة (١٧٦)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(١٤٦)، والمشكاة (٣٥٥٤).

[٤٩٥] أخرجه: الطبراني (الكبير)(٨٠٤٣).

فقلت: بابي أنت أبا بلال ماشأنك أراك هكذا؟ قال: جُعلنا بعدكم كلاب النار، وكان أبو بلال من رؤوس الخوارج))[٤٩٦]. **واتە: (خەواریجەکان زۆر جار بانگەشەیان بۆ دەکردم تا بچمە ڕیزیانەوە، منیش نزیك بوو بچمە ناو ئەو کۆمەڵ و تاقمەوە، تا خوشکەکەی (أبی البلال) خەوی بینی و لەخەویدا (أبی البلال) ی برای بووەتە سەگێکی ڕەشی قەترانی و فرمێسك بە هەر دوو چاویدا دێتە خوار وتی: من لە خەوەکەمدا پێم وت: باوکی بیلال باوکم بە قوربانت بێت ئەوە چی بووە بۆ وادەت بینم؟ ئەویش لە خەوەکیدا پێی وت: ئێمە لە دوای ئێوە (واتە: دوای دەرچوونمان لە دونیا) بووینە سەگەکانی ناو دۆزەخ. (أبی البلال)یش یەکێك بوو لە سەگەکانی تاقمی خەواریج). بۆیە کەعب ﷺ دەفەرموێت:** "لجهنم سبعةُ ابواب ثلاثة منها للحرورية"[٤٩٧] **واتە: (دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە و سێیان بۆ خەواریجە حەروریەکانە).**

**عومەری کوڕی عەبدول عەزیزیش** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** "سنَّ رسول الله و ولاة الأمر بعده سنناً، الأخذ بها تصديق لكتاب الله، واستكمال لطاعته وقوة على دين الله، ليس لأحد تغيرها ولاتبديُلها ولا النظر في رأي من خالفها، فمن اقتدى بما سنوا إهتدى، ومن استبصربها تبصر، ومن خالفها واتبع غير سبيل المؤمنين ولاه الله تعالى ماتولّى وأصلاهُ جهنم وسأت مصيراً"[٤٩٨]. **واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان پێشەواکانی موسوڵمانان لەدوای ئەوە ڕێ و شوێنیان بۆ دیاری کردووین، کارکردن پێیان بەڕاست خستنەوەی کتێبەکەی خوایە، و تەواو ملکەچ بوونە بۆ جێبەجێکردنی ئاینەکەی خوا. هیچ کەسێك بۆی نیە بیگۆڕێت یان ئاڵوگۆڕی کات یان تەماشای بۆچوونەکانی دژ بەو بکات. ئەو کەسەشی بیکاتە پێشەوای خۆی هیدایەت دراو دەبێت، وە ئەو کەسەش بیکاتە ڕووناکی خۆی ڕێگەی خۆی پێ دەدۆزێتەوە. بەڵام ئەو کەسەی بە پێچەوانەی ئەو کاربکات و شوێن ڕێگەیەکی تر بکەوێت جگە لە ڕێگەی بڕواداران ئەو کەسە خوای گەورە بەو ڕێگە چەوتەی خۆیدا دەیبات تا دەیگەیەنێتە ناو دۆزەخ و تووشی خراپترین چارەنووسی دەکات).**

---

[٤٩٦] أخرجه: عبدالله ابن أحمد (كتاب السنة)(١٥٠٩)وقال محققه إسناده صحيح.

[٤٩٧] أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (١٨٦٧٣).

[٤٩٨] أخرجه: الفسوي (٣/٣٨٦)، واللالكائي(١٣٤)، والخطيب البغدادي (صحيح الفقيه والمتفقه) (٢٧٣)وقال محققه: حسن لغيره وله طرق يتقوى به الحديث.

**٧- ئەوکەسەی وتەکەی پێچەوانەی کردەوەکەی بێت:**

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((يُجاء بالرجل يوم القيامة فيلقى في النار فتندلق أقتابهُ فيدوُرُ [بها] كما يدور الحمار برحاه فتجتمع أهل النار عليه فيقول: يافلان ماشأنك ؟ أليس كنت تأمر بالمعروف وتنهى عن المنكر قال: فيقول بلى قد كنت[أمركم ]بالمعروف ولاآتيه، وأنهاكم عن المنكر وآتيه))[٤٩٩]. واتە: (پیاوێك لەڕۆژی قیامەتدا دێنن وفڕێی دەدەنە ناو ئاگرەوە ڕیخۆڵەکانی ناوسکی دەڕژێت و دەخولێتەوە وەك چۆن گوێ درێژ بەدەوری ئاشدا دەخولێتەوە، ئەوانەی لەدۆزەخدان لێی کۆدەبنەوە و پێی دەڵێن: ئەی فلان کەس ئەوە چیتە؟ ئەوە تۆ نەبوویت فەرمانت دەکرد بەچاکەو ڕێ گریت دەکرد لەخراپە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، من بووم فەرمانم دەکرد بەچاکەو خۆم جێ بەجێم نەدەکرد وە ڕێگریم دەکرد لەخراپەو خۆم دەمکرد).

ئیمامی (الشعبی) (رحمه الله) دەفەرموێت: "يطلّع قومٌ من أهل الجنة إلى قومٍ في النار فيقول: ماأدخلكم النار ؟ وإنما دخلنا الجنة بفضل تأديبكم وتعليمكم ؟ قالوا: إنا كنا نأمر بالخيرولانفعلهُ"[٥٠٠]. واتە: (کەسانێکی خەڵکی بەهەشت تەماشای کەسانێکی خەڵکی دۆزەخ دەکەن و پێیان دەڵێن: ئێمە بە هۆی فێرکردن و پەروەردە کردنی ئێوە وە چووینە ناو بەهەشت ئێستا چی ئێوەی کردە ناو دۆزەخەوە ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە فەرمانمان بە چاکە دەکرد و خۆمان جێبەجێ مان نەدەکرد).

**٨- خۆکوشتن:**

ثابتی کوڕی ضەحاك ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من قتل نفسه بشيء عذبه الله بما قتل به نفسهُ يوم القيامة))[٥٠١]. واتە: (هەرکەسێك خۆی بەشتێك بکوژێت خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا سزای دەدات بەو شتەی کەخۆی پێ کوشتووە).

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((من قتل نفسه بحديدةٍ فحديدته في يده يَجأ بها في بطنه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً ومن تردّى من جبل فقتل نفسه فهو يتردّى في نار جهنم

---

[٤٩٩] أخرجه: البخاري (٣٢٦٧)، ومسلم (٢٩٨٩)، وأحمد (٢١٧٨٤).

[٥٠٠] أخرجه: ابن المبارك في (الزهد)برقم (٤٤) وقال محققه: سنده صحيح.

[٥٠١] أخرجه: الترمذي (٢٦٣٦)، وابن ماجة (٢٠٩٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢١٢٤).

خالداً مخلداً فيها أبداً))[٥٠٢] واتە: (هەر کەسێك خۆی بکوژێت بە ئاسنێك هەمان ئاسنی لە دەستدا دەبێت لە ئاگری دۆزەخدا و سکی خۆی پێ دەدرێت بەردەوام. وە هەر کەسێك خۆی لەچیایەکەوە بەر بداتەوە و خۆی بکوژێت لە ناو ئاگری دۆزەخدا لە چیایەکەوە بەر دەدرێتە خوارەوە بە بەردەوامی).

وەهەروەها مەسروق (رحمه الله) دەفەرموێت: "من اضطر إلى الميتة والدم ولحم الخنزير فلم يأكل ولم يشرب حتى يموت دخل النار"[٥٠٣]. واتە: (هەر کەسێك لە ناچاریدا پێویستی بە خواردنی مردارەوە بوو خوێن یان و گۆشتی بەراز بێت و نەیخوات تا دەمرێت ئەو کەسە دەچێتە دۆزەخەوە).

**٩- سوێند خواردنی درۆ بۆ زەوت کردنی ماڵی موسوڵمانان:**

حاریس کوڕی ئەبیل بەرصاء ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من أخذ شبراً من مال أمرىء مسلم بيمين فاجرةٍ فليتبوأ بيتاً من النار))[٥٠٤]. واتە: (هەر کەسێك بستێك زەوی لەماڵی موسوڵمانێك زەوت بکات بۆ خۆی بەسوێندی درۆ ئەو کەسە خانوویەکی بۆ خۆی مسۆگەر بکات لە دۆزەخدا). لەڕیوایەتێکی تردا ئەبو ئومامەی حارث ﷺ گێڕاوەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لايقتطع رجل حق إمرئٌ مسلم بيمينه الاّ حرم الله عليه الجنة وأوجب له النار))[٥٠٥]. واتە: (هەر کەسێك مافی موسوڵمانێك بەسوێندی درۆ بۆ خۆی زەوت بکات ئەو کەسە خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات و دۆزەخی بۆ مسۆگەر دەکات).

---

[٥٠١] أخرجه: أحمد (٣٤/٤)، وأبوداود (٣٢٥٧)، والترمذي (٢٠٤٤) واللفظ له، وابن ماجة (٣٤٦٠)، والنسائي (٦/٧)، والحميدي (٨٥٠)، والطبراني (الكبير)(١٣٢٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٦٦٥)، و(صحيح النسائي) (١٨٥٦)، وغاية المرام (٤٥٣).

[٥٠٣] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف)(١٩٥٣٦).

[٥٠٤] أخرجه : ابن حبان (٥١٦٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٥٠٥] أخرجه: أحمد (٢٤٤/٣)، وأبو داود (٣٢٤٦)، وابن ماجة (٢٣٢٦)) واللفظ له، والحاكم (٢٩٧/٤)وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٣٦٧) وقال محققه اسناده قوي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٨٨٤)، و(المشكاة)((٣٧٧٨).

**١٠-کوشتنی کەسێکی ڕێگە پێدراو لە ناو موسوڵمانانداا:**

ئەبو بەکر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من قتل معاهداً في غير كنهِهِ حرم الله عليه الجنة))[٥٠٦] واتە: (هەرکەسێك مرۆڤێکی ڕێگە پێدراو (معاهد) بەناهەق بکوژێت خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام کردووە). ووشەی (معاهد) واتە: (ئەو بێ باوەڕەی کە دەوڵەتی ئیسلامی ڕێگەی پێ دەدات تا بێتە ناو موسوڵمانانەوە).

**١١- کوشتنی نەفسێك بەناڕەوا:**

بەرائی کوڕی عازب ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((لزوال الدنيا أهون على الله من قتل مؤمنٍ بغير حقٍ))[٥٠٧]. واتە: (لە ناوچوونی دونیا ئاسانترە لای خوا لەکوشتنی باوەڕدارێك بەناڕەوا)، وە ئەبو بەکر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إذا إلتقى المسلمان بسيفيهما فالقاتل والمقتول في النار. . . ))[٥٠٨]. واتە: (گەر دوو موسوڵمان بەچەکەکانیان بەشەڕهاتن لەگەڵ یەك ئەوا بکوژو کوژراو لەناو ئاگردان)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((إذا المسلمان حمل أحدهما على صاحبه السلاح فهما على جُرف جهنم فاذا قتل أحدهما صاحبه دخلاها جميعاً))[٥٠٩]. واتە: (گەر دوو موسوڵمان یەکێکیان چەك هەڵگرێت لەوی تریان هەر دوو لە قەراغی دۆزەخدان، وە ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت هەردووکیان دەچنە دۆزەخەوە).

پێغەمبەرﷺ باسی کوشتاری کردووە لە ئاژاوەدا وە دەفەرموێت: ((. . . ليكن عبد الله المقتول ولايكن عبد الله القاتل، فإن الرجل يكون في فئة الإسلام فيأكل مال أخيه، ويسفك

---

[٥٠٦] أخرجه: ابن ماجة(٢٣٢٤)، والحاكم (٢٩٦/٤)وصححه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة (١٨٨٢).

[٥٠٧] أخرجه: أحمد (٣٦/٥)، وأبو داود (٢٧٦)، والنسائي (٢٤/٨)، وابن حبان (٧٣٤٠)، والحاكم (٢٤٤/١) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٩٨)، و(صحيح النسائي)((٤٤٢٣).

[٥٠٨] أخرجه: ابن ماجة (٢٦١٩)، والبيهقي (الشعب)(٥٣٤٥)، والأصفهاني (الترغيب) (٢٢٩٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢١٢١)، وغاية المرام (٤٣٩).

[٥٠٩] أخرجه: أحمد (٢٠٤٢٤)وقال محققه إسناده صحيح على شرطهما، ومسلم (٢٢١٤)، وابن ماجة (٣٩٦٥).

دمە، ویعصي ویکفر بخالقه وتجب له جهنم))[٥١٠]. واتـە: (گـەر ئـاژاوە ڕوویـدا لـە نـاو موسوڵمانانـدا. . . باموسوڵمان بەندەی کوژراو بێت نەك بەندەیەکی بکوژ بێت. چونکە پیاو هێشتا لە کۆمەڵی موسوڵمانان دەژمێردرێت بەڵام ئەگەر نا ئەوا لەدواییدا ماڵی براکەی بۆ خۆی زەوت دەکات و خوێنی دەڕێژێت وسەرپێچی دەکات و بێباوەڕ دەبێت بەخوای گەورە و دۆزەخی بۆ مسۆگەر دەبێت).

وە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((یخرج عنق من النار یوم القیامة لها عینان تبصران، واذنان تسمعان، ولسان ینطق: یقول إني وُکِّلتُ بثلاثة...وبمن قتل نفساً بغیر نفس، فینطوي علیهم فیقذفهم في غمرات جهنم))[٥١١]. واتە: (ملێك لەئاگر لە ڕۆژی کۆتایی دا دێتەدەر دوو چاوی هەیە پێی دەبینێت و دوو گوێی هەیە پێی دەبیستێت و زمانێکی هەیـە قسـەی پێدەکات، دەڵێت: داوام لێکراوە سێ کۆمەڵ لەگەڵ خۆم ببەمە دۆزەخ. . . لەوانـە: ئـەو کەسـەی کـە یـەکێکی کوشـتووە بەناهـەق. . . لەپاشانـدا هـەر سێ کۆمەڵە کە کۆدەکاتەوە و فڕێ یان دەداتە ناو دۆزەخەوە).

لـە ڕیوایـەتێکی تـردا جونـدبی کـوڕی عەبـدوڵا ﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: ((من استطاع منکم أن لایحول بینه وبین الجنة مِلء کفٍّ من دم امريءٍ مسلمٍ أن یهریقـه کأنما یـذبح بـه دجاجـة، کلّمـا تعَرّضَ لبـاب مـن ابـواب الجنـة، حـال الله بینـهُ وبینه))[٥١٢]. واتـە: (هـەر کەسـێك لـە ئێوە گـەر دەیـەوێت دوور نەخرێتـەوە لـە بەهەشت باخۆی پارێزێت لە ڕشتنی مشتێك خوێنی موسوڵمان بە ناهەق وەك مریشکێك سەر بڕێت هەرکات دەچێتە بەردەمی یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت خوای گەورە دووری دەخاتـەوە و نایەڵێت بچێتە ژوورەوە).

**١٢- درۆ هەڵبەستن بە ناوی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ:**

موغـەیرەی کـوڕی شـعب ﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((ان کذباً عليَّ لیس ککَذِبٍ علی أحد فمن کذَّب علي متعمداً فلیتبوأ مقعده من النار))[٥١٣]. واتـە:

---

[٥١٠] أخرجه: ابن أبي شیبة (٣٧٤١٩)، وأبو یعلی (١٥٢٣)وحسن إسناده الحافظ في (المطالب) (٤٣٤٥)، والبوصیري في (اتحاف الخیرة المهرة)(٩٧٩٩).

[٥١١] أخرجه: أحمد (٤٠/٣)، وأبویعلی (٣٤١/١) رقم (١١٣٨)، وصححه الشیخ الألباني في (السلسلة الصحیحة) (٢٦٩٩).

[٥١٢] أخرجه: الطبراني(الکبیر)(١٦٦٢)، والبیهقي (الشعب)(٥٣٥٠)، وصححه الشیخ الألباني (الصحیحه) (٣٣٧٩).

[٥١٣] أخرجه: البخاري (١٢٩١)، ومسلم (٤).

(درۆیەك بەناوی منەوە وەك درۆیەك نیە بەناوی هەر یەكێك لە ئێوەوە، هەركەسێك درۆ یەك بەئەنقەست بە ناوی منەوە بڵاوبكاتەوە با جێگەیەك لە دۆزەخدا بۆ خۆی مسۆگەر بكات).

**١٣- دادوەر و فەرمانڕەوا ستەمكارەكان:**

بورەیدە‌ رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((القضاة ثلاثة: واحد في الجنة واثنان في النار فأما الذي في الجنة، فرجل عرف الحق فقضى به، ورجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار، ورجلٌ قضى للناس على جهلٍ فهو في النار))[٥١٤]. واتە: (دادوەر و فەرمانڕەواكان سێ كەسن: یەكێكیان لەبەهەشتدایە و دووانیان لە دۆزەخدایە ئەوەیان كە لەبەهەشتدایە پیاوێكە: حەقی ناسیوە و حوكمی پێ كردووە، دووەمیان: پیاوێكە حەقی ناسیوە و ناڕەوایی تیاكردووە ئەوە لەدۆزەخدایە، وە سێهەمیان: پیاوێكە دادوەری بۆ خەڵك كردووە بەنەزانی و نەفامی ئەویش لە دۆزەخدایە).

**١٤- وێنەگر و وێنەكێشەكان:**

ئیبنو عەباس رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((كل مصور في النار، يجعل له بكل صورة صوّرها نفساً يعذب به جهنم))[٥١٥]. واتە: (هەموو وێنە كێشێك لە دۆزەخدایە هەموو وێنەیەكی بۆ دەكرێت بەنەفسێك و سزای پێدەدرێت لە دۆزەخدا).

وە لەفەرموودەیەكی تردا ئەبو سەعیدی خدری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يخرج عنقٌ من النار يوم القيامة لها عينان تبصران وأذنان تسمعان ولسان ينطق، يقول: اني وكلتُ بثلاثة. . . وبالمصورين))[٥١٦]. واتە: (ملێك لەناو ئاگری دۆزەخ دێتە دەر لەڕۆژی قیامەتدا دووچاوی هەیە پێی دەبینێت و دووگوێی هەیە پێی دەبیستێت وە زمانێكی هەیە قسەی پێدەكات و دەڵێت: داوام لێ كراوە سێ كۆمەڵ لەگەڵ خۆم ببەمە دۆزەخ. . . لەوانە. . . وەهەموو وێنەگر و وێنەكێشێك).

---

[٥١٤] أخرجه: أبوداود (٣٥٧٣)، والترمذي (١٨٣)، وابن ماجة(٢٣١٥)، والحاكم (٤/٩٠)صححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٠٥١)و(صحيح ابن ماجة)(١٨٧٣)(صحيح الترمذي) (١٥٤) والارواء (٢٦١٤) و (المشكاة)(٣٧٣٥).

[٥١٥] أخرجه: أحمد (٢٨١٠)، البخاري (٢٢٢٥)، ومسلم (٢١١١).

[٥١٦] أخرجه: أحمد (٣٣٦)، وابن أبي شيبة (٣١٣٠)، والترمذي (٢٥٧٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(٢٠٨٣)و(السلسلة الصحيحة)(٥١٢).

**١٥- سیحرو سووخواردن وخواردنیماڵی هەتیوو، و ڕاکردن لەبەرەی جەنگدا وە تۆمەت بارکردنی ئافرتێکی داوێن پاکی بێ ئاگا:**

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اجتنبوا السبع الموبقات الشرك بالله، وقتل النفس التي حرم الله الاّ بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات))[٥١٧]. واتە: (دوور بکەونەوە لەحەوت لەناو بەرەکە هاوبەش بۆ خوادانان و کوشتنی نەفسێك کە خوا حەرامی کردووە تەنها بەحەق نەبێت، وە سوو خواردن و خواردنی ماڵی هەتیوو، وە ڕاکردن لەکاتی جەنگدا وە تۆمەت بارکردنی ئافرەتە داوێن پاکە بێ ئاگاکان).

**١٦- پێشێل کردنی سەروەری حەرەمی شاری مەککە و مەدینە:**

عەبدوڵای کوڕی جەحش ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من قطع سدرةً صوّب الله رأسه في النار))[٥١٨]. واتە: (هەر کەسێك دار سیدرێك ببڕێت خوای گەورە بەسەردا دەیخاتە ناو دۆزەخەوە).

**١٧- ئازاردانی دایك و باوك و ئافرەتێك لاسایی پیاو بکاتەوە و ناڕەق خۆرێکی بەردەوام وئەوانەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن وە ئەوانەی سیحرباز بەڕاست دەزانن و باوەڕیان پێیان هەیە و پێشەوا درۆزنەکان و هەژارە خۆبەزل زانەکان:**

ئیبنو عومەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثة لايدخلون الجنة: العاق لوالدية، والديوث، والرجلة من النساء))[٥١٩]. واتە: (سێ کۆمەڵ هەن ناچنە بەهەشت (واتە لەسەرەتادا) ئەو کەسەی ئازاری دایك و باوکی دەدات وە ئەوکەسەی کەلەماڵ و مناڵەکەی ناپرسێتەوە و ڕێگری لەداوێن پیسی ناکات و لێ بێدەنگە وە ئەو ئافرەتانەی لاسایی پیاوان دەکەنەوە).

---

[٥١٧] أخرجه: البخاري (٢٧٦٦)، ومسلم (١٤٥).

[٥١٨] أخرجـه: أبـو داود (٥٢٣٩)، وصـححه الشـيخ الألبـاني في (صـحيح أبي داود)(٤٣٦٤) وفي (صـحيح الجـامع (٦٣٥٢).

[٥١٩] اخرجـه: النسـائي (الكـبرى)(٢٣٤٣)، والبـزار(الكشـف)(١٨٧٥)، والحـاكم (٧٢/١)وصـححه ووافقـه الـذهبي، وصـححه الشـيخ الألبـاني في (صـحيح الجـامع) (٣٠٦٣)، (حجـاب المـراة المسـلمة)(ص: ٦٧)و(السلسـلة الصحيحة)(١٣٩٧).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ثلاثٌ قد حرَّم الله عليهم الجنة: مدمن الخمر، والعاق، والديوث الذي يقرّ في أهله الخبث))[٥٢٠]. واتە: (سێ کۆمەڵ هەن خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام کردوون، مەیی خۆرێکی بەردەوام، ئازاردەری دایك و باوك، وە (الديوث) واتە ئەو کەسەی بێدەنگە لە داوێن پیسی خێزانەکەی).

عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ثلاث لايدخلون الجنة أبداً: الديوث، والرجلة من النساء، و مدمن الخمر))[٥٢١]. واتە: (سێ کۆمەڵ هەن هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە ئەو کەسەی بێدەنگە لە داوێن پیسی خێزانەکەی وە ئەو ئافرەتەی لاسایی پیاو دەکاتەوە، وە ئەو کەسەی مەی خورێکی بەردەوامە).

وە ئەبو موسای ئەشعەری رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ثلاثة لايدخل الجنة: مدمن الخمر، وقاطع الرحم، ومصدّقٌ بالسحر))[٥٢٢] واتە: (سێ کۆمەڵ هەن ناچنە بەهەشت: مەی خۆرێکی بەردەوام وە ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت وە ئەو کەسەی سیحر و جادو بەڕاست دەزانێت (واتە: باوەڕی پێی هەیە)).

وەجوبەیری کوڕی موطعیم رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لايدخل الجنة قاطع)) [٥٢٣]. واتە: (ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت ناچێتە بەهەشتەوە).

سەلمانی فارسی رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثة لايدخلون الجنة: الشيخ الزاني، والإمام الكذّاب، والعائل المزّهو))[٥٢٤]. واتە: (سێ کۆمەڵ هەن ناچنە ناو بەهەشت: پیاوێکی پیری زیناکار، وە سەرکردەیەکی درۆزن، وەهەژارێکی خۆبەزل زان).

---

[٥٢٠] أخرجه: أحمد (٦٩/٢)وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٠٥٢).

[٥٢١] أخرجه: البيهقي (الشعب) (١٠٨٠٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٠٦٢).

[٥٢٢] أخرجه: أحمد (١١١٠٧)وقال محققه: حديث حسن لغيره (٣٩٩/٤)؛ و أبويعلى (٧٢٤٨)، وابن حبان (٥٣٤٦) وقال محققه له شاهد عند أحمد (١٤/٣)لعله يتقوى به ويُحسن، والحاكم (١٤٦/٤)، وحسنه لشواهده محققوا (الترغيب والترهيب) المنذري (٣٤٧٧)، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة)(٦٧٨).

[٥٢٣] أخرجه: أحمد (٤م٨٠)، والبخاري (٥٩٨٤)، ومسلم (٢٥٥٦)، وأبوداود (١٦٩٦)، والترمذي (١٩٠٩)، والبيهقي (٢٧/٧)، وابن حبان (٤٥٤)، الحميدي (٥٥٧)، والطبراني (الكبير) (١٥٠٩).

[٥٢٤] أخرجه: البزار (١٨٥٩) وقال الهيثمي (المجمع) (٢٥٥/٦)، رواه البزار ورجاله رجال الصحيح غير عباس بن أبي طالب وهو ثقة، وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) رقم (٣٥٣٤)إسناده جيّد، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٢٣٩٨).

**١٨- ئەو کەسانەی کە ناوبانگێکی خراپیان بۆخۆیان مسۆگەر کردووە:**

**ئیبنو عەباس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((وأهل النار من ملاء أذنيه من ثناء الناس شرّاً وهو يسمع))[٥٢٥]. **واتە: (دۆزەخی ئەو کەسەیە پڕ بە هەر دوو گوێی خراپەی خۆی لە زاری خەڵکی دەبیستێتەوە). لێرەشدا پێویستە بزانین کە باسی شایەتی بڕوادار و چاکەکاران وەردەگیرێت نەك شایەتی خراپە کارو بێ بڕوایان وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((المؤمنون شهداء الله في الأرض)) **واتە: (بڕواداران شایەت دەرانی خوای گەورەن لە زەویدا).**

**لەڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((. . . من اثنيتم عليه خيراً وجبت له الجنة ومن أثنيتم عليه شرّاً وجَبَتْ له النار [ الملائكة شهداء الله في السماء ] وأنتم شهداء الله في الأرض [وفي رواية] المؤمنون شهداء الله في الأرض))[٥٢٦]. **واتە: (ئەوەی ئێوە باس وستایشی چاکەی بکەن بەهەشتی بۆ مسۆگەرە وە ئەوەی ئێوە باسی بکەن بەخراپە دۆزەخی بۆ مسۆگەرە، فریشتەکان شایەتی دەرانی خوان لە ئاسماندا و ئێوەش شایەتی دەرانی خوان لەسەر زەویدا). لەڕیوایەتێکی تردا: (بڕوادارن شایەتی دەرانی خوان لەسەر زەویدا).**

**وە لە فەرموودەکەی ئەبو زوهێری سەقەفیدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((يوشكُ أن تعرفوا أهل الجنة من أهل النّار)) قالوا: بم ذاك ؟ يارسول الله: قال ((بالثناء

---

[٥٢٥] أخرجه: ابن ماجة (٤٢٢٤)، والطبراني (الكبير) (١٢٧٨٧)، وأبو نعيم (الحلية) (٣/٨٠)، والبيهقي (الشعب) (٧٠١٨)، وصححه الشيخ الألباني (صحيح ابن ماجة) (٣٤٠٣)، و(السلسلةالصحيحة) (١٧٤٠)و(صحيح الجامع) (٢٥٢٧).

[٥٢٦] أخرجه: البخاري (١٣٦٧)، ومسلم (٩٤٩)، والنسائي (٢٧٣/١)، والترمذي (١٠٥٨)، وابن ماجة (١٤٩٢)، والحاكم (٣٧٧/١)، والطيالسي(٢٠٦٢)، وأحمد (٣م١٩٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي (١٨٢٤)و (صحيح ابن ماجة) (١٢١٢)و(السلسلة الصحيحة) (٢٦٠٠)، وانظرهُ بتوسع في (أحكام الجنائز) (ص: ٦٠).

الحسن والثناء السيء، أنتم شهداء الله بعضكم على بعضٍ))[٥٢٧]. واتە: (نزیکە هەر لە دونیادا بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان بناسنەوە، وتیان: بەچی دەناسرێنەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی: بەباس و ستایش کردن بەچاکە و باس کردن بەخراپە ئێوە لە ناو خۆتاندا شایەتی دەرانی خوان هەندێکتان بەسەر هەندێکتانەوە).

**١٩- پاسەوانە ستەم کارەکان و ئافرەتە رووتە ناپۆشتەکان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((صنفان من أهل النار لم أرهما: قوم معهم سياطٌ كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلاتُ رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة لايدخلن الجنة و لايجدن ريحها وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا))[٥٢٨]. واتە: (دوو پۆلی دۆزەخی هەن لە ئومەتەکەم هێشتا نەم بینیون یەکەمیان: کەسانێکن قامچیان پێ یە وەك کلکی مانگاکان لە خەڵکی پێ دەدەن. وە دوومیان: ئافرەتانێکن پۆشتەن بەڵام روتن (واتە: پۆشاکەکانیان تەسك و کورت و تەنکن) وەلادەر و دەرچوون لەئاینی خوا و بۆنەتە سەرمەشق بۆ ئافرەتانی تر و قژەسەریا دەبەستن وەك سەرپشت وشترە خوارەکان (واتە: سەرنجی پیاوانی پێ ڕادەکێشن)، ئەوانە ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناکەن، کە بۆنەکەی ئەوەندە و ئەوەندە ڕێ یە دەڕوات).

**٢٠- خۆبەزل زانی دەمارگیر و کەسانی ڕەزیل و چروك:**

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إن أهل النار كلُّ جعظريّ جّواظٍ [أي: هو الفظ الغليظ الجاف] مستكبر جّماع منّاع [ذي

---

[٥٢٧] أخرجه: أحمد (٦/٤٦٦)، وابن ماجة(٤٢٢١)، والطبراني (الكبير) (٢٠/١٤٧)، والحاكم (١/١٢٠)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٣٨٤) وقال محققه: رجال ثقات، وقال: الحافظ في (الأصابة) (٤/٧٧) رواه الحاكم بسند صحيح و راوه الدار القطني بسند حسن غريب، وقال البوصيري في (مصباح الزجاجة) (٣/٣٠١): اسناده صحيح، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(٣٤٠٠)، و(الطحاوية) (٤٨٩)، وحسنَ اسناده أيضاً الشيخ شعيب الأرؤوط في (شرح العقيدة الطحاوية) (٢/٥٣٨)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٣٨٣) رواه البزار وهو حديث صحيح.

[٥٢٨] أخرجه: أحمد (٢/٣٥٥)، ومسلم (٧١٢٣، ٢١٢٨)واللفظ له، والبغوي (٢٥٧٨)، والبيهقي (الكبرى)(٢/٢٣٤)، وابن حبان (٧٤٦١)وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم.

تبعٍ]...))[٥٢٩]. واتە: (خەڵکی دۆزەخ هەموو کەسێکی وشك و کەلەڕەق و خۆبەزل زان و پارە کۆکەرەوە و چرووکی شوێن کەوتووە).

لەڕیوایەتێکی تردا لە حارثی کوری وەهبەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ألا أخبركم بأهل النار ؟ كل عُتلّ جواظٍ مستكبر))[٥٣٠]. واتە: (ئایا پێتان ڕاگەیەنم کە دۆزەخیەکان کێن؟ هەموو کەسێکی توند و وشك و خۆبەزل زانە).

**٢١- دوو زمانی:**

خوزەیفە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لايدخل الجنة نمّام))[٥٣١]. واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی کە دووزمانی دەکات ) واتە: (وقسە دەهێنێت و دەبات).

**٢٢- ڕق لێ بوون لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ:**

ئەبو سەعیدی خدری ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((والذي نفسي بيده لايبغضنا أهل البيت رجلا الاّ أدخلهُ الله النار))[٥٣٢]. واتە: (سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە، هەرکەسێك ڕقی لە بنەماڵە و ئال و بەیتی ئێمە بێت ئیلا خوای گەورە ئەو کەسە دەیخاتە دۆزەخەوە).

**٢٣- شین و واوەیلاکردنی ئافرەتان:**

ئەبو مالیك ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . والنائحة إذا لم تتب قبل موتها يُقام يوم القيامة في سربال من قطران ودرع من جرب))[٥٣٣]. واتە: (ئەو ئافرەتەی شین و شەپۆڕ دەکات و خەڵکان دەکاتە گریان لەماتەمدا گەر تۆبە نەکات پێش

---

[٥٢٩] أخرجه: أحمد (١١٤/٢)، والطبراني (الكبير)(٦٥٨٩)، والحاكم (١١٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وحسن اسناده من طريق الطبراني الحافظان: المنذري (الترغيب) (٤٢٨٣)والحافظ الهيثمي في (المجمع) (٢٦٥/١٠)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(١٧٤١)و(صحيح الجامع)(٢٥٩٤).

[٥٣٠] أخرجه: البخاري (٤٩١٨)، ومسلم (٢٨٥٣).

[٥٣١] أخرجه: أحمد (٣٨٢/٥)، والبخاري (٦٠٦٥)، ومسلم (١٠٥)، وأبو داود (٤٨٧١)، والترمذي (٢٠٢٦)، والحميدي (٤٤٣)، وابن حبان (٥٧٦٥).

[٥٣٢] أخرجه: الحاكم (١٥٠/٣)، وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (٣٣٤٨)، وابن حبان (٦٩٨٧)وقال محققه: اسناده حسن.

[٥٣٣] أخرجه: مسلم (٩٣٤)، وابن حبان (٣١٤٣).

مردنی لەڕۆژی کۆتاییدا ڕادەوەستێنرێت ئاوەڵ کراسێکی قیری سوتاو وکراسێکی ئالۆشاوی بەبەردا دەکرێت).

**٢٤- ئازاردانی دراوسێ:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((قیل للنبي ﷺ: یارسول الله إنَّ فلانة تقوم اللیل وتصوم النهار وتفعل وتتصدق وتؤذي جیرانها بلسانها، فقال رسول الله ﷺ: ((لاخیر فیها هي من أهل النار))[٥٣٤]. واتە: (وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فلانە ئافرەت شەو نوێژ دەکات وە بەڕۆژ بە ڕۆژوە و چاکە و خێر دەکات بەڵام دراوسێکانی ئازار دەدات بەزمانی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە هیچ چاکەیەکی نیە ئەوە یەکێکە لە دۆزەخیەکان).

**٢٥- قسەی پوچ و ناشرین و قێزەون:**

ئەبو ئومامە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . والفحش والبذاءُ من الشیطان وهما یُقربان إلى النار ویباعدان من الجنة))[٥٣٥]. واتە: (قسەی قێزەون و ناشرین لەشەیتانەوەیە و هەردووکیان خاوەنەکەی دوور دەکاتەوە لەبەهەشت و نزیکی دەکاتەوە لە دۆزەخ)، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((. . . والبذاء من الجفاء والجفاء من النار))[٥٣٦]. واتە: (قسەی پوچ و قێزەون لە وشکێتی یەوەیە وشکێتیش لە دۆزەخ)ەوەیە.

**٢٦- توش نەبوون بەنەخۆشی و دەردو بەلا:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ((دخل أعرابي على النبي ﷺ فقال رسول الله ﷺ ((أخذتك أم ملدم)) ؟ قال وما أم ملدم ؟ قال: ((حرٌّ یکون بین الجلد واللحم)) قال: ما وجدتُ هذا قط قال ((فهل وجدت هذا الصداع)) ؟ قال ومالصداع ؟ قال ((عرق یضرب على إنسان في رأسه)) وفي روایة [ریحٌ تعترضُ الرأس تضرب العروق] قال: ما وجدت هذا

---

[٥٣٤] أخرجه: البخاري (الأدب المفرد)(١١٩)، وأحمد (٢/٤٤٠)، وابن حبان (٥٧٦٤) وقال محققه اسناده صحیح، وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الأدب المفرد) (٨٨)و(السلسلة الصحیحة)(١٩٠).

[٥٣٥] أخرجه: أحمد (٥/٢٦٩)، وابن أبي شیبة (الإیمان)(١١٨)، والترمذي(٢٠٩٦)، والطبراني (الکبیر)(٧٤٨١)، وصححه الشیخ الألباني في (کتاب الإیمان)رقم (١١٨).

[٥٣٦] أخرجه: ابن ماجة (٤١٤٨) وصححه الشیخ الألباني في (السلسلة الصحیحة)(٤٩٥)و(صحیح ابن ماجة (٣٣٧٣).

قط، فلما ولّى قال النبيُّ ﷺ: ((من أحب أن ينظر إلى رجلٍ من أهل النار فلينظر إلى هذا))[٥٣٧]. واتە: (کابرایەکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەرﷺ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا لەرزو تات توش بووە؟ ئەویش وتی: لەرزو تا چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گەرمیەکە لەنێوان گۆشت و پێست دایە، وتی: نەخێر توشم نەبووە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: سەریەشەت توش بووە؟ ئەویش وتی: سەریەشە چیە؟ فەرمووی: دەمارێکە لەسەری مرۆڤ دا لێدەدات، و نارەحەتی دەکات ئەویش وتی: ئەویشم توش نەبووە هەرگیز. کاتێ کەکابرا رۆیشت پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك پێی خۆشە تەماشای پیاوێك لە دۆزەخیەکان بکات با تەماشای ئەو کابرایە بکات).

### ٢٧- زیندەبەچاڵ کارو زیندەبەچاڵ کراو:

سەلەمەی کوری یەزید ﷺ دەگێرێتەوە کە ﷺ دەفەرموێت: ((. . الوائدة والموؤدة في النار الاّ أن تدرك الوائدة الأسلام فيعفوا الله عنها))[٥٣٨]. واتە: (زیندەبەچاڵکار و زیندەبەچاڵکراو (واتە: لەسەردەمی نەفامیدا) هەر دوو لە دۆزەخدان مەگەر زیندە بەچاڵ کار بە ئیسلام گەیشتبێت و موسوڵمان بوو بێت و خوای گەورەش ئەوی بەخشی بێت).

### ٢٨- هەرکەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کەسێکی تر باوکیەتی:

سەعدی کوری وەقاص ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من أدعى أباً في الإسلام غير أبيه وهو يعلم انه غير أبيه فالجنة عليه حرّام))[٥٣٩]. واتە: (هەرکەسێك لە ئیسلام بوونی دا بانگەشەی ئەوە بکات کەسێکی تر باوکیەتی جگە لە باوکی ڕاستەقینەی وەخۆشی باش دەزانێت کە ئەوە باوکی نی یە ئەو کەسە بەهەشتی لەسەر حرام کراوە).

---

[٥٣٧] أخرجه: أحمد (٢/٣٣٢)، والبخاري (الأدب المفرد)(٤٩٥)، وابن حبان (٢٩١٦)وقال محققه اسناده حسن، والحاكم (١/٣٤٧)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي (المجمع) (٢/٢٩٤) رواه أحمد واسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٣٨١).

[٥٣٨] أخرجه: أحمد (٣/٤٧٨)، وأبوداود (٤٧١٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(٣٩٤٨)، والمشكاة (١١٢).

[٥٣٩] أخرجه: البخاري (٦٧٦٦)، ومسلم (٦٣) وأحمد (١٤٥٤) وقال محققه الأرناؤوط: اسناده صحيح على شرطهما، وابن حبان (٤١٦).

لەڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو زەڕەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . من ادعى قوماً ليس هو منهم فليتبوأ مقعده من النار. . . ))[٥٤٠] واتە: (هەرکەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە خزمی کەسانێکە و لەڕاستیدا خزمیشیان نەبێت، ئەو کەسە باجێی خۆی مسۆگەر بکات لە دۆزەخدا).

**٢٩- نرخ بەرزکردنەوەی کالا و شتومەك لەسەر موسوڵمانان:**

مەعقل کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە کە ﷺ دەفەرموێت: ((من دخل في شيء في رواية [في سعرٍ] من أسعار المسلمين لِيُغلِيهُ عليهم فإن حقاً على الله ان يقعدهُ بعظمٍ من النار يوم القيامة ، وفي رواية [ ان يُعذّبه في عظم جهنم ] وفي رواية [ ان يقذفه في معظمٍ من النار]))[٥٤١]. واتە: (هەر کەسێك ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی نرخی شتومەك بەسەر موسوڵمانانەوە بۆ ئەوەی گرانی بکات ئەو کەسە خوا بە پێویستی داناوە لەسەر خۆی کە بیکاتە پارچە ئاگرێکی گەورەوە سزای بدات لە ڕۆژی لە قیامەتدا).

**٣٠- یارمەتی دانی ستەمکاران:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾ (هود: ١١٣) واتە: (پشتیوانی و مەیلتان بۆ ستەمکاران نەبێت وەخۆشتان نەوێن چونکە ئاگر ئێوەش دەگرێتەوە. . . . . . ).

لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . سيكون بعدي امراءُ، فمن دخل عليهم فصدَّقهم بكذبهم وأعانهم على ظلمهم فليس مني ولستُ منه وليس بواردٍ عليَّ الحوضَ. . . ))[٥٤٢]. واتە: (لە دوای من کاربەدەستانێکتان دەبێت، هەر کەسێك بچێتە لایان و درۆکانیان بەڕاست بزانێت و پشتیوانی ستەمەکانیان بکات ئەو کەسە لە من نیە ومنیش لەو کەسەنیم وە نایەتەلام بۆ سەر حەوزی کەوسەر).

---

[٥٤٠] أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٤٣٣) وصححه اليشخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد)(٣٣٦).

[٥٤١] أخرجه: أحمد (٥/٢٧) (٢٠٣١٣) وقال محققه: اسناد جيد، و الحاكم (٢/١٢)، و الطبراني (الكبير) (٢٠/(٤٧٩-٤٨٠) ، وقال الشيخ مقبل (الصحيح المسند)(١١٤٨) حديث صحيح.

[٥٤٢] أخرجه: النسائي (٧/١٦٠) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٣٩٢٣-٣٩٢٤).

عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: "الجلاوزةُ [أي: اعوان الظلمة ] والشرطُ كلابُ النار يوم القيامة"(٥٤٣). واتە: (پیشتوان و جەلادەکان و پاسەوانەکانی ستەمکارەکان هەموو سەگی ناو دۆزەخن لە ڕۆژی کۆتاییدا).

سەعیدی کوڕی ئەلموسەیب (رحمه الله) دەفەرموێت: " لاتملأوا اعينكم من اعوان الظلمة الاّ بالأنكارٍ من قلوبكم لئلا تُحبط اعمالكم الصالحةُ "(٥٤٤). واتە: (بەچاوەکانتان تێر تەماشای پشتیوانی ستەمکارەکان مەکەن و بەدڵ بیان بوغزێنن نەوەك کارەچاکەکانتان پووچ بکەنەوە).

مەکحولی دیمەشقی (رحمه الله) دەفەرموێت: " ينادي منادٍ يوم القيامة: اينَ الظلمة واعوانهم؟ فما يبقى أحدٌ مدَّ لهم يداً أو حَبَّرَ لهم دواةً [أي: مَلءُ ورقةً لمساندتهم] أو برى لهم قلماً [أي: سهّل لهم قلماً أو أعطاهُ لهم] فما فوق ذلك الاّ حضر معهم فيُجمعُونَ في تابوتٍ من نارٍ فيُلقَون في جهنم "(٥٤٥). واتە: (لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێت: لە کوێن ستەمکارەکان و پشتیوانەکانیان، ئەوجا هەر کەسێك دەستێکی بۆ درێژ کردبن یان پێویستێکی بۆ ئامادە کردبن یاخود کاغەزێکی پشتیوانی بۆ پڕکردبنەوە یاخود پێنوسێکی پێ بەخشی بن یاخود شتانێکی سەرو ئەوەی بۆ کردبن، ئەو کەسە دەبرێتە ناو ستەمکارەکانەوە و دەکرێنە ناو تابوتێکی ئاگرینەوە و پاشان فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە).

جارێکیان بەرگ دوورێك هاتە خزمەت سوفیانی سەوری و پێی وت: "أنا رجلٌ خياطٌ اخيط الألبسة للأمير وأعوانه، فهل اكون من معاونيهم ؟ فقال له سفيان: " بل انت من الظلمة انفسهم، ومعاونهم من يبيعك الخيط والأبرة " وقال: " لستُ اخاف ضربهم، ولكن اخاف ان يميلوا عليَّ بدنياهم ثم لا أرى سيئتهم سيئة "(٥٤٦). واتە: (من پیاوێکی بەرگ دوورم جل وبەرگی ئەمیرو کار بەدەستانی دەدرووم ئایا من بە پشتیوانی ئەوان دەژمێردرێم؟ سوفیان پێی فەرموو: تۆ خۆت لە ڕیزی ستەمکارەکانی، پشتیوانەکانیان ئەو کەسەیە کە دەرزی و دەزووەکەت پێ دەفرۆشێت. دواتر سوفیان فەرمووی: : (من لە لێدانیان

---

(٥٤٣) أنظر: كتاب (الكبائر) (١١٢)، و(روضة النعيم) (٤٢٠٦/٩).

(٥٤٤) نفس المصدر.

(٥٤٥) نفس المصدر.

(٥٤٦) أنظر: (حلية الأولياء) لأبي نعيم (٤٢/٧).

ناترسم بەڵکو لەوە دەترسم لە پارەو دونیاکەیان بدەنە من و پاشان خاپەکانیان بە خراپە نەزانم).

**٣١- ئافرەتە تاوانبارەکان:**

عمرانی کوڕی موحسین ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((أطلعت في النار فرايت أكثر أهلها النساء. . . ))[٥٤٧]. قالوا: لم يارسول الله ؟ قال ((بكفرهنَّ))، قيل يكفرن بالله؟ قال ((يكفرن العشير ويكفرن الأحسان[٥٤٨]لو أحسنت إلى إحداهنَّ الدَّهرَ، ثم رأت منك شيئاً، قالت مارأيت منك خيراً قط))[٥٤٩]. واتە: (تەماشای دۆزەخم کرد بینیم زۆرینەی نیشتەجێکانی ئافرەت بوون). وتیان: بۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: لەبەر بێ دینییان (واتە: پێ نەزانینەکەیان)، وتیان کوفرکردنیان بەخوا؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو کافرو پێ نەزانن بەدەرهەق بە هەڵسوکەوت و چاکەی مێردەکانیان گەر ماوەی تەمەنێك لەگەڵ یەکێکیاندا چاکە بکەیت و پاشان شتێکت لێ ببینێت دەڵێت: هەرگیز چاکەم لێ نەدیویت).

وە لە عەمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ دەفەرموێت: ((حدثني عمتي قالت: أتيت رسول الله ﷺ في بعض الحاجة، فقال: ((أي هذه: أذات بعلٍ))؟قالت: نعم، قال: ((كيف أنت له ؟)) قالت: ماآلوه [أي: لاأُقصّر في طاعته ] الاّ ماعجزتُ عنه قال: ((فانظري أين انت منه فأنما هو جنتُك ونارُك))[٥٥٠]. واتە: (پورم بۆی گێڕامەوە، وتی: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەندێ کاری پێویست، و فەرمووی: ئایا تۆ مێردت هەیە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: تۆچۆنی بۆ مێردەکەت؟ منیش وتم: تا لە توانامدا بێت کاری بۆجێ بەجێ دەکەم و گوێڕایەڵ دەکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەماشاکە تۆ چۆنی لەگەڵیدا چونکە مێردەکەت بەهەشت و دۆزەخی تۆیە).

---

[٥٤٧] أخرجه: أحمد (٤٢٩/٤)، والبخاري (٥١٩٨)، والترمذي (٢٦٠٢)، والطبراني (الكبير)(٢٧٨/١٨)، وابن حبان (٧٤٥٥).

[٥٤٨] أخرجه: النسائي (١٨٧/٣).

[٥٤٩] أخرجه: البخاري (٥١٩٧).

[٥٥٠] أخرجه: ابن أبي شيبة (٤٧/٧)، وأحمد (٣٤١/٤)، والنسائي (الكبرى) (٨٩٦٢)، والطبراني (الأوسط) (١٧٠/١)، و الحاكم (١٨٩/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وصحيح اسناده الشيخ الألباني في (آداب الزفاف) (١٧٩).

وە لەڕیوایەتێکی عبدالرحمن ی کوڕی شبل داﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((انَّ الفساق هم أهل النار)) قيل: يارسول الله ومن الفُسّاق ؟ قال ((النساء)) قال رجلٌ: يارسول الله أليس أمهاتنا وأخواتنا وأزواجنا ؟ قال ((بلى ولكنهنَّ إذا أُعطين لم يشكُرْن وإذا أُبتلينَ لم يَصبِرنَ))[٥٥١]. واتە: (تاوانکارەکان ئەهلی دۆزەخن، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانکاران کێن؟ فەرمووی: ئافرەتانن، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوان دایك و خوشك و خێزانەکانمان نین؟ فەرمووی: بەڵی بەڵام ئەوان گەر نیعمەتیان پێ بدرێت سوپاس گوزار نابن وە گەر تاقی بکرێنەوە ئارام گرنابن).

**٣٢- گوێ نەدانە کاسپی حەڵاڵ:**

خەولەی کچی قەیس (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . ورُبّ مُتخوضٍ فيما شاءت به نفسه من مال الله ورسوله، [أي: لايبالي في تحصيل المال أمن الحلال أم من الحرام ]ليس له يوم القيامة الاّ النار))[٥٥٢]. واتە: (کەسی واهەیە بە ئارەزووی خۆی ڕۆدەچێتە پارەوە و شەیدای پەیداکردنیەتی و گوێ نەدەرە بەحەڵاڵ و حەرام لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها دۆزەخ جێیەتی).

**٣٣- ئارەق خواردنەوە:**

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من شرب الخمر [وسكر] لم تقبل له صلاةُ-في رواية-[توبة] أربعين صباحاً[ وإن مات دخل النار ] فإن تاب تاب الله عليه. . . فإن عاد في الرابعة لم تقبل له صلاة أربعين صباحاً [وإن مات دخل النار ] فإن تاب لم يتب الله عليه وسقاه من نهر الخبال)) قيل: يا أبا عبدالرحمن: وما نهر الخبال ؟ قال: نهر من صديد أهل النار)). وفي رواية (([ومن سقاه صغيراً لايعرفُ حلاله

---

[٥٥١] أخرجه: أحمد (١٥٥٣١) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط حديث صحيح، والحاكم (٦٠٤/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

[٥٥٢] أخرجه: الترمذي (٢٣٧٤) وقال حديث حسن صحيح، والطبراني (الكبير)(٨٥٠/٢٤). وحسّن إسناده الحافظان المنذري (الترغيب)(٤٧٠٦)، والهيثمي(المجمع)(٢٤٧٨)، وصححه الشيخ الألباني(صحيح الترمذي) (١٩٣٤).

من حرامه، كان حقاً على الله أن يسقيهُ من طينةِ الخبال))[٥٥٣]. واتە: (هەر کەسێك ئارەق بخواتەوە و سەرخۆش بێت و تەوبە و نوێژی چل ڕۆژی لێوەرناگیرێت (گەر لەو ماوەیەدا مرد ئەوا دەچێتە ناو دۆزەخەوە، بەڵام دوای ئەوە گەر تەوبە بکات خوای گەورە تەوبەکەی لێوەردەگرێت.... ئەگەر لەچوارەم جاردا گەڕایەوە سەر ئارەق خواردن بەهەمان شێوە نوێژی چل ڕۆژی لێوەرناگیرێت (ئەگەر بمرێت لەوماوەیەدا دەچێتە ناو دۆزەخەوە) گەر بیەوێت تەوبە بکات خوای گەورە تەوبەکەی لێوەرناگرێت و لەڕووباری خەبالی دەرخوارد دەدات). بە عەبدوڵای کوڕی عومەریان وت: ڕوباری خەبال چیە؟ فەرمووی: ڕووبارێکە پڕە لە کێم و جەراعەتی دۆزەخیەکان. وەهەر کەسێك مەی دەخواردی منداڵێك بدات کە حەڵاڵ و حەرام لەیەك جیاناکاتەوە، ئەو کەسە خوای گەورە بە پێویستی داناوە لە سەر خۆی لە قوڕاوی خەبالی دەرخواد بدات).

**٣٤-سودمەندبوون بەهۆی ئازاردانی موسوڵمانێکەوە:**

مستوردی کوڕی شیداد ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من أكل بمسلم أكلةً، أطعمه الله بها أكلة من نار يوم القيامة، ومن أقام بمسلم مقام سُمعة أقامهُ الله يوم القيامة مقام رياءٍ وسمعة، ومن أكتسى بمسلم ثوباً كساه الله ثوباً من النار))[٥٥٤]. واتە: (هەر کەسێك بەهۆی موسوڵمانێکەوە خواردنێك بیچڕێت بەناڕەوا ئەوا خوای گەورە خواردنێکی ئاگرینی دەرخوارد دەدات لەڕۆژی دواییدا. وەهەر کەسێك بەهۆی موسوڵمانێکەوە بیەوێت دەرکەوێت و باسی بە چاکە بکرێت خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا لە جێگەیەکی ئابڕو چوندا نیشانی خەڵکانی دەدات، وە هەر کەسێ بەهۆی موسوڵمانێکەوە بەرگ و پۆشاکێك بەبەردا بکات خوای گەورە پۆشاکێکی ئاگری بەبەردا دەکات لەدۆزەخدا).

---

[٥٥٣] أخرجه: أحمد (٦/٤٦٠)، و أبوداود (٣٦٨٠)، والنسائي (٨/٣١٧)، والترمذي (١٨٦٢)، وابن ماجة (٣٣٧٧)، والحاكم (٤/١٤٦) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٥٣٥٧) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي)(٥٢٣٩)، و(صحيح الترمذي) (١٥١٧)، و(صحيح الترغيب) (٢٣٨٣-٢٣٨٤)، و(الصحيحة)(٢٠٣)، و(صحيح الجامع)(٤٥٤٨).

[٥٥٤] أخرجه: البخاري (الأدب المفرد) (٢٤٠)، وأبو داود (٤٨٨١)، والطبراني (الكبير) (٢٠/٧٣٥)، والحاكم (٤/١٢٧)، و صححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (١٧٩) و (صحيح أبي داود) (٤٠٨٤) (السلسلةالصحيحة) (٩٣٤).

**٣٥- شاردنەوەی زانست:**

**ئەبو هورەیرە﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((مامن رجل يَحفظ علماً فيكتُمُه الاّ أُتي به يوم القيامة ملجوماً بلجامٍ من النار))[٥٥٥]. **واتە: (هەر پیاوێك زانستێكی لەبەربێت یاخود بیزانێت و بیشارێتەوە و نەیلێت ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا لغاوێكی ئاگرینی دەكاتە دەم و گەردنی).**

**وەلە ڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((من سُئِل عن علم يعلمهُ فكتمه الجِمَ يوم القيامة بلجام من نار))[٥٥٦]. **واتە: (هەركەسێك پرسیارێكی لێ بكرێت دەربارەی زانستێك كە دەی زانێت. بەڵام بیشارێتەوە ئەو كەسە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لغاوێكی ئاگرین دەكاتە دەمی).**

**٣٦- ئەو كەسانەی زەكات نادەن:**

**ئەنەس ﷛ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((مانع الزكاة يوم القيامة في النار))[٥٥٧]. **واتە: (ئەو كەسەی زەكات نادات لە ڕۆژی كۆتاییدا لە دۆزەخدایە).**

**٣٧- ئەوكەسەی كە دراوسێكەی متمانەی پێناكات:**

**ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((لايدخل الجنة من لا يأمن جارهُ بوائقه))[٥٥٨]. **واتە: (ناچێتەوە بەهەشتەوە ئەو كەسەی دراوسێكەی متمانەی پێی نەكات).**

**٣٨- ئەوكەسەی حەز دەكات پیاوان لەبەری هەستن و خەڵكان لەبەر گەورەیی بە چواردەوریەوە بوەستن:**

**موعاویە ﷛ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((من أحب أن يتمثل له الرجال قياماً فليتبوأ مقعده من النار))[٥٥٩]. **واتە: (هەر كەسێك پێی خۆشە خەڵكان**

---

[٥٥٥] أخرجه: ابن ماجة (٢٦١)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(٢١٠)، و(صحيح الترغيب)(١٢٠).

[٥٥٦] أخرجه: ابن ماجة (٢٦٦)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(٢١٣).

[٥٥٧] أخرجه: الطبراني (الصغير)(٥٨/١)وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع)(٥٨٠٧)، و(صحيح الترغيب)(٧٦٢).

[٥٥٨] أخرجه: البخاري (٦٠٦١)، ومسلم (٤٦٩)، واللفظ له، وأحمد (٢٨٨/٢).

[٥٥٩] أخرجه: أبو داود (٥٢٢٩)، والترمذي (٢٧٥٥)، وصحح إسناده المنذري في(الترغيب)(٤٠٠٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(٤٣٥٧) و(صحيح الترمذي)(٢٩١٥)وصحيح الجامع (٣٥٧).

لەبەری هەستنە سەر پێ (یاخود لە دانیشتندا خەڵکان بە چواردەوریەوە بە پێوە بوەستن) باجێگەیەك لە دۆزەخدا بۆ خۆی مسۆگەر بکات).

**٣٩- ئەو کەسەی قسەی دابڕیوە لەگەڵ برایەکی موسوڵمانی خۆیدا:**

هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لايحل لمسلم أن يُصارم – في رواية – [يُهاجر] مسلماً فوق ثلاث ليالٍ، فأنهما ناكبان عن الحق مادامـا على صرامها، وإنَّ أوّلهما فيئاً يكون سبقه بالفيء كفارةُ له، وإن سلّم عليه فلم يقبل سلامهُ ردّت عليه الملائكة، وردّ على الاخر الشيطان، فان ماتا على صِرامها لم يدخلا الجنة [جميعاً أبدا]ولم يجتمعا في الجنة))[٥٦٠]. واته: (موسوڵمان ڕێگەی پێ نادرێت قسە دابرێت لەگەڵ موسوڵمانێکدا لەسەر و سێ شەو، وە هەر دووکیان لە حەق و ڕاستی لایان داوە گەر لەسەر ئەو کارەیان بەردەوام بن، وە یەکەم کەسیان کە ئاشت دەبێتەوە ئەم دەست پێش کەری دەبێتە سڕینەوەی تاوانی قسە دابڕینەکەی وە گەر سەلامی لەوی تریان کرد و ئەو وەڵامی نەدایەوە فریشتەیەك وەڵامی دەداتەوە و شەیتانێك وەڵامی ئەوی تریان دەداتەوە. و گەر هەر دوولایان لەسەر قسە دابڕینیان بەردەوام بن تا مردن بەیەکەوە ناچنە بەهەشت و تیایدا هەرگیز کۆنابنەوە).

فەضالە کوڕی عوبەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەمویەتی: ((من هجر أخاه فوق ثلاث فهو في النار إلاّ ان يتداركه الله برحمتهِ))[٥٦١]. واتە: (هەر کەسێك قسە دابرێت لەبرایەکی موسوڵمانی لەسەر و سێ ڕۆژەوە ئەوە ئەو کەسە لە دۆزەخدایە مەگەر خوای گەورە بەرەحمی خۆی فریای بکەوێت).

**٤٠- سزادانی ئاژەڵ:**

عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((دخلت أمرأة النار في هرَّةٍ ربطتها فلم تطعمها ولم تدعها تأكلُ من حشاش الأرض))[٥٦٢]. واتە:

---

[٥٦٠] أخرجه: أحمد (٤/٢٠)، والبخاري (الأدب المفرد)(٤٠٢-٤٠٧)، والبزار (٢٠٥١)، والطبراني (الكبير) (٢٢/٤٠٥)، وابن حبان (٥٦٦٤) وقال محققه اسناده صحيح على شرط الشيخين، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(١٢٤٦) و(صحيح الأدب المفرد)(٤١٣)والارواء (٧، ٩٥)، و (صحيح الترغيب) (٢٧٥٩).

[٥٦١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/٣١٥) وقال الهيثمي (المجمع) (٨/٦٧) رجاله رجال الصحيح، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٢٧٦١).

[٥٦٢] أخرجه: البخاري (٣٤٨٢)، ومسلم (٢٢٤٢)، وأحمد (٣/٣٥٥)والدارمي (٢٨١٤).

(ئافرەتێك چووە دۆزەخەوە لەبەر ئەوەی پشیلەیەکی بەستبوویەوە و نەیهێشت بوو هیچ بخوات و بەری نەدابوو تاخۆی بچێت خواردن پەیدا بکات (تا لە ناوچوو))، لەڕیوایەتێکدا ((فوجب لها النار بذلك)). واتە: (لەبەر ئەوەش دۆزەخی بۆ مسۆگەر بوو). عائیشەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) دەفەرموێت: " ان المرأة مع ما فعلت كانت كافرة، وان المؤمن اكرم على الله عزوجل ان يُعذبه في هرّة "(٥٦٣). واتە: (ئەو ئافرەتە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو کارەی ئەنجامدا کافربوو، بڕوادار لای خوا بەرێزترە لەوەی لەسەر پشیلەیەك خوا سزای بدات).

**٤١- گوێ نەدان بەقسەکردن کە دەبێتە تورەیی خوای گەورە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . ان العبد ليتكلم بالكلمة من سخط الله تعالى لايلقي لها بالاً يهوي بها في جهنم))(٥٦٤). واتە: (بەندەی وا هەیە قسەیەك دەکات لەو قسانەی کە خوای گەورە پێی تورە دەبێت، خوای گەورە لەسەر ئەو قسەیە دەیکاتە ناو دۆزەخەوە و گوێیی پێ نادات)، وەلە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((. . . يهوي بها سبعين خريفاً في النار))(٥٦٥). واتە: (حەفتا پایز دەکەوێتە خوار بۆ ناو دۆزەخ)، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((ينزلُ - وفي رواية - [يزل] بها في النار ابعد ما بين المشرق والمغرب))(٥٦٦). واتە: (بەو قسەیە خوای گەورە دوورتر لە نێوان ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا دەیخاتە دۆزەخەوە. . . . )، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((. . . ألا عسى رجل منكم يتكلم بالكلمة يُضحك بها أصحابه فيسخط الله بها عليه، لا يرضى عنه حتى يُدخله النار))(٥٦٧). واتە: (ئاگاداربن پیاو هەیە لە نێو ئێوەدا قسە دەکا وشەیەك دەڵێت تا هاوەڵانی پێ بخاتە پێ کەنین و لەسەر

---

(٥٦٣) أخرجه: أحمد (٥١٩/٢)(١٠٧٢٧) وقال محققه: اسناده حسن، والطيالسي(١٩٩)، والبيهقي (البعث)(ص: ٧٩).

(٥٦٤) أخرجه: مالك (٩٨٥/٢)، والبخاري (٦٤٧٨)، والحاكم (٥٩٧/٤)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الشعب) (٤٨٣٢).

(٥٦٥) أخرجه: الحاكم (٥٩٧/٤)، وصححه على شرط على مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الشعب) (٤٨٣٢)، وصححه اليشخ الألباني في (صحيح الترغيب)(٢٨٧٧).

(٥٦٦) أخرجه: البخاري (٦٤٧٧)، ومسلم (٢٩٨٨)، وابن حبان (٥٧٠٧).

(٥٦٧) أخرجه: أبو الشيخ في كتاب (العظمة)، وقال المنذري في (الترغيب)(٤٢٣٩)إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٢٨٧٧).

ئەوە خوا لە خۆی تورە دەکا و خوای گەورە بەهیچ شتێك لێی ڕازی نابێت تا دەیخاتە دۆزەخەوە).

**٤٢-درۆکردن:**

ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((أياكم والكذب فان الكذب يهدي إلى الفجور وإن الفجور يهدي إلى النار. . . ))[٥٦٨]. واتە: (خۆتان بەدوور گرن لە درۆ چونکە درۆ بەرەو زیادەڕەوی و خراپە کاریتان دەبات، وە خراپەکاریش بەرەو دۆزەختان دەبات).

لە ڕیوایەتێکی تردا موعاویە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((أيّاكم والكذب فانه مع الفجور وهما في النار))[٥٦٩]. واتە: (خۆتا دوور بگرن لە درۆ چونکە درۆ لەگەڵ زیادەڕەوی و خراپەکاریدایە و هەر دووکیان لە دۆزەخدان).

**٤٣- دووڕوویی:**

عەممار ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من كان له وجهان في الدنيا كان له يوم القيامة لسانان من النار))[٥٧٠] واتە: (هەرکەسێك لەدونیادا دووڕووی هەبوو بێت لە ڕۆژی کۆتاییدا دووزمانی ئاگری دەبێت).

**٤٤- دواکەوتن و خۆدواخستن لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەت:**

عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: : ((لايزال قوم يتأخرون عن الصف الأول حتى يُؤخِرَهَم الله يوم القيامة))[٥٧١]. واتە: (بەردەوام کەسانێك خۆیان دوادەخەن لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەت تاکو خوای گەورە دوایان دەخات لە

---

[٥٦٨] أخرجه: البخاري (٦٠٩٤)، ومسلم (٢٦٠٧)، وأبوداود (٤٩٨٩)، والترمذي (١٩٧١).

[٥٦٩] أخرجه: البخاري (الأدب المفرد)(٧٢٤)، والحميدي (٧)، و(أحمد (٥)وقال محققه: اسناده صحيح، وابن ماجة (٣٨٤٩)، وأبويعلى (١٢١)، وابن حبان (٥٧٣٤)وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٥٥٧)، و (صحيح الترغيب)(٢٩٣٣).

[٥٧٠] أخرجه: أبو داود (٤٨٧٣)، وابن حبان (٥٧٥٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(٤٠٧٨)، وفي (السلسلة الصحيحة) (٨٨٩).

[٥٧١] أخرجه: عبد الرزاق (٢٤٥٣)، وابن خزيمة(١٥٥٩)، وأبو داود (٦٧٩)، والبيهقي (الكبرى)(١٠٣/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(٦٣٠).

**ڕۆژی دواییدا)، لە ڕیوایەتێکی تردا** ((حتى يؤخرهم الله في النار)). **واتە: (تا خوای گەورە دوایان دەخات بۆ ئاگری دۆزەخ).**

**٤٥- بانگەشەی نەفامی:**

**حارسی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((. . . من إدعى بدعوى الجاهلية فأنه من جثاء جهنم)) فقال رجلٌ: يارسول الله وإن صلّى وصام ؟ فقال: ((وإنْ صلّى وصام فادَّعوا بدعوى الله الذي سمّاكم المسلمين المؤمنين عباد الله))[٥٧٢]. **واتە: (هەرکەسێك بانگەشەی دەمارگیری و نەفامی بکات ئەو کەسە دەبێتە سوتووی ناو دۆزەخ) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر ئەو کەسە نوێژیش بکات یاخود بە ڕۆژوویش بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، گەر ئەو کەسە نوێژیش بکات و بەڕۆژووش بێت، کەوا بوو یەکتری بانگ بکەن بەو ناوەی کەخوای گەورە ناوی بردوون بەموسوڵمان وە باوەڕدار بەندەی خوا).**

**٤٦- واز هێنان لە نوێژ:**

**کاتێك خەڵکی بەهەشت پرسیار لە خەڵکی دۆزەخ دەکەن چی بووە هۆی چوونە ناو دۆزەخیان، وەئەوانیش بەم شێوەیە وەڵامیان دەدەنەوە: دەڵێن:** ﴿لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ﴾ **واتە: (ئێمە لە نوێژ خوێنەکان نەبووین و نوێژمان نەدەکرد). وە** (أم ايمن رضي الله عنها) **دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((لا تترك الصلاة متعمداً فانه من ترك الصلاة متعمداً فقد برئت منه ذمه الله ورسوله))[٥٧٣]. **واتە: (وازلە نوێژ نەهێنیت بەبێ هۆ چونکە هەرکەسێك نوێژ بەبێ هۆ واز لێ بهێنێت هیچ پەیوەندیەکی بە خواو پێغەمبەرەوە نامێنێت).**

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (جارێکیان پێغەمبەر باسی نوێژی کرد و فەرمووی:** ((من لم يُحافظ عليها، لم يكن له نور ولا برهانٌ ولانجاة، وكان يوم القيامة مع

---

[٥٧٢] أخرجه: الترمذي (٢٨٦٣)، والطيالسي (١١٦١)، وأبويعلى (٦٢٣٣)، وأحمد (١٣٠/٤)، وابن خزيمة (٩٣٠)، والطبراني (الكبير)(٣٤٢٧)، وابن حبان (٦٢٣٣)، وقال محققه: إسناده صحيح، والحاكم (١١٨/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)(٢٢٩٨)، والمشكاة(٣٦٩٤)، وصحيح الجامع (١٧٢٤).

[٥٧٣] أخرجه: أحمد (٢٧٣٦٤)، وعبد بن حميد (١٥٩٤)، والبيهقي (٣٠٤/٧)، وحسنه الألباني في (صحيح الترغيب) (٥٧٣).

قارون وفرعون وهامان وأبي بن خلف))[٥٧٤]. **واتە: (هەرکەسێك پارێزگاری لەنوێژەکان نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ ڕووناکی و بەڵگە و ڕزگاربوونێکی بۆنی یە وەلەگەڵ قاروون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەڵەف دا حەشردەکرێت).**

**٤٧- ئەو ئافرەتانەی زەکاتی ئاڵتونەکانیان نادەن:**

**لەعەمری کوڕی شوعیبەوە لەباوکی یەو لە باپیریەوە (رضي الله عنهما) دەفەرموێت:** ((أن امرأة أتت النبي ﷺ ومعها إبنة لها وفي يد ابنتها مسكتان غليضتان من ذهب فقال لها: ((أتعطين زكاة هذا)) ؟ قالت: لا، قال((ايسُرك ان يسورّكِ الله بهما يوم القيامة سوارين من النار))؟ قالت: لا قال: ((فأديا زكاته)) قال فخذفهما فألقتهما إلى النبي ﷺ وقال: ((هما لله ورسوله))[٥٧٥] **واتە: (ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ کچێکی خۆی لەگەڵدابوو دوو بازنی ئاڵتونی ئەستور لە دەستی کچەکەیدا ابوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا زەکاتی ئەو دوو بازنە دەدەیت؟ ئەویش وتی نەخێر، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئایا پێت خۆشە خوای گەورە لەقیامەتدا دووبازنی ئاگرت بکاتە دەست؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی تۆش زەکات کەی بدە. ئەویش هەردوو بازنەکەی لە دەستی دانا و بردیە بەردەم پێغەمبەر ﷺ وتی: هەردووکیان بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی).**

**وەلەڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەفەرموێت:** ((أن فاطمة بنت النبي ﷺ دخلت على أبيه، وفي يدها سلسلة من ذهب، فقال لها النبي ﷺ ((يافاطمة أيغرُّكِ ان يقول الناس ابنة رسول الله وفي يدها سلسلة من نار)) (ثم خرجت فاطمة ولم يقعد فارسلت بالسلسلة إلى السوق فباعتها وأشترت بثمنها عبداً فأعتقهُ) فحدثِ بذلك النبي ﷺ فقال ((الحمدالله الذي أنجى فاطمة من النار))[٥٧٦] **واتە: (فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ هاتەلای پێغەمبەر ﷺ و**

---

[٥٧٤] أخرجه: أحمد (١٦٩/٢) (٦٥٧٦)وقال محققه: إسناده حسن، والدارمي(٢/ ٣٠١)، والطحاوي (٢٢٩/٤)، وابن حبان (١٤٦٧)وقال محققه صحيح، والبيهقي (شعب الأيمان) (٢٨٢٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٩٢/١)رجاله ثقات، وجود اسناده المنذري في (الترغيب)(٨٢٠)، وقال الشيخ أحمد شاكر في تحقيقه: المسند (٨٣/١٠) اسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (الثمر المستطاب)(٥٣/١): اسناده حسن.

[٥٧٥] أخرجه: أحمد (٤٦١/٦)، وأبوداود (١٥٦٣)، والترمذي (٦٣٧)، والنسائي (٣٨/٢)، والدار القطني (١٠٨/٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٣٨٩) و(صحيح الترمذي) (٥١٨)، و(صحيح الترغيب) (٧٦٨).

[٥٧٦] أخرجه: النسائي (١٥٨/٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي)(٤٧٤٨)، و(صحيح الترغيب)(٧٧١).

زنجیرێك ئاڵتونی لەدەستا بوو پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئەی فاتیمە ئایا حەزدەکەیت خەڵکان بڵێن ئەوە کچی پێغەمبەری خوایە و زنجیری ئاگری لەدەست دایە؟) پاشان فاتیمە چووە دەرەوە و دانەنیشت تازنجیرە ئاڵتونەکەی نارد بۆ بازاڕ و فرۆشتی وە بەنرخەکەی بەندەیەکی کڕی و ئازادی کرد) وە ئەو باسەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە و پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (سوپاس بۆ خوا کەفاتیمەی ڕزگار کرد لە ئاگر).

ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی: ((من أحبّ أن يُحلّق حبيبه حلقة من نار، فليحلّقهُ حَلقةً من ذهب، ومن أحب أن يطوّقَ حبيبه طوقاً من نار فليطوّقْهُ طوقاً من ذهب ومن أحب أن يسوِّر حبيبه بسوارٍ من نار، فليسوِّره بسوارٍ من ذهب))[٥٧٧]. واتە: (هەر کەسێك پێی خۆشە ئەڵقەیەکی ئاگر بداتە خۆشەویستەکەی با ئەڵقەیەکی ئاڵتونی بداتێ، وە هەر کەسێك پێی خۆشە تەوقێکی ئاگر بداتە خۆشەویستەکەی با تەوقێکی ئاڵتونی بداتێ، وە هەر کەسێك پێی خۆشە بازنێکی ئاگر بکاتە دەستی خۆشەویستەکەی با بازنێکی ئاڵتون بکاتە دەستی خۆشەویستەکەی). لە ئاینی ئیسلامدا ئافرەت ڕێگە پێدراوە ببێتە خاوەنی ئاڵتون بەڵام باشتر وایە بەکاری نەهێنێت لەبەر فەرموودەکەی عەبدولای کوڕی عەمر﷛ کە دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((مَنْ لبِس الذهب من أمتي فمات و هو يلبسه حرَّمَ اللهُ عليه ذهب الجنة، ومن لبس الحرير من أمتي فمات و هو يلبسه حرَّم الله عليه حرير الجنة))[٥٧٨]. واتە: (هەرکەسێك لە ئومەت و شوێن کەوتوانی من ئاڵتون بەکار بهێنێت تامردن، ئەو کەسە خوا حەرامی دەکات لەسەری ئاڵتونی بەهەشت بەکاربهێنێت، وە هەر کەسێك لە ئومەت و شوێن کەوتوانی من ئاورێشم بپۆشێت تامردن ئەو کەسە خوا حەرامی دەکات لەسەری ئاورێشمی بەهەشت بپۆشێت).

## ٤٨- ئەو کەسەی سواڵ دەکا و پێویستی پێ نی یە:

سەهلی حەنظەلە ﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من سأل شيئاً وعنده مايُغنيه فانّما يستكثرُ من جمر جهنم))[٥٧٩]. واتە: (هەرکەسێك داوای شتێك لەخەڵك

---

[٥٧٧] أخرجه: أبوداود (٤٢٣)، والنسائي (١٠٦/٨)وصحح إسناده الحافظ المنذري (الترغيب)(١١٤٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(٣٥٦٥)و (آداب الزفاف)(١٣٣)، و(صحيح الترغيب) (٧٧٢).

[٥٧٨] أخرجه: أحمد ((المسند)) (٦٥٥٦) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط: إسناده صحيح.

[٥٧٩] أخرجه: أحمد (١٨٠/٤)، وابوداود (١٦٢٩)، وابن حبان (٣٣٩٤) وقال محققه اسناده صحيح، والطبراني (٥٦٢٠)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(١٤٣٥).

بکات لەکاتێکدا ئەوەندەی هەبێت کەبەشی بکات پێویستی پێ‌ی نەبێت و ئەو کەسە پشکۆی دۆزەخ بۆ خۆی زیاد دەکات)، لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ کەفالەتی بەهەشتی بۆ ئەو کەسە کردووە کەداوای شت لەخەڵك ناکات، لەئەوبانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من یکفل لي أن لایسأل الناس شیئاً وأتکفلُ له الجنّة))(٥٨٠) واتە: (هەر کەسێك زەمانەتی ئەوەم بداتێ کە داوای هیچ شتێك لە خەڵکی نەکات من زەمانەتی چوونە بەهەشتی دەدەمێ).

## ٤٩- ئەو لاشەیەی بەحەرام گۆش کراوە:

ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لایدخل الجنة جسدٌ غُذي بالحرام))(٥٨١). واتە: (کەسێك ناچێتە بەهەشت کەلاشەی بەحەرام گۆش کرابێت).

## ٥٠- منەت کار:

عەبدوڵای کوڕی عومەرﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لایدخل الجنّة منان ولاعاقٌ ولامُدمن خمرٍ))(٥٨٢). واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە: کەسێکی منەت کارو ئازاردەری دایك و باوك و ئارەق خۆرێکی بەردەوام).

## ٥١- ئافرەت و پیاوە زیناکارەکان:

عەبدوڵای کوڕی عومەرﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لایدخل الجنة ولدُ زینة ولامنّان ولاعاق ولامدمن خمر))(٥٨٣). واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە کوڕێکی زیناکار

---

(٥٨٠) أخرجه: أحمد (٢٨١/٥)، والنسائي(٩٦/٥)، وأبوداود (١٦٤٣)، وابن ماجة (١٨٣٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحیح أبي داود)(١٤٤٦)، و(صحیح ابن ماجة)(١٤٧٨)والمشكاة (١٨٥٧).

(٥٨١) أخرجه: أبو يعلى (٢٩/١)رقم (٨٤)، والبزار (٣٥٦٠)وصححه الشخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٢٦٠٩).

(٥٨٢) أخرجه: أحمد (٢٠٣/٢)، والدارمي(١١٢/٢)، والنسائي (الكبرى)(٤٩١٥، ٥١٨٢)، والطحاوي (مشكل الأثار) (٩١٤)، وابن حبان (٣٣٨٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع (٧٦٧٦)، (السلسلة الصحيحة)(٦٧٠).

(٥٨٣) أخرجه: أحمد (٦٨٩٢/٣)، والنسائي (الكبرى)(٤٩١٦)، وأبويعلى (١١٦٨)، والطيالسي (٢٢٩٥)، وابن حبان (٣٣٨٣) وقال محققه الأرناؤوط حديث حسن بشواهده، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة)(٢٢٩٥).

**و منەتکار و ئازاردەری دایك و باك و ئارەق خۆرێکی بەردەوام)، مەبەست لە ((ولد زينة)) وەکو ئیمامی طەحاوی** (رحمه الله) **دەفەرموێت:** " أُريد به من تحقّق بالزنى حتى صار غالباً عليه ومنسوباً اليه ولم يرد به المولود من الزنى ومن ذلك ابن الدنيا وابن السبيل و ولد المدينة"[٥٨٤].

**واتە: (مەبەست لە کوڕێکی زیناکار ئەو کەسەیە کە زۆر قاڵ بووەتەوە لە زیناکاریدا و بەوەناسراوە و ئەو ناوەی بەسەردا بڕاوە). فەرموودەکە مەبەستی ئەو کەسە نیە کە بەهۆی زیناکاری باوك دایکیەوە دروست بووە وەك چۆن لەو زەمانەدا باوە و دەڵێن: فلانەکەس کوڕی دونیایەوە فلانەکەس کوڕی ڕێگایە وە فلانەکەس کوڕی شارە وە هەروەها).**

**٥٢- بەدرۆخستنەوەی قەدەر:**

**زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** ((ان الله لو عذّبَ اهل سماواته وأهل أرضه، لعذّبهم وهو غير ظالمٍ لهم، ولو رحمهم لكانت رحمته خيراً لهم من اعمالهم، ولو كان لك مثل جبل أحد ذهباً تنفقه في سبيل الله ماقبلهُ الله منك، حتى تؤمن بالقدر كلّه فتعلم ان ماصابك لم يكن ليخطئك وان ماأخطأك لم يكن ليصيبك وانّك إن متّ على غير هذا دخلتَ النار))[٥٨٥]. **واتە: (گەرخوای گەورە سزای هەموو نیشتەجێ ئاسمانەکان و زەویەکانی بدات، سزایان دەدات و ستەمیشی لە هیچیان نەکردووە. گەر بە بەزەیش بێت بۆیان، بەزەیی خوا باشترە بۆیان لە هەموو کارەکانیان، گەر تۆش بەوێنەی چیای ئوحود ئاڵتونت هەبێت و بیبەخشیت لە پێناوی خوادا، خوا لێت وەرناگرێت تا بڕوات بەهەموو قەدەرەکانی خوا نەبێت وە دەبێت بزانیت ئەوەی کە تووشت هاتووە دەبوو هەر توشت بێت وە ئەوەی توشت نەبووە دەبوو هەر توشت نەیەت، گەر تۆش لەسەر هەرباوەڕێك بمریت جگە لەم باوەڕە دەچیتە دۆزەخەوە). لەڕیوایەتێکی تردا ئەبو دەرداء**

---

[٥٨٤] أنظر: (مشكل الأثار)(٩١٤).

[٥٨٥] أخرجه: أحمد (١٨٥/٥)، وأبو داود (٤٦٩٩)، وابن ماجة (٧٧)، وابن أبي عاصم (السنة) (٢٤٥)، والأجري (الشريعة)(٤٠٠)، وابن بطة (الأبانة)(١٣١/٢)، واللالكائي (١٠٩٢)قال محققه: سنده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في (المشكاة)(٤١/١)، و(مختصر الطحاوية)(ص: ٥٠٩)، وفي (ظلال الجنة)(٢٤٥)، و(صحيح أبي داود) (٢٩٣٢)، و(صحيح ابن ماجة) (٦٢)

ﷺ دەفـەرمویێت: ((لایدخل الجنة عاق ولامكذّب بقدر ولامدمن خمر))[٥٨٦]. واتـە: (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کەئازاری دایك و باوك دەدات، وە ئەو کەسەی قەدەر بەدرۆ دەکاتەوە وەکەسێکیش ئارەق خۆرێکی بەردەوام بێت).

**٥٣- قسە پێش خستن بەسەر وتەی پێغەمبەردا ﷺ:**

لەوائلی کوڕی ئەسعەقەوە ﷺ دەفەرموێت: ((أقبل رجل عليه شارةٌ حسنة [أي: لباس حسن جميل] لاأدرى من رأيت رجلاً ابهى لعيني منه [ فجعل رسول الله ﷺ لا يتكلم بكلام الا كلفته نفسه – في روايه – [إلاّ احبّ]ان يأتي بكلام يعلو كلام رسول الله ﷺ، فلما انصرف قال رسول الله ﷺ ((إن الله لايحب هذا وضربائه – في رواية – [حزبه] يلوون ألسنتهم للناس ليّ البقرة لسانها بالمرعى، كذلك يلوى الله ألسنتهم و وجوههم في النار))[٥٨٧].

واتە: (پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وجل و پۆشاکێکی زۆر جوانی لەبەردا بوو من تا ئەو کات پیاوەی جل و پۆشاك جوانی وام بە چاو نەدیبوو، پێغەمبەر ﷺ هەر قسەیەکی دەفەرموو، ئەو کابرایە زۆری لە خۆی دەکرد و پێی خۆش بوو قسەیەك بهێنێت زاڵ بێت بەسەر قسەی پێغەمبەردا ﷺ کاتێك ئەو کابرایە ڕۆیشت و ئەوی بەجێهێشت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە ئەو پیاوە و هاوشێوەی ئەوەی خۆش ناوێت زمانیان لول دەدەن بۆ خەڵکان (لەکاتی قسەکردندا) وەك چۆن مانگا زمانی لول دەدات و گاوێژ دەکات لەکاتی گیا خواردنیدا، بەو شێوەیەش خوای گەورە زمان و ڕوویان لول دەدات لە دۆزەخدا).

**٥٤- داوێن پیسی لەگەڵ ( محرم )دا، و دەشتەکی بوون دوای کۆچ کردن: -**

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لايدخل الجنة عاق. . . ولامن أتى ذات محرم، ولا من قُتل اعرابياً بعد الهجرة))[٥٨٨]. واتـە: (ناچێتە

---

[٥٨٦] أخرجه: مسلم (٨/٨١)، وأحمد (٦/٤٤١)، والنسائي (٢/٣١٥)، وابن أبي عاصم (السنة)(٣٢١)، وقال محققه الشيخ الألباني: حديث حسن، والفريابي (القدر)(١٩٩) وقال محققه: اسناد حسن، وحسنه أيضاً الشيخ مقبل في (الجامع الصحيح) (٥/٤٣)، وانظر: (السلسلة الصحيحة) (٦٧٥).

[٥٨٧] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٢/٧٠) رقم (١٧٠)، وابن عساكر (١٧/٣٥٧)، وأبونعيم (الحلية) (٢/٢٢)، والبيهقي (الشعب) (٤٩٧٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠/٢٦١) رواه الطبراني (الكبير) باسانيد رجال أحدها رجال الصحيح، والهروى (ذم الكلام) (١٠٩)، وقال محققه: صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة)(٣٤٢٦).

[٥٨٨] أخرجه: عبد الرزاق (٢٠١٢٩)، ابن أبي شيبة (٥٤٦٦)، وأبونعيم (الحلية)(٣/٣٠٩)، والدارمي (٢/١١٢)، والمروزي (كتاب البر والصلة)(١٠٨)، وقال محققه: اسناده حسن.

بەهەشتەوە کەسێك ئازاری دایك و باوکی دابێت. . . وەکەسێك داوێن پیسی و بەد ڕەوشتی لەگەڵ (محرم) ێکی خۆیدا ئەنجام دا بێت، وەکەسێك لە دوای کۆچکردنی بوو بێتەوە دەشتەکی و کوژرابێت). (واتە: کەسێك کۆچ بکات لە پێناوی ئیسلامدا و پاشان بگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی کوژرابێت).

**٥٥-ئەو کەسەی فتوا دەدات و لادەرە لەحەق و ڕاستی:**

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ألم تعلموا ما لقي صاحبُ بني اسرائيل، كانوا إذا أصابهم البول، قطعوا ماأصابه البول منهم، فنهاهم، فعُذّب في قبرهِ))[٥٨٩] واتە: (ئەی نەتان زانیوە کابرای بەنی ئیسرائیلی چی بەسەر هات. ئەوان گەر میز بەر هەرجێگەیەکی جل و بەرگیان بکەوتایە ئەو جێگەیان دەبڕی و فڕێیان دەدا، ئەویش داوای لێ کردن وا نەکەن (واتە: نەریتی ئاینەکەیانی گۆڕی) و لەسەر ئەو کارەش سزا درا لە گۆڕەکەیدا).

وعوقبەی کوڕی موسلیم (رحمه الله) دەفەرموێت: ((ان ابن عمر سُئل عن شي فقال: لاأدری ثم اتبعها فقال: " أتريدون ان تجعلوا ظهورنا لكم جسوراً في جهنم ان تقولوا: افتانا ابن عمر بهذا " واتە: (عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ جارێکیان پرسیار لە بارەی شتێکەوە لێ کرا و ئەویش وتی: نازانم. پاشان وتی: دەتانەوێت پشتمان بکەنە پردێك و لەسەر دۆزەخ خۆتانی پێ ڕزگار بکەن و بڵێن: عەبدوڵای کوڕی عومەر بەم جۆرە فتوای بۆ داین).

لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: "تدري ما يريد هولاء يريدون ان يجعلوا ظهورنا جسراً لهم إلى جهنم"[٥٩٠]. واتە: (بەیەکێکی فەرموو: دەزانیت ئەو خەڵکە چیان دەوێت، ئەوان دەیانەوێت پشتمان بکەنە پردێك و بەسەر دۆزەخدا پێی بپەڕنەوە و خۆیانی پێ ڕزگار بکەن).

---

[٥٨٩] أخرجه: أحمد(٤/١٩٦)، والنسائي(١/٢٦)، و أبوداود (٢٢)، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح أبي داود) (١٦).

[٥٩٠] أخرجه: ابن المبارك (الزهد) (٤٤)وقال محققه: سنده صحيح، والخطيب في (الفقيه والمتفقه)برقم (٧٣٢) وقال محققه اسناده صحيح، وابن عبد البر(جامع بيان العلم) (١٥٨٥)وقال محققه: صحيح.

**٥٦-بوختان کردن بۆ موسوڵمان:**

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((. . . من قال في مؤمن ماليس فيه اسكنه الله ردغة الخبال حتى يخرج مما قال))[٥٩١]. **واتە: (هەر کەس بوختانێك بۆ بڕوادارێك بکات خوای گەورە نیشتەجێی قوڕاوی خەبالی دەکات تا دەردەچێت لەو قسەیەی کە کردویەتی).**

**٥٧-زۆرداری و باج وەرگرتن لە خەڵکی:**

**ڕوەیفعی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((انَّ صاحب المكس في النّار))[٥٩٢]. **واتە: (ئەوەی باج و پارەی ناڕەوا بەزۆر لە خەڵك وەردەگرێت لە دۆزەخدایە).**

**٥٨- وەرگرتنی پارە لەسەر فێرکردنی قورئان:**

**ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((من أخذ على تعليم القرآن قوساً قلّده الله مكانها قوساً من نار جهنم يوم القيامة))[٥٩٣]. **واتە: (هەر کەسێك کەوانێك لەسەر فێری کردنی قورئان وەرگرێت خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا کەوانێکی ئاگری لەشان دەکات لە دۆزەخدا). لە ڕیوایەتێکی تردا عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێت:** "...قلت: يارسول الله رجل اهدى إلى قوساً ممن كنت اعلمه القرآن، وليست بمالٍ، وارمي عنها في سبيل الله " ؟ قال: ((ان كنت تحب ان تطوق طوقاً من نار فأقبلها))[٥٩٤]. **واتە: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکم فێری قورئان کرد ئەویش کەوانێکی بەدیاری دایە من، ئەو کەوانەش پارەیەکی ئەو تۆ ناکات منیش لە غەزادا لە پێناوی خوادا بەکاری**

---

[٥٩١] أخرجه: أحمد (٥٣٨٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (٢٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٨٢/٦).

[٥٩٢] وأخرجه: أحمد (١٠٩/٤)برقم (١٧٠٠١) وقال محققه: حسنٌ لغيره، والطبراني (الكبير)(٤٤٩٣)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٣٤٠٥): اسناده جيّد، قال البيهقي في (الكبرى)(١٦/٧): " المكس هو النقصان، فإذاكان العامل في الصدقات ينتقص من حقوق المساكين ولا يعطيهم إيّاها بالتمام فهو حينئذ صاحب مكس يخاف عليه الاثم والعقوبة ".

[٥٩٣] أخرجه: البيهقي (السنن الكبرى) (١٢١/٦)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥٦).

[٥٩٤] أخرجه: أبوداود(٣٤١٦)، وابن ماجة (٢١٥٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٧٥٠).

دەهێنم. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (گەر پێت خۆشە بکرێیتە تەوقێکی ئاگرەوە تۆش وەری گرە).

**٥٩-ئەوەی داوای شتێك بکات کە هی ئەونیە:**

ئەبو زەڕی غەفاری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من ادّعى ماليس له فليس منا وليتبوأ مقعدهُ من النار))[٥٩٥]. واتە: (هەر کەسێك بانگەشەی شتێك بکات کەهی ئەو نی یە، ئەو کەسە لە ئێمە نیە و باجی خۆی مسۆگەر بکات لە دۆزەخدا).

**٦٠-خۆشەویستی دونیا و شوێن کەوتنی حەز و ئارەزوو:**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾(النازعات: ٣٧-٣٩). واتە: (کەسێك بوغرا بێت وە دونیای لاخۆشەویست بێت ئەو کەسە دۆزەخ جێگەی دەبێت). وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((حُفَّتِ الجنَّةُ بالمكارهِ، وحُفَّتِ النّارُ بالشهواتِ))[٥٩٦]. واتـــە: (بەهەشـــت دەوردراوە بەناخۆشـــیەکان و دۆزەخـــیش دەوردراوە بە ئارەزووکان).

---

[٥٩٥] أخرجه: أحمد(٢١٥٢)، ومسلم (٦٣)، والبيهقي (الكبرى)(١٥٧٣٥).

[٥٩٦] أخرجه: مسلم (٢٨٢٣)، وقال ابن رجب في (التخويف من النار)(ص: ٢١٥): " فتبين بهذا أنَّ صحة الجسد وقوته وكثرة المال والتنعم بشهوات الدنيا والتكبر والتعاظم على الخلق هي من صفات أهل النار وهي جماع الطغيان والبغي كما قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾﴾(العلق: ٦-٧) والطغيان وإيثار الحياة الدنيا وشهواتها من موجبات النار كما قال تعالى ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ (النازعات: ٣٧-٣٩).

# پەناگرتن بەخوا لەئاگری دۆزەخ

پێوستە لەسەر موسوڵمان کەپەنا بگرێت بەخوا لەئاگری دۆزەخ، وە بەو دوعایانە بپارێنەوە کەپێغەمبەر ﷺ پێی پاراوەتەوە لە دوعاکانی دا بە بەردەوامی، فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾(البقرة: ٢٠١). واتە: (ئەی پەروەردگار خێر و چاکەمان پێببەخشە لە دونیادا وقیامەتدا وە بمان پارێزە لە ئاگری دۆزەخ). وە پێویستە لەسەرمان بەردەوام ئەو ئایەتە دووبارەبکەینەوە کە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾(الفرقان: ٦٥ – ٦٦) واتە: (خوایە سزای دۆزەخمان لێ بەدوور بگریت چونکە سزاکەی کاریگەر و بەردەوامە، وە خراپترین جێگە و مانەوەیە)، یاخود بڵێین: ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ (آل عمران: ١٦) واتە: (خوایە ئێمە بروامان هێناوە وە لە تاوانەکانمان خۆش بەو بمان پاریزە لە سزای دۆزەخ).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی داوە بەو موسوڵمانەی کەپەنادەگرێت بەخوا لەئاگری دۆزەخ وەخوای گەورە پەنای دەدا و دووری دەکات لە ئاگری دۆزەخ، وەهەروەها دۆزەخیش داوا دەکات لە خوای گەورە کە ئەو بەندەیە پەنابدات لەدۆزەخ بەمەرجێك ئەو دوعایە سێ جار یان حەوت جار دووبارەی بکاتەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ؓ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من أستجار من النار ثلاث مرات، قالت النار اللهم أجرهُ من النار))[٥٩٧]. واتە: (هەرکەسێك سێ جار پەنای گرت بەخوا لە دۆزەخ، دۆزەخیش دەڵێت: خوایە پەنای بدە لە دۆزەخ).

وەلە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ما أستجار عبدٌ من النار سبع مرات الاّ قالت النارُ: یاربُّ إن عبدك فُلاناً أستجار مني فأجرهُ. . . )). واتە: (هەر بەندەیەك گەر حەوت جار پەنابگرێت بەخوا لەئاگری دۆزەخ

---

[٥٩٧] أخرجه: أحمد (١٤١/٣)، وابن أبي شيبة (٤٢١/١٠)، والنسائي(٢٧٩/٨)، والترمذي (٢٥٧٢)، وابن ماجة (٤٣٤٠)، والحاكم (٥٣٥/١)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (١٠٣٤)وقال محققه اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة)(٣٥٠٢).

ئەوا دۆزەخ دەڵێت: ئەی پەروەردگار فلان بەندەی تۆ پەنای بەتۆ گرت لەمن تۆش پەنای بدە)[٥٩٨].

وە لەفەرموودەیەکی تردا هەر لەئەبو هورەیرە ﷺدەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: ((إن لله تبارك وتعالى ملائكة سيّارة فضلاً، يبغون مجالس الذكر، فإذا وجدوا مجالساً فيه ذكرٌ قعدوا معهم، وحفّ بعضهم بعضاً بأجنحتهم حتى يملؤوا مابينهم وبين السماء، فإذا تفرّقوا عرجوا وصعدوا إلى السماء قال: فسألهم الله عز وجل وهوأعلمُ: من أين جئتُم ؟ فيقولون: جئنا من عند عباد لك في الأرض يسبحونك ويكبرّونك ويحمدونك ويسألونك، قال: فما يسألوني ؟ قالوا: يسألونك جنتك، قال وهل رأوا جنتي ؟ قالوا: لا يارب، قال وكيف لو رأوا جنتي؟[٥٩٩] [ قال: يقولون لو رأوها كانوا أشدّلها طلباً، وأعظم فيها رغبةً ]، قالوا: ويستجيرونك، قال: وممَّ يستجيروني؟ قالوا: من نارك يارب، قال: وهل رأوا ناري ؟ قالوا: لايارب، قال: وكيف لو رأوا ناري؟، [ قال: يقولون لو رأوها كانوا أشدُّ منها فراراً، وأشدُمنها مخافةً ]، قالوا: ويستغفرونك، [قال: فيقول: أشهدكُمْ أنّي قد غفرتُ لهم ] وأعطيتهم ماسألوا، وأجرتهم مما أستجاروا قال: يقولون: ربّ فيهم فلان عبد خطاء إنّما مرّ فجلس معهم؟ قال فيقول: وله (قد) غفرت، همُ القوم لا يشقى بهم جليسُهُم))[٦٠٠]. واتە: (خوای گەورە چەند فریشتەیەکی هەیە گەڕۆکن دەگەڕێن بەدوای ئەو دانیشتنانەدا کەزیکری خوای تێدا دەکرێت ئەگەر دانیشتنێکیان بینی باسی خوای تێدا دەکرێت ئەوانیش دادەنیشن لەگەڵیاندا و هەموو بەسەر یەکتردا دەوەستن تاوەکو نێوانی ئەوان و ئاسمان پڕدەکەنەوە، ئەگەر دانیشتنەکە کۆتایی پێ هات ئەوانیش دەگەڕێنەوە و بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان، وە خوای گەورە پرسیاری ئێمە لە هەندێکیان دەکات و خۆی لەوان زاناترە و پێیان دەفەرمویێت: ئێوە لە کوێوە هاتوون ئەوانیش دەڵێن: لای کۆمەڵانێك بووین لەبەندەکانی تۆ لەسەر زەویدا (سبحانه لله)و(اللهأکبر)و(الحمدلله)یان دەکرد و لە تۆ دەپاڕانەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: داوای چیان لەمن دەکرد؟ ئەوانیش دەڵێن: داوای بەهەشتەکەتیان دەکرد، خوای گەورەش دەفەرمویێت: ئایا بەهەشتەکەی منیان بینیوە؟ ئەوانیش دەڵێن نەخێر، دەفەرمویێت: چۆن دەبن گەر بەهەشتەکەم ببینن؟). (ئەوانیش دەڵێن: گەر ئەوان ببینن زیاتر داوای دەکەن و

---

[٥٩٨] أخرجه: أبو يعلى (٦١٩٢)، وقال المنذري في (الترغيب) (٥٣٤٣) اسناده على شرط البخاري ومسلم، وصححه الشيخ الألباني على شرطهما في (السلسلة الصحيحة)(٢٥٠٦).

[٥٩٩] أخرجه: مسلم (٢٦٨٩).

[٦٠٠] أخرجه: البخاري (٦٤٠٨).

ئارەزوویان زیاتر دەبێت بۆی). دەڵێن: پەناشیان بەتۆ دەگرت، فەرمووی: لەچی پەنایان بەمن دەگرت؟ ئەوانیش دەڵێن: لەئاگرەکەت، خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەی ئاگرەکەمنیان بینیوە؟ ئەڵێن: نەخێر ئەی پەروەردگار، دەفەرموێت: چۆن دەبن°گەر ئاگرەکەی من ببینن؟ ئەوانیش دەڵێن: گەر ئەوان ببینن: زیاتر لێی ڕادەکەن و زیاتر لێی دەترسن. فریشتەکان دەڵێن: ئەوان داوای لێخۆش بوونیان لە تۆ دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ئێوە دەکەمە شایەت کەمن لێیان خۆش بووم. وە ئەوەم پێدان کە داوایان دەکرد، وە پەنایان دەدەم لەوەی کەداوای پەناگرتنیان دەکرد، پاشان فریشتەکان دەڵێن: ئەی پەروەردگار بەڵام کەسێکیان تیایە گوناهبارە بەلای ئەواندا تێ پەڕی و لایان دانیشت، (دەفەرموێت: ئەوا لەویش خۆش بووم ئەوانە کەسانێکن گەر هەر کەسێك دانیشتبێت لە چوار دەوریان بێبەش نابێت لەوەی کەئەوان بەریان دەکەوێت).

بەڵام پێویستە ئێمەش زیادە ڕەوی لە دوعاکانماندا نەکەین و نەڵێین: خوایە پەنادەگرین بەتۆ لە دۆزەخ و قوڵایەکەی و گەرمیەکەی و مارو دووپشکەکانی و ئاوی کوڵاو خواردن و خواردنەوەکانیان وە کۆت و زنجیرەکانیان. بەڵکو پێویستە تەنها پەنابگرین بە خوا لە دۆزەخ. ئەبو نوعامە ئەویش لە کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وقاص ﷺ دەگێڕێتەوە ﷺ دەفەرموێت: : سمعني أبي وأنا أقول: " اللهم أني أسألك الجنة ونعيمها وبهجتها وكذاوكذا، وأعوذ بك من النار وسلاسلها وأغلالها وكذاوكذا، فقال يابنَيَّ إني سمعتُ رسول الله ﷺ يقول ((سيكون قوم يعتدون في الدعاء)) فايّاك أن تكون منهم، إنك ان أعطيت الجنة أعطيتها وما فيها، وإن أعذت من النار أعذت منها وما فيها من الشر"[٦٠١]. واتە: (باوکم گوێی لە من بوو کە دەم وت: خوایە من داوای بەهەشت و خۆشیەکان و جوانیەکانی و ئەوە و ئەوەیت لێ دەکەم. . . . . . . وەپەنا دەگرم بە تۆ لە دۆزەخ وە لە کۆت و زنجیرەکانی وە لەوە و ئەوە. . . . . ئەویش وتی: ئەی کوڕی خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: (کۆمەڵانێك پەیدا دەبن زیادە ڕەوی دەکەن لە دوعاکردن) وریابە تۆش یەکێك نەبیت لەوانە ، گەر خوای گەورە بەهەشتت پێ ببەخشێت ئەوا چی لەبەهەشتدایە هەربۆ تۆیە وە گەر پەنات بدات لە دۆزەخ ئەوا لە هەموو ئەوانەی تیایەتی پەنات دەدات).

---

[٦٠١] أخرجه: أحمد (١٤٨٤)وقال محققه الأرناؤوط حسن لغيره، وأبوداود(١٤٨٠)، وابن أبي شيبة (٢٨٨/١٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود)(١٣١١).

## کۆتایی

خوێنەری بەڕێز دوای ئەوەی لە ڕێگەی ئایەت و فەرموودەکانەوە توانیمان لەنزیکەوە وردەکاریەکانی دۆزەخ وسزاکانی بناسین، ئیتر پێویستە لەسەرمان زیاتر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بین، وە سودمەند بین لە وتەکانی پێشینە چاکەکانمان (السلف الصالحين) خوا لێیان خۆش بێت بۆ ئەوەی ئاینە پوختەکەمان وەك خۆی وەرگرین، وە خۆمان بە دوورگرین لە گوناه و تاوان و گومڕایی و ئەوانەی کەلە دۆزەخمان نزیك دەکەنەوە.

کەواتە پێوستە لە کارەکانمان بە ئاگابین وەترسی سزاکانی خوامان لە دڵدابێت، وزیاتر کارە چاکەکانمان بەدڵسۆزی و گونجان لەگەڵ سوننەتدا ئەنجام بدەین وە زیادیان بکەین وە تا دەتوانین ئەو کارە چاکانە ئەنجام بدەین کە دەبێتە هۆی چوونە بەهەشتمان (إن شاء الله) وە خۆمان بە دوور گرین لەو کار و وتە خراپانەی کە نزیکمان دەکەنەوە لە دۆزەخ. ئەمەش نیشانەی سود وەرگرتنمانە لەم باسە. داواکارم لە خوای گەورە هەموو کارەکانمان هەر بۆ ئەو بێت وە هەموو کارە چاکەکانمان وەرگیراو بێت وە لەسەر ئەم ئاینە شکۆدارە و ڕێڕەوی پێشینی صاڵح جێگیر و بەردەوامان بکات ئامین.

وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت استغفرك وأتوب إليك.

**باوکی عەبدوڵا**

**محمد ملافائق شارەزووری**